

# چ بچێنی ئەوە دەدوریەوە


**نوسینی**
سید عبدلله سید عبدالرحمن ڕیفاعی

**وەرگێرانی**
سـهـام بەرزنجی

**بڵاوكردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە**
زەردەشـت كاوانـی

**خـــەت**
نـەوزاد كۆیـی

**بـــەرگ**
تـرایــزۆن

**قەبارەی كتێب**
١٧x ٢٤ - ( ٢٩٢ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەكەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز

**تـــیراژ**
١٥٠٠ دانە

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی
سپاردنی (٣٦٥) ی ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

 /TafseerOffice



کۆمەڵە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە،
کە لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕویداوە

# چ بچێنی ئەوە دەدوریەوە

نوسـینی:

سید عبدالله سید عبدالرحمن ڕیفاعی

وەرگـێڕانی:

سـهـام بـەرزنجـی







## پێشکەشە

ئەم پەرتووکە پێشکەشە بە هاندەرانم بۆ نووسین و دانانی ئەم بەرهەمە، هەروەها بەوانەی ووتارەکانم دەخوێننەوەو بێ بەشم ناکەن لە ئامۆژگاری و سەرنج و تێبینیەکانیان.. هەروەها پێش کەشە بە هاوبەشی ژیانم و هاوسەفەری ڕێگام دایکی هاشم، باشترین یارمەتی دەرم بووەو، خودا باشترین پاداشتی بداتەوە و بیپارێزێت و تەمەن درێژی بکات...

سید عبدالله سید عبدالرحمن ڕیفاعی
( باوکی هاشم )



# پێشەکی چاپی نوێ

## بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

سوپاسی بێ پایان و نەبڕاوە بۆ خودای جیهان، بە جۆرێك شایستە بە پایەداری و توانا و مەزنی و دەستەڵاتی خۆی، سەڵات و سەلام لەسەر مامۆستای مرۆڤایەتی و مژدە پێدەر ر ڕێنما کار و چرای ڕۆشن کەرەوەی ڕێگامان (محمدی کوڕی عبدالله) ی کۆتایی پێغەمبەران و، پێشەوای پێغەمبەران، سڵاو لەسەر کەس و کار و هاوەڵانی و، سڵاو لە هەموو ڕێبوارانی ئەو ڕێگایە و، پەیرەوکارانی ئەم پرۆگرامە تا ڕۆژی دوایی.

**لە پاشاندا:**

ئەمە چاپێکی نوێی کتێبی (چی بچێنی ئەوە دەدوریەوە) جارێکی تر بە پوختەکراوی و بە زیادکراوی دێتە بەر دیدی خوێنەر، کە چەند چیرۆکێك لە خۆدەگرێت لە چاپەکانی تردا نەبووە بە لایەن کۆمپانیای (مکتبة المعارف المتحدة)ەوە، کە هەستان بە چاپکردنەوە و بڵاوکردنەوەی، بە ئومێدی سوود بەخشین بە خوێنەری ئازیز، سوپاسی هاوکاران و بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاکە دەکەم بۆ ئەم چاپە ناوازە و ڕێك و جوانەی خستیانە بەردەستی خوێنەران، داواکارم لە خودای باڵا دەست سەرکەوتوویان بکات و هەنگاوەکانیان پڕ بەرەکەت بکات.

ئومێدەوارم ئەم پەر تووکە مایەی خێرو چاکە بێت بۆ خوێنەر و دایك و باوکم هەموو ئیمانداران و، لە خودا دەپاڕێمەوە تاوانەکانمی پێ بسرێتەوە و بیکاتە مایەی لێخۆشبون و لێبوردن بۆ ڕۆژی دواییم.

سید عبدالله سید عبدالرحمان ڕیفاعی

٥ شەممە/١٠ی ڕبیعی یەکەم ١٤٢٨ك

بەرانبەر ٢٩ی مارسی ساڵی/ ٢٠٠٧ز

## بەندی یەکەم

(چەند وێنەیەکی پرشەنگدار لە پیاوچاکانی وڵاتەکەم)

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە چەند وێنەیەکی واقیعی یە چاکەخوازی و خۆشەویستی خەڵکی کومیت دەردەخات بۆ چاکە لە کۆن و نوێ دا، لێرەدا باس لە کارە چاکەکانیان و پێشبڕکێیان دەکەین لە چاکە و پاداشتی خوادا، باس لەو کەڵە پیاوانە دەکەین و چاو دەخشێنینەوە بەسەر چەند لاپەرەیەکی ژیانیان دا تاوەکو ببن بە پێشەنگێکی چاکە بۆ ڕێگەی پڕ بەرەکەت و ڕاست.

یەکەم: خێر خوازە نەناسراوەکە.

دووەم: گەورە پیاوانێك لە وڵاتەکەم دا.

سێ یەم: بەخشندەیی ئەنبەعی و دەست پاکی دەشتەکیەکە.

چوارەم: بەسەرکردنەوەی خزم و کەس وکار.

پێنجەم: ڕێزگرتنی دراوسێ.

شەشەم: فەزڵی چاکەکردن لەگەڵ کەس و کاردا.

حەوتەم: کەسانی چاکە کار.

هەشتەم: بە هاناوە هاتن لە تەنگانەدا.

نۆیەم: چاکە پاداشتەکەی دە ئەوەندەی خۆیەتی.

# خێرخوازە نەناسراوەکە

محمد خەڵکی کوەیت بوو، زۆر هەژار و نەبوون بوو، ئەگەرچی لە خێزانێکی خاوەن پلە و پایە و ناوداربوو بەڵام ڕۆژگار تەواو شەکەت و ماندووی کردبوو، لەگەڵ ئەوەش دا هەژاری و نەبوونیەکەی لە نزیکترین کەسی دەشاردەوە، تەنانەت ئامۆزاکانیشی.
لە یەکێك لە شەوەکاندا کە مانگیش دیارنەبوو، دنیا بە تەواوی رەشی دەکردەوە، کەسێك لە دەرگای دا، دەرگاکەی کردەوە پیاوێکی باڵا بەرزی بینی عابایەکی رەشی دابوو بە سەر خۆیدا، لەگەڵ شەوەکەدا لەیەك جیا نەدەکرایەوە، محمد بە حەپەساوی لە بەردەم کابرا ڕاوەستا و لە شێوەو هەیئەتی ڕامابوو، کابرا دەستی هێنا کیسەیەك کە پارەی تێدا بوو پێ ی دا وە بە خێرای ڕۆیشت. محمد زۆر بانگی کرد تابزانێت کێیە بەڵام کابرا لە تاریکیەکەدا وون بوو.
محمد هێشتا لە شوێنی خۆیدا حەپەسابوو لەم ڕووداوە و جوڵەی بۆ نەدەکرا، پاش ماوەیەك هاتە ژوورەوە ڕوانی کیسەکە پارەیەکی زۆری تیدایە، بەڵام ئەوەی بیری سەرقاڵکرد پارەکە نەبوو، بەڵکو ئەوکەسە بوو کە پارەکەی هێنابوو، سەری سوڕما لەوەی چۆن زانیویەتی ئەم ئەوەندە پێویستی یەتی، خۆ ئەم لە هەمووکەسی شاردۆتەوە، محمد پارەکەی ژمارد و بۆ سبەینێ دەستی کرد بە خەرج کردنی و کڕینی پێداویستیەکانی و دوعای خێری بۆ خێرخوازەکە کرد. سەری مانگی داهاتوو، کاتێك مانگ پەنای گرتبوو بە هەمان شێوە کیسەیەکی تر تورەگەیەکی دی پارەی هێناو دایە دەستیان، ئەگەرچی محمد خۆی ئامادەکردبوو ئەمجارەیان ئاشکرای بکات، بەڵام لە جارەکەی تر خێراتر لە ناو تاریکیدا وون بوو.
محمد زۆر دوعای خێری بۆ کرد و سوپاسی خودای کرد، ئەمە چەندین جار دووپات بویەوە. بەڵام دەروونی دەکوڵا تابزانێت ئەم چاکە خوازە کێ یە، محمد گەنجێکی بە هێز بوو و، خۆی ئامادەکرد خێرا دەستی بگرێت و نەهێڵی





ڕابکات.

هەموو جارێ کە مانگ پەنای دەگرت دەهاتەوە و لە دەرگای دەدا و پارەکەی دەدا بە محمد، بەڵام ئەمجارەیان محمد بە توندی دەستی گرت و نەیتوانی لەبەر بەهێزی محمد ڕزگاری ببێت.

ئەم نەناسراوەی دەستی بۆ نەداران درێژ دەکرد، ئەو کەسانەی هەبوون بوون و لێ کەوتبوون و شەرمیان لە نەبوونی خۆیان دەکرد باسی بکەن بەسەری دەکردنەوە، کەسێکی پیاو چاك و لە خواترس بوو، هەمیشە پێشبرکێی دەکرد بۆ کاری چاکە بەڕاستی شتێکی لە ناکاو بوو کاتێك محمد زانی ئەمە شێخ (سالم بن مبارك صباح)ە، گەورەی شارەکەبوو لەو کاتەدا.

بەڵام شێخ سالم بن محمد بن مبارك بە محمدی ووت: تازە تۆ منت ناسی، بەڵام سوێندت دەدەم باسی ناکەی هەتا دەمرم.

ئەم ڕووداوە زۆر کاریگەر بوو بۆ سەر محمد، گەورەی شار بەو شەوە تاریکانە دێت و، بە شاراوەیی و خۆی دەگۆڕێت و جلێکی شڕ لە بەر دەکات و دەرگا بە دەرگا خێر دەکات. محمد ئەسرینەکانی خۆی پێڕانەگیرا و بە شێخ سالمی ووت: سوێندت بە خودا بۆ دەخۆم. ئەم نهێنیەت دەپارێزم، مەگەر لە دوایی تۆ ئەگەر ژیام. باسی دەکەم بۆ ئەوەی کەسانی دوایی تۆ پەندی لێ وەربگرن. لە ڕۆژی ١٥ی جەمادی دووەمدا ساڵی ١٣٣٩ك، شێخ سالم ی کوڕی مبارك صباح چووە بەر ڕەحمەتی خوداو کەسانێکی بێ شومار لە سۆز و خێرەکانی ئەم خێرخوازە نەناسراوە بێ بەش بوون و، لێرەدا محمد نهێنی یەکەی ئاشکراکرد و باسی ناو و کەسێتی ئەوی بۆ کردن.

خەڵکیش پاشتر ڕەحمەتیان بۆ نارد کە خێرخوازێکی نەناسراو و کاربەدەستێکی دادپەروەرو باوکێکی بە سۆز بوو بۆیان.

پێشەوای دادپەروەریش یەکێکە لەوانەی مژدەی سێبەری خودای پێ دراوە لە ڕۆژی قیامەت دا و بە مەرجێ سوور بێت لەسەر ئەوەی لە کاروباریان بکۆڵێتەوە و نەرم نیان بێت بەرانبەر ژێر دەستەکانی و چاودێریان بکات.



خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ [1].

پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم):

**(ما من امیر عشرة الا وهو یؤتي به یوم القیامة مغلولا حتی یفکه العدل او یوبقه الجور).**

واتە:(هەمووکاربەدەستێ لە ڕۆژی قیامەت دا دەهێنن کەلەبچەکراوە، ئیتر یان دادوەریەکەی دەیکاتەوە، یان جەور و ستەمەکەی بە هیلاکی دەبات).

---

(١) سورة المائدة: آیة ٨.





# گەورە پیاوانێك لە وڵاتەکەم دا

ساڵی ١٢٨٥ك برسێتی و قات و قڕیەکی زۆر لە کەنداو ڕووی دا، کە پێی دەوترا (هیلك = تیابەر)، لەو گرانیەدا خوێن و پێستەو مرداربووەکانی گیانلەبەرانیشیان دەخوارد، ئەم گرانیە نێوان فورات و لای عێراق و تاوەکو باشور ڕۆیشت و لەم لایشەوە پەلی هاوێشت بەرەو کەناراوەکانی ڕۆژهەڵات لە کەنداوی عەرەبی. لەم گرانیە گەورەیە پیاوەتی کومیت و بازرگان و دەوڵەمەندەکانی دەرکەوت و قۆڵیان لێ هەڵماڵی و ماڵی خۆیان دەکردە خێر و سکی ئەو ڕەش و ڕووت و برسیانەیان تێر دەکرد، لە بەناوبانگترین ئەو بەخشندانە دوو پیاوی لە خوا ترس بوون: یوسفی کوڕی بەدر و، یوسفی الصبیح، هەر یەکەیان ماڵێکی دانا بوو نانیان دروست دەکرد و برنجیان لێ دەنا و هەژار و برسیان تێر دەکرد و، مردووەکانیان ئامادە دەکرد و پێویستیەکانی کە کەس نەبوو بۆیان بکات بەڕێوەیان دەبرد.

لە ساڵی ١٩١٤ ز دا شەڕی یەکەمی جیهانی ڕووی دا و زۆر وڵات ئابلۆقەدراو ڕۆژگارێکی تاڵ و ڕەش بوون و خەڵك زۆر لە نەهامەتی دابوو. بە تایبەت ساڵی ١٩١٦ ز برسێتی و گرانیەکی کوژەر عێراق و سوریای بە توندی گرتەوە. هەمیشە خەڵکی کومیت لە پێشەوەبوون بۆ کاری خێر و چاکە و، دەستی یارمەتیان بۆیان ڕاکێشاو ئەو کەشتیانەی لە هند و ئەفریقیاوە دەهاتنە کوەیت دەبرانە ئەوێ و، ئەگەر چی گرانی و برسێتی یەکی زۆر بوو هەموو شامی گرتبوو، بەڵام بە فەزلی خودا کەس لە برسان نەمرد و، پاشان بەو هەوڵانەی لە کومیتەوە دراو و خەڵکەکەی کە بەو پەڕی لێ بوردەییەوە یارمەتیەکانیان گەیاندە ئەو وڵاتانە و یارمەتی بێ دەستەڵات و برسی و ڕەش و ڕووتەکانیان داوە، ماڵ و سامانی خۆیان نارد بەبێ منەت و خۆهەڵکێشان.

لە نێو ئەو چاکەخوازانەدا (حمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی صقر) ڕۆژێکیان یەك کەشتیەك کە باری برنجی بۆ هێنابوو لە ماوەی دوو ڕۆژدا بەخشی بە هەژار و خاوەن پێداویستیەکان و هەمووی دابەش کرد بەسەر خەڵکی شارەکەیدا



بەو ئومێدەی باشترین پاداشتی نەبڕاوەی لە لای خودا چنگ بکەوێت.
ئەگەر چاکەکاری لە کاتی تەنگانەکاندا هەژمار بکەین، لەبەر زۆری فریا ناکەوین، بەڵام ئەوەندە دەڵێین کەوا بەرچاوتەنگ و ڕژدی زۆر کەم تێدا هەڵکەوتووە، بەڵکو لە کەم کەمتر و، هەر لە کۆنەوە خەڵکی کومیت ناوبانگی بە بەخشندەیی و سەخاوەتی لە ڕەوشتیاندا و چاکەخوازی و بەزەیی هەبووە و لە چاکترین سیفاتیان یارمەتی دانی جگە لە خۆیان بووە و سوپاس بۆ خودا هەتا ئێستاش بەردەوامە، چەندەها کۆمەڵەی خێرخوازی و ماڵی زەکاتی تێدایە و گەیاندویانە زۆربەی وولاتانی جیهان و هەموو بە ئومێدی چاکە کردن لە پێناوی خودادا.
خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴾[1].

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:
(من اطعم اخاه حتی یشبعه و سقاه من الماء حتی یرویه باعده الله من النار سبعة خنادق مابین خندقین مسیر خمسة مائة عام).
واتە: (هەر کەسێك براکەی تێرخواردن بکات و خواردنەوەی پێ بدات هەتا تینوویەتی دەشکێت، خودا بەو کارەی حەوت خەندەق لە ئاگر دووری دەخاتەوە، کە لە نێو دوو خەندەق دا ڕۆیشتنی پێنج سەد ساڵی ڕۆژی دوایی یە).

(١) سورة آل عمران: أیة ٩٢.





## منصوری ئەنبەعی و... دەست پاکی دەشتەکی

له کاتێکدا (منصوری ئەنبەعی ) لەنێو دوکانەکەیدا دانیشتبوو، وەك هەمیشە سەرقاڵ بوو، دراوسێکەی لە بنەماڵەی (الخليفة) بوونو ناسرابوو بە قەصابی و سەر بڕینی مەڕ و ماڵات و گۆشت فرۆشتن، سڵاوی لێ کرد ووتی: کابرایەکی دەشتەکی هاتۆتەلام دەیەوێت مەڕ بکڕێت و بەڵام پارەشی تەواو نی یە ( منسوری ئەنبەعی ووتی: بینێرە بۆ لام.

کابرای دەشتەکی جلێکی شڕی لەبەر دابوو، ئەوەندە لاواز بوو بڕوانەدەکرا بگاتەوە ماڵەوە، نیشانە هەژاری بە هەموو جەستە و سیمایەوە هاواریان دەکرد.

منسور ووتی: تۆ دەتەوێ مەڕ بکڕی.

دەشتەکی: بەڵێ.

تۆ مەڕ بۆچی دەکریت لە کاتێکدا کە پارەکەت بەش ناکات.

دەشتەکی: دەمەوێ شیرەکەی بخۆم و گوزەرانمی پێ باشتر بکەم لە هەژاری ڕزگارم بکات.

مەنسور صندوقی پارەکەی کردەوە پارەکەی دەرهێناو دای بە دەشتەکی پێ ی ووت: برۆ مەڕەکەت بکرە.

دەشتەکی: ئەم پارەیەت قەرزێکە لە ملمدا و دەبێت بیگەڕێنمەوە بالە لاپەڕەیەکدا بینوسین

منسور ووتی: قسەکانت بە سە پێویست بە لاپەرە ناکات و، تۆ سەر پشك بە ئەگەر وویستت بیگەڕێنەرەوەو بەو ئومێدەی خودا بیکاتە مایەی فەڕ و بەرەکەت بۆخۆتو منداڵەکانت.

دەشتەکی شڕۆل دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان زۆر سوپاسی خودای کردو، پاشان سوپاسی منصوری کرد، پرسیاری شوێنی نیشتەجێ بوونی لێ کردو، پاشان مەڕەکەی کری و ملی ڕێ گرت و بەرەو بیابان.

لەدوایی تێپەر بوونی ساڵێك لەبەهاردا کابرا هاتەوە بۆ ماڵی منصور و کەرێ و ڕۆن بۆ هێنا بوون کاتێك منصور چاوی پێ کەوت پێشوازی لێکرد و سوپاسی



کرد بۆ دیاریەکەی و دوایی پرسیار کردن، کابرای دەشتەکی ووتی: خودا بەرەکەتی ڕژاند بە سەرمدا ئێستا بوون بە سێ دانە، ئەمەش لەپاش خودا لە سەخاوەتی تۆی دەبینم.
دوایی حەوانەوە نان خواردن گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.
کابرای دەشتەکی بە وەفا، ڕاستگۆ بوو لە پەیمانەکەیدا و ساڵانە لە بەهاردا دەهات و کەرێ و ڕۆنی بەدیاری دەهێنا و هەواڵی مەڕەکانی دەدا بە منصور، بەڵام منصور قەد داوای هیچی لێ نەدەکرد،دوایی بیست ساڵ لەم ڕووداوە منصور کۆچی دوایی کرد،بەهیچ جۆرێك باسی ئەم مەسەلەی لەلای خێزان و منداڵەکانی نەکردبوو.
وەك نەریتی هەمیشەیی بەهار هات و دەشتەکی هاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان منصور دەرگای بۆ نەکردەوە و یەکێك لە کوڕەکانی بوو، دەشتەکی پێشی کەوت و ووتی تۆ کێ ی؟
ووتی: من ئەحمەدم کوڕی منصور ئەنبەعی.
دەشتەکی ووتی ئەی باوکت لە کوێ یە.
ئەحمد ووتی: باوکم کۆچی دوایی کردووە.
دەشتەکی دڵی پڕبوو دەستی کردە گریان و ڕەحمەتی بۆ منصور دەنارد، کاتێك هاتەژوورەوە بە ئەحمەدی ووت: کوڕم چیرۆکێك لەنێوان من و باوکت هەیە با بۆت باس بکەم.
ئەحمەد دڵی پێ سووتا ئەوەندە غەمبارو ماندووەو پێ ووت: ئێستا پشوو بدە خواردن لەگەڵماندا بخۆ ماندووبووت بحەسێتەوەو پاشان بۆمان باس بکە.
لەپاش نان خواردن دەشتەکی بەووردی هەموو شتێکی بۆ ئەحمەد گێڕایەوە.
ئەحمە ووتی: ئێستا چەند مەڕت هەیە؟
دەشتەکی ووتی: ئێستا سێ سەد سەر مەڕە، لەفەزڵی خوداو پاشان سەخاوەتی باوکت.
ئەحمەد ووتی: مامە گیان من تەنها نیم، براو خوشکی زۆرم هەیە، ڕاوێژیان لەم بارەیەوە پێ دەکەم وەڵامت دەدەمەوە، تۆ بۆ خۆت بحەسێرەوە.
دەشتەکی ووتی: زۆر باشە، من ئێستا دەڕۆم دوایی دوو ڕۆژی دی دێمەوە.
بەم شێوەیە پاش دوو ڕۆژەکە دەشتەکی گەڕایەوە و پاش گفتوگۆ ڕێك کەوتن



بە شی خۆیان بفرۆشن پارەکەیان بۆ بهێنت، کابرا دوایی مانگێك هەمووی بۆ فرۆشتن و پارەکەی کردیە حەڤدە هەزار ڕیال بۆ هێنانەوەو دوعایەکی زۆری کرد بۆ منصور کە هۆکاری ئەم خۆشیانە بووە.

أحمد ووتی: خودا پاداشتی دەست پاکی و وەفاو پەیمانت بداتەوە زیاتر ڕۆزی خۆی بەسەرت دا بڕێژێ.دەستیان کردە ملی یەك پاش ئەوەی دڵنیا بوویەوە ڕۆیشت[1].

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ [2].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة، ومن يسر على معسر فى الدنيا يسر الله عليه فى الدنيا والاخرة ومن ستر مسلما فى الدنيا ستر الله عليه في الدنيا والاخرة، والله في عون العبد ماكان العبد فى عون أخيه)[3].

(( هەر کەسێك خەم و ناخۆشیەکی ئەم دنیایە لەسەر ئیماندارێك لاببات خودا خەمێکی قیامەت و ناخۆشیەکی لەسەر لادەبات هەر کەسێك تەنگانەی کەسێك ئاسان بکات لە دنیادا خودا لە دواڕۆژدا ئاسانکاری بۆ دەکات، هەرکەسێك عەیبی موسڵمانێك بپارێزێت خودا لە دنیاو دواڕۆژدا دەیپۆشێ، خودا یارمەتی بەندەکان دەدات چەند بەندەکان لە یارمەتی براکانیان بن))

---

(١) ئەم چیرۆکە بەرێز ( محمد صقر الجاسر) بۆی گێڕامەوە.

(٢) سورة البقرة: أية ٢٦١.

(٣) رواه مسلم.




## بەسەر کردنەوەی خزم وکەس وکار

باسی یەکێکی تر لەو پیاو چاکانە دەکەین،کە هەمیشە پێشبڕکێ دەکەن لە کاری چاکەو یارمەتی دانی کەسانی ترو خۆشترین ساتەکانی ژیانیان خۆش بەخت کردنی موسڵمانانە بەتایبەت خزم و کەس وکاریان.ئەم پیاوە (جاسم فوزان) کێڵگەیەکی هەبوو لە فەنتاس، دەچووە ناوی و هەوای پاکی ناو درەختەکانی هەڵدەمژی و پاشان لەکاتی هاتنەوەی دا هەندێ لە کشتوکاڵەکەی دەڕنی وئێوارە دابەشی دەکرد بەسەر خزم و هاوڕێ و ناسیارەکانی دا،جارێکیان لەلای یەکێك لە خزمەکانی لایداو سندوقێکی میوەو سەوزەی دانا،خاوەن ماڵ زۆری لێکرد کەمێك لەلایان دانیشێت،کەسێکی هەژارو دەست کورت بوون،ئەمیش داواکەی ڕەت نەکردەوە،پاشان لە حەوشە دانیشتن و قسەو باسیان کرد،لەکاتێك دا قسەی دەکرد چاوی کەوتە سەر بەفر گرێکی کۆن لەحەوشەکەدا،لێی پرسی ئەوە چیە؟ کابرا لە وەڵام دا ووتی:شکاوەوئیش ناکات.
پاشان جاسم فوزان سوپاسی پێشوازیە گەرمەکەی کردن و ناونیشانەکەی بەجوانی دیاری کرد لەدڵی خۆیداو پاشان ڕۆیشت.دوای دوو ڕۆژ لەو سەردانە کاتێك ماڵەی هەژار بێ بەفرگر لەنێو ماڵەکەیاندا بوون،نەدەیانتوانی چاکی بکەنەوە نەهی نوێیان پێ دەکڕا،هەربۆیە لەبیریان کردبوو.زەنگی دەرگایەو ئوتومبێلی یەکێك لەکۆمپانیاکان وەستاوەو بەفرگرێکی گەورەو نوێ بۆ هێناون و شوفێرەکە پرسیاری ناوو ناونیشانەکەی کردەوە،ئەمانیش ووتیان بەڵێ وایە.
شوفێرەکە ووتی ئەم بەفر گرە هی ئێوەیە!!
سەریان سوڕما و ووتیان: بەڵام ئێمە هیچ بەفرگرێکمان لە ئێوە نەکڕیوە !!
ووتی: ئەمە بەناوی (جاسم فوزان ) هوە بۆ ئێوە کڕدراوە.
بەم شێوەیە دڵی ئەم ماڵەی شاد کرد، بەبێ ئەوەی کەس داوای لێ بکات ولێ بپاڕێتەوە، لەوانەیە بڵێ زۆر گەورە نی یە، بەڵام خێرو چاکە بە گەورە بچووکی نی یە، پێویست بوونی ئەو خەمەی بەرانبەرەکەیە و لە تەنگانە دایە، خودای





گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾[1].

پێغەمبەری خودایش (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

(الجود من جود الله تعالى فجودوا يجد الله عليكم،ألا ان السخاء شجرة في الجنه أغصانها مدلاه في الارض فمن تعلق بغصن منها أدخله الله الجنة ألا وان السخاء من الايمان والايمان في الجنة)[2].

واتە: ( سەخاوەتی و بەخشین لە سیفەتی خوداوەیە، ببەخشن و سەخی بن خودا سەخاوەتی خۆی بە سەرتاندا دەڕێژێ، بەڕاستی سەخاوەتی درختێکە لە بەهەشت دا و لقەکانی شۆڕبونەتەوە بۆ سەر زەوی هەر کەسێك خۆی بکات بە لقێکەوە دەچێتە بەهەشت، بەڕاستی سەخاوەتی لە ئیمانەوەیە، ئیمانیش دەتباتە بەهەشت ).

---

(١) سورة البقرة: أية ٢٧٢.

(٢) طبرانی ریوایەتی کردووە.



## ڕێزگرتنی دراوسێ

وویستی پرۆژەیەکی بازرگانی دەست پێ بکات سوودی لێ ببینێت و سامانەکەی پێ ببوژێنێتەوە، وویستی چیتر هەژاری نەبێت و ببێت بە خاوەن سامان، بەلام ئەم خەونە خۆشانە چۆن بەدیبهێنێت، لە کاتێکدا ئەو هیچ سەرمایەیەکی نی یە بۆ بە دەست پێکردنی ئەم پرۆژەیە،پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر چاری نی یە ئەبێ قەرزی لە یەکێك لە بانقەکان وەربگرێت، بەڵام خۆ هەر وا نابێت دەبێ قەبالەی خانووەکەی بخاتە ڕەهنەوە، تا دانەوەی قەرزەکانی لەکاتی دیاریکراودا،پارەکەی وەرگرت و پرۆژەکەی دەست پێکرد و شەوی خستە سەر ڕۆژو هەموو تواناکانی خستە کار تاکو بازرگانیەکی سەرکەوتوو بێت و پێ ببوژێتەوە، بەڵام ئەوەی لای بەندە خەیاڵە لای خودا بەتاڵە، پرۆژەکەی سەری نەگرت وبەخت یاوەری نەبوو هەموو سامانەکەی تیاچوو هەموو شتێك با بردی، ئێستا نەك خاوەن سامان نی یە بەڵکو قەرزداریشە، چاری تری نەبوو دەرگای لەسەر خۆی داخست و لە ژوورەوە چاوەڕان بوون، کاتێك کاتەکەی هات بانق نووسراوی کردە، سەری و داوای پارەکەی کرد، بەڵام ئەم هیچی بە دەستەوە نەبوو، بۆیە بانق خانووەکەی خستە مەزادەوە و ڕۆژەکەی دیاری کرد جاسم فوزان سەیری کرد خەڵکێکی زۆر لەبەر دەم دەرگای دراوسێ کەیدا کۆبوونەتەوە پرسیاری کرد لە یەکێك لەوانە ئامادەبوون ووتی ئەم هەرایە چی یە، ووتی ئەم خانووە بە مەزاد دەفرۆشێت و ئەم خەڵکە چاوەڕێ کردنەوەی مەزادە دەکەن، دواتر پرسیاری کرد لە هۆکاری فرۆشتنی ماڵەکەی بەم شێوەیە و مەسەلەکە تێگەیشت، خێرا خۆی گەیاندە لێپرسراوی مەزادەکەو فرۆشتنەکەی وەستاند و پارەکەی بانقی بۆ دا و، تاپۆی خانووەکەی بۆ دراوسێکەی وەرگرتەوە و،پاشان پێ ووت:من قەرزەکەم دایەوە و تۆش بە گوێرەی توانات بەبێ زۆر لە خۆکردن قەرزەکانمان بدەرەوە، بەسەر بەرزی لەخانووەکەتدا بمێنەرەوە، هەرچ پێویستێکت هەبوو من ئامادەم.





دراوسێ کەی زۆر دڵخۆش بوو وزۆر سوپاسی کرد بۆ ئەم ڕەوشتە بەرزو بەخشندەییە و ڕزگارکردنی ئەم تەنگانەیە و، بڕیاریدا هەوڵی دانەوەی قەرزەکانی بدات[١].

ئەمەش وێنەیەکی پرشنگداری سەخاوەت بوو، چونکە چاکە لەگەڵ خەڵکدا لە کارە گەورەکانە بەتایبەت لەگەل دراوسێ دا. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

(من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلیکرم جاره )[٢].

(هەرکەسێك بڕوای بە خوداو ڕۆژی دوای هەیە با ڕێزی دراوسێکەی بگرێت).

---

(١) ئەم چیرۆکە بەرێز ( خالد الحنجری ) رەحمەتی خودای لێبێ گێڕایەوە

(٢) موسلم و بخاری ریوایەتیان کردووە.



## فەزلی چاکە کردن لەگەڵ کەس و کاردا

سەرباری ئەوەی بە ژیانەوە ماندوو بوو، بەڵام داهاتی سنوور داربوو، ڕۆژێك خالید بە ئۆتۆمبێلەکەیەوە لە یەکێك لە شەقامەکانی کوەیت دا بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە تاوەکو کەمێك پشوو بدات ماندوویەتی بحەسێنێتەوە، ئەو فەرمانبەری یەکێك لە وەزارەتەکان بوو، لە کاتێدا بیری سەرقاڵی گرفتەکانی ژیان بوو لەناکاو هەستی کرد زەوی لولی دەکات و نەیدەزانی مەسەلە چی یە، کاتێك بەهۆش هاتەوە خەڵکێکی زۆر بەسەریەوە وەستابوون دەیانووت: سوپاسی بۆ خودا،وەك موعجیزە ڕزگارت بوو، هەرکەسێ تەماشای ئۆتۆمبێلەکەی بکردایە بڕوای نەدەکرد بە زیندووی مابێت، ئوتومبێلەکە تێك شکابوو، بارهەڵگریت لێ ی داو و پێکەوە چوونە بنکە و کاروباری پێویستیان ئەنجامدا. دوایی ئەوەی زۆر سوپاسی خودای کرد سەلامەت بووە پاشان کەوتە خەیاڵی ئەوەی کە چۆن بتوانێت ئۆتۆمبیلێکی تر بکڕێت، خۆ پێش ئەم گرفتە سەدان گرفتی نەبوونی هەبوو، ئەمەشی هاتە سەر، بە موچەی فەرمانبەری ئەو خێزانە گەورەیەی پێ بەڕێوە نەدەبرا ە......و......

(جاسم فوزان ) ئەم کارەساتەی بیست وزانی ئەم خزمەی وای بەسەر هاتووە، بڕیاری دا هەوڵی یارمەتی دانی بدات.

خالید بێ ئومێد بوو لەوەی جارێکی تر ئوتومبیلی بۆ بکڕدرێتەوە و ڕۆژێکیان لەماڵەوە دانیشتبوون، زەنگی دەرگابوو، خالد دەرگای کردەوە کورەکەی جاسم الفوزان بوو، دەم و چاوی گەش و پڕ زەردەخەنە بوو، خالد پێشوازیەکی گەرمی لێ کرد و بردیە ژووری میوان و حەواڵی باوکی و خێزانەکەی پرسی... خالد چوو چای هێنا و کەوتن نێو قسە و باسەوە، پاشان کوڕەکەی جاسم مۆڵەتی خواستو ماڵئاوایی کردو سوپاسی میواندارییەکەی خالدی کردو لەکاتی چوونە دەرەوە دا سویچی سیارەکەی دا بە خالید و ووتی: بیگرە.

خالید ووتی ئەمە چی یە ؟!





ووتی: ئەمە سویچی ئەم ئۆتۆمبیلەی لە پێشتدایە.
خالید سەر سام بوو ووتی: ئۆتۆمبیلی من....بۆمن ؟!
ووتی: بەڵی، خالید ووتی: هی کێ یە ؟!
لە وەلامدا ووتی: ئەمە دیاری باوکمە لە بری ئەو ئۆتۆمبیلەی تێك شکا، لە خۆشیاندا باوەشی کردبە کورەکەیداو سەری سوپاسگوزارانەی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و دوعای خێری بۆ باوکی کرد ئۆتۆمبیلەکە جۆری (بوکس) لە گەورەکان بوو، وەك خەون وابوو بۆ خالد و شادیەکی زۆر گەورە بوو بۆیان[1].
خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ ﴾[2].

پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:
(یا أمه محمد والذي بعثني بالحق لا يقبل الله صدقة من رجل و له قرابة محتاجون الى صلته ويصرفها الى غيرهم، والذيي نفسي بيده لاينظر الله اليه يوم القيامة)[3].
واتە: (ئەی ئومەتی محمد، سوێند بەو کەسە کەمنی ڕەوانە کردووە حەق و ڕاستی بگەیەنم خودا خێری کەسێك وەرناگرێت لە کاتێکدا خزم وکەسی دەست کورتی هەیە و ئەم دەیدات بە خەڵکی ترو، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە لە ڕۆژی دواییدا تەماشایان ناکات)

---

(١) ئەم ڕووداوە بەرێز (بدر عبداللطيف الفوزان) بۆی گێڕامەوە
(٢) سورة البقرة: أية ١٧٧.
(٣) طبراني ریوایەتی کردووە.



## کەسانی چاکەکار

نوێژی مەغریب بوو لە یەکێك لە لە مزگەوتەکانی کوێت دا، لە دوایی تەواو بوونی نوێژەکە، یەکێك لە ئامادەبوان داوایکرد گوی بیستی ڕووداواکانی ئەم چیرۆکە دڵ تەزێنەبن.

بەردەوام بوو لە قسەکانیدا ووتی: ئەم خێزانە لە شوقەکەیدا دەژیا و باوکیان پێویستەکانی بەگوێرەی توانا بۆ دابین دەکردن، ئەگەر چی ئەو پارەی لە کارەکەی وەریدەگرت ئەوەندەکەم بوو، مەمرەو مەژی پێ ی دەژیان، سەرەتا کرێ ی شوقەکەیان لێ دەدا و ئەوەی تر تاوەکو ناوەڕاستی مانگ بەشیان پێ دەکرد، بەڵام ئەوی تر بەدەردەسەری و نەهامەتی بە سەریان دەبرد، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ڕازی بوون بەبەشی خودا، لەناکاو ڕووداوێکی جەرگ بڕ هات بە سەر ئەم خێزانە هەژارە داو باوکەی بەستە زمان لە کارەکەی دەرکراو بەبێ کار مایەوە، لە کاتێکدا هاوسەرو کۆمەڵێك منداڵ ووردو شیرەخۆرەیان هەبوو، باوکەی بەستەزمان شوێن نەما بگەڕێت بەڵام بێ سوود بوو.

لەهەموو بەڵاکان ناخۆشتر، هاتنی سەرەمانگە و کرێ شوقە ئامادە نی یە، کاتێ بە خاوەنی شووقەکەی ووت: پارەم نی یە و لە کارەکە دەرکراوم، کابرا چاوەکانی چووە پشتە سەری، چونکە کەسێکی دڵ رەق و بێ هەست بوو و دڵۆپێك بەزەیی لە دڵی دا نەبوو، بە هەموو دەنگ هاواری کرد بە سەری دا ووتی: یان کرێ دەدەیت یان چۆڵی دەکەیت و تەنها یەك ڕۆژت لەبەر دەمدایە، بە بۆلە بۆل بە نەڕە نەڕە ڕۆیشت.

چارەیان نەما تەنها پاڕانەوە لە خودا نەبێت ئاسانکاری بۆ بکات، پاشان شتو مەکەکانیان کۆکردەوە و چوونە چێر قادرمەی باڵخانەکەوە، ئەم دیمەنە دڵتەزێنە کاری نەکردە سەر دڵە بەرد ئاساکەی بەڵکو زیاتر وورووژاندیو بەسەریاندا نەڕاندی ئەوە لێرەدا چی دەکەن.

باوکی هەژار بە دەنگێکی کزەوە ووتی: بۆ کوێ بچم خۆ هیچ شوێنێك نی یە





بۆی بچین.
ووتی: برۆنە دۆزەخ، من نامەوێت جارێکی تر چاوم پێتان بکەوێتەوە.
زۆر پاڕایەوە ماوەیەکیان پێ بدات، تەنها دوو ڕۆژی بۆ دیاری کردن و ووتی شوێنەوارتان لێرەدا نەمێنێت دەستە وەسان بوون، نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن، هەموو برسی، ماندوو، دایکە بەستەزمانەکەی شیری تێدا نەمابوو ساواکەی پێ ژێر بکاتەوە، لەم کاتەدا مەلای مزگەوت بە وێدا تێپەردەکات و دڵی بۆیان دەسووتێت و پرسیاریان لێ دەکات، دوایی ئەوەی چیرۆکەکەیان دەزانێ، هەڵیاندەگرێت و دەیانبات بۆ مزگەوت و شوێنەکەی خۆیان پێ دەدات و خۆی لە مزگەوت دەمێنێتەوە. ئەوانەی گوێبیست بوون کاردانەوەیان جیاواز بوو، بەڵام بەگشتی بێ دەنگی باڵی بەسەر هەمووی دا کێشا و بەچرپە نەبێ قسەت نەدەبیست، هەندێکی بەبێ دەنگی فرمێسکەکانی بۆ دەباراندن وەك ئەوەی ئەمەی باسکرا لە خەیاڵ یان خەونەوەبێت.
پاشان کابرا هاواری کرد و داوای لە ئامادەبوان کرد بچن بەهانایانەوە و ڕزگاریان بکەن......
هەموو بە قەد توانای خۆی دەستی کرد بە گیرفانی دا و تەنها یەك پیرە پیاو نەبێت نەجولا.... هەتا مزگەوتەکە چۆل بوو لەو پیاوەی بانگەوازەکەی کردبوو لێی پرسی ئەم چیرۆکەت بەڕاست بوو؟
ووتی: بەڵێ، ووتی: من ببە بۆ لایان.
پیاوەکە دەستی پیرە پیاوی گرت و بردیە لایان، هەربو بینینیان دڵی زۆر بۆیان سوتاو، زۆر گریاو پێنج هەزار دیناری پێدان، شوقەیەکی بۆ بە کرێ گرتن و خۆی کرێ کەی بۆ دەدان بەبێ ئەوەی کەس بزانێ ئەو کێ یە[1].
ئەمەش نموونەیەکی دی بوو بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کاری چاکە دەکەن ئومێدیان بە پاداشتی خودایە. چەند زۆرن خۆشەویستی خەڵکە کە دەردەخات بۆ کاری خێر خوازی. خودا دەفەرموێت:

﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴾[2].

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه و سلم)دەفەرموێت:



(صنائع المعروف تقي مصارع السوء والافات و الهلكات وأهل المعروف في الدنيا هم أهل المعروف في الاخرة)[1].

واتە: (( کرداری چاکە لە شوێن کەوتنی خراپە و بەڵا و نەهامەتی دەتپارێزێت، کەسانی چاکەکاری دونیا لە دوا ڕۆژیسشدا هەر چاکەکار دەبن))

---

(١) ئەم چیرۆکە بەرێز ( جاسم الحمادي) بۆی گێڕامەوە

(٢) سورة الانسان: أية ٨ و ٩.

(١) حاکم ڕیوایەتی کردووە





## بە هاناوە هاتن لە تەنگانەدا

لە مانگی اغسطس ی ساڵی ١٩٩٠ ز کاتێك هێرش کرایە سەر دەوڵەتی کویت و لە ناکاو هەرچی خراپە هەیە کردیان و وێرانیان کرد، خەڵکەکە بەشەرِ پەلامار رانەهاتبوون، لە ترس و دڵڕاوکێیەکی زۆردا دەژیان دڵنیا بوون کە خودا ئەم هەرە ڕەشەیان لەسەر لادەبات و، باوەڕ و هاوکاری پێکەوە ژیانی زیاتر کردن و وەك یەك دەستی پتەو یەکیان گرت بە تواناکان و هاوکاری بێ تواناکانیان کرد چیایەکی پتەو بەرگەیان گرت، لەکاتی ئەم داگیرکاریەدا یارمەتی لە دەرەوە دەهات بۆ کویت، هەروەها بازرگانەکان ئەوی مابوو لایان، هەستان بە دابەش کردن بەسەر ئەوانەی مابوونەوە لەکوەیت، وە کارەکەیان دڵسۆزانە کرد، بەڵام بەربەستی گەورەیان نەبوونی ئاسایس و ئەمان بوولە ترسی ئەم ستەمکارە دڕندانەی لە وڵاتەکەدابوون، یەکێك لە چیرۆکانە ڕوویدا لەو ڕۆژگارانەدا ئەم چیرۆکەیە یەکێك لە پاڵەوانەکانی بۆی گێرامەوە:

عەلی جمعە فەرمانبەرێك بوو لو کۆمەڵەی (بیان التعاونیة) و شتومەکی خواردنیان بە سەر خەڵك دابەش دەکرد، پاشا دوو مانگ بەسەر داگیرکردنی کویت داو لە مانگی نۆڤێنبەردا، (فایز عزیز ) پەیوەندی پێوەکرد و پێکەوە لە مزگەوتی (مریم بنت الصباح) کۆبوونەوە بە ئامادەبوانی ووت: هەندێ پارەم لەلایە و دەمەوێت بەسەر خەڵکی ناوچەی بیان دا دابەشی بکەین هەریەك لە ئێوە با لێپرساوی ئەو ناوچەیە بێت لێ دادەنیشیت.

بڕیارماندا سبەێنی هەریەکێکمان بە سواری پایسکیل بێین و پارەکان وەربگرین، تاکو هێرشی داگیر کەر نەمان پشکنن وپارەکانمان وەرگرت

علی جمعە بەردەوام دەبێت ودەڵێت: ئەو پارە لەلای من بوو (حەوسەدو پەنجا هەزار دیناری عیراقی بوو)، پێویستی دەکرد هەر خێزانێکی بچوك هەزار دینار و خێزانی گەورەتر هەزار و پێنچ سەد، دەستمان کرد بە دابەش کردن و لەنێو زەرفدا دامانناو یان لەسەر دەرگا وە بۆمان فرێ دەدان یان لەژێر دەرگا کەوە داماندەنا، تاکو کەس نەزانێ کێ بووە و نەماننناسنەوە



دوایی دابەش کردنی هەر کەس گەڕاینە وە سەر کاری خۆمان بەبێ ئەوەی کەس بمانبێ، لەدوایی دووڕۆژ سەربازانی داگیرکەر یەکێك لەوانەی پارەی لەگەڵدا دابەش کردبووین گرتبوویان و، لەژێر ئەشکەنجە و سزادان دا ناوی هەموومانی دابوو، کاتێك زانیمان هەریەکە هەواڵیان بەیەکتر داو بڕیارمان دا ڕا بکەین و بۆ ناوچەیەکی تر بڕۆین، بەخێرایی ماڵەکەم بەجێ هێشت و بەرەو ناوچەی (قرین) ڕۆیشتم، لەپاش ئێمە سەربازەکان چووبوونە سەر ماڵەکەم بەڵام کەسی تیانەبوو، پاشان بۆ شوێنی کارەکەم چووبوون، ماوەیەکی زۆر بۆمان گەڕان و هەندێکیان لێ دەستگیرکردن، بەڵام بۆ ماوەی دوو مانگ من خۆم شاردەوە و کەسانێکی زۆر کەم نەبێت کەیارمەتیان دەدام شوێنەکەیان نەدەزانیم، سوپاس بۆخودا ئەم ڕۆژە ناخۆشە بەسەر چوون تووشی هیچ نەبووم ونەکەوتمە دەستی ئەم ستەمکارانە[١].

ئەم ڕەوشتە چاکانە و بەدەمەوە چوونی پێویستەکانی کەسانی تر و هاوکاری کاری خێر و دوورکەوتنەوەی لە خۆپەرستی و هەروەها خۆبەخت کردنی لە ڕێگەی نیشتمان دا هەیە هەر لە کۆنەوە ڕەوشتی میللەتەکەمان بووە و بەتایبەت لە تەنگانەدا دەرکەوتووە. چونکە خودا دەفەرموێت:

﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ [١].

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

(مثل المؤمنین في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم کمثل الجسد إذا إشتکی منه عضو تدعی له سائر الجسد بالسهر و الحمي)[٢].

واتە: (ئیماندار لە خۆشەویستی و بەسۆزی و بەزەییان بۆ یەکتر وەك یەك جەستەن ئەگەر ئەندامێکی بێتە ئازار هەموو جەستەی شەو نخون دەبێت و تای لێ دێت )

---

(١) ئەم چیرۆکە بەڕێز ( علي جمعه العلی ) بۆی گێرامەوە.

(١) سورة المائدة: أية ٢.

(٢) بوخاری و مسلم گێرایانەتەوە.





## چاکە پاداشتەکەی دە ئەوەندەی خۆیەتی

ئەبو ئەحمەد کەسێکی خواناس و چاکە خواز بوو، هەمیشە خەندە لەسەر لێوەکانی بوو، هەرکەسی بیبینیایە خۆشی دەویست،

لەیەکێك لە رۆژەکان ئەبو ئەحمەد دەچوو بۆ نوسینگە بازرگانیەکەی، کابرایەك لەسەر رێگا دەستی لێ راگرت، ئوتۆمبیلەکەی راگرت تا بزانێ چ کارێکی هەیە، کابرا داوای لێ کرد بیگەیەنێت و لەسەر رێگاکەی خۆی.

ئەبوو ئەحمەد: دڵی نەشکاند و سەری خست.

لە رێگا ئەبو ئەحمەد لە کابرای پرسی چ کارەیە و باری ژیانی چۆنە، کابرا لەبری وەڵام دڵی دەکوڵا دەمێك بوو پەنگی خواردبووەوە، هەر بۆیە وەڵامەکەی پرمەی گریان بوو و نەیتوانی هیچ بڵێ، ئەبو ئەحمەد ووتی: بۆم باس بکە بەڵکو خێری تێدایە.

کابرا ووتی: ببورە بۆ گریانەکەم، بەڵام حاڵەتەکەم بەرد دەکا بە ئاو. ئەبو ئەحمەد دڵی دەستی کرد بە لێدان ی خێرا و ووتی زیاتر پەرۆشم بیبستم.

کابرا ووتی: بەخەیاڵ پلاوێکی گەورەوە هاتم تاوەکو لێرە کاربکەم و خۆم بنیات بنێم،لە رێگەی ئەم خەونەدا پارەیەکی زۆرم خەرج کرد، بەڵکو بەوەشەوە نەوەستام قەرزێکی زۆرم کرد تاگەیشتمە ئێرە، بەو ئومێدەی لە داهاتوودا پەیدای بکەمەوە، بەڵام لەو کاتەوەی هاتووم بە دوای کاردا دەگەڕێم و بۆم پەیدا ناکرێت، هەرچی دەروازەکان هەیە بەڕوومدا داخراوە، بەڵکو قورەکە خەستتر بۆتەوە، لەگەڵ ئەم هەموو بەڵایە دا ئیستا دایکم زۆر نەخۆشە و دەبێت بگەڕێمەوە، ئێستا ئیتر کاریشم ناوێ، تەنها دەمەوێت پارەی یەك پلیتی فرۆکە پەیدا بکەم و خۆم بگەیەنمە لای دایکم، خۆ ئەگەر تۆ پرسیارت لێ نەکردبامایە پێم خۆش نەبوو ئەم هەموو خەمەیش هەڵبرێژم لای تۆدا و تۆ نیگەران بکەم بمبورە.

بەڵام ئەبو ئەحمەد هەروەك سیفەتی خۆی بە سۆزوبەزەییە وە پێ ووت:

تۆ ئاگاداربە ئەگەر هەموو دەروازەکان لە رووی تۆدا داخراوبن، دەروازەی خودا هەمیشە کراوەیە ئەگەر بەڕاستی پشتی پێببەستێت و رووی تێ بکەی،،



لەوانەیە گەڕانەوەت بۆ وولاتەکەت و لەلای دایکتدا بمێنیتەوە بۆ تۆ باشترین شتێ لە دنیا و دوا ڕۆژت دا .
ئەبو ئەحمەد جوزدانەکەی دەرهێنا و تەنها سێ دیناری تێدابوو هەمووی پێداو پێ ووت: برۆ بەشکم سوودی لێ ببینیت.
کابرا زۆر دوو دڵ بوو لە وەرگرتنی پارەکە، بەڵام ئەبو ئەحمەد زۆر سور بوو لەسەری.پاشان گەیاندیە ئەو شوێنەی دەیوویست و، ئەبوو ئەحمەد چووە سەرکارەکەی و مێشتك و بیرکردنەوەی سەرقاڵی ئەو پیاوە بوو، بۆی دەپارایەوە خودا کار ئاسانی بۆ بکات و، ئەو ڕۆژە زۆر لە خەیاڵدا ڕۆ چوو بوو، لە ناکاو کەسێکی نامۆ کە پێشتر نەیبینیبوو هاتە ژوورەوەو نامەیەکی پێ گەیاند و ووتی:ئەم باقی یە لەلای ئێمە مابوو. کابرا بەپەلە ڕۆیشت.
ئەبو ئەحمەد حەپەسابوو، پاشان خێرای بە دوایی کابرا دا ڕۆیشت، تازە دیارنەمابوو، گەڕایەوە و هەناسەیەکی داو، پاشان تەماشای نامەکەی کرد ناوەکەی لەسەر نامەکەی نوسرابوو، پاشان لەوە سەیرتر ناوی تەواو و ناونیشانیش لەسەرە، ئەبو ئەحمەد نامەکەی کردەوە سێ سەد دینار ی تێدابوو، لێرەدا زیاتر سەری سوڕما و ئەبێ ئەم کەسەکێ بێ.. کێ...کێ.. چەندین ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا ڕوویداوەو هێشتا ئەبو ئەحمەد نازانی کەسەکە کێ بووە[1].
بەڵام لەڕاستیدا ئەمە بەرهەمی چاکە و چاکە خوازی یە، کەوا بەدە ئەوەندەی خۆیەتی، لە کاتێکدا کەسێك بەهانای موسڵمانێکەوە دەچێت خودایش بەهانای ئەمەوە دەچێت و هەتا بەندەکان لە هاوکاری بەندەکانی تر دابن خودا هاوکاریان دەکات هەر وەک خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾[2].

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:
(انفق يا ابن ادم ينفق عليك)[3].
واتە: (ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەبەخشرێتەوە)

---

(۱) بەرێز (يعقوب سلطان) ئەم ڕووداوەی بۆ گێرامەوە.
(۲) سورة السبأ: أية ۳۹.
(۳) متفق عليه.

## بەندی دووەم

### بەشی یەکەم: ( چــاکــە )

خودا دەفەرمویت: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾[1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمویت:

(صنائع المعروف تقی مصارع السوء، والصدقة خفیه تطفیء غضب الرب، وصله الرحم زیادة في العمر، و کل معروف صدقة، وأهل المعروف في الدنیا هم أهل المعروف في الاخرة، وأهل المنکر في الدنیا هم أهل المنکر في الاخرة)[2].

واتە: ( کرداری چاکە لە شوێن کەوتنی کاری خراپە پارێزراو تان دەکات، چاکە و خێرێك بە نهێنی بکەیت توورەیی خودا لەسەرت لادەبات و، گەیاندنی سیلە و پەیوەندی خزمایەتی تەمەن درێژ دەکات و، بە هەموو کارێکی چاك خێرت بۆ دەنوسرێ و، کەسانی چاکەکاری لە دنیادا هەر بە چاکەکار لە قیامەت دا دەناسرێتەوە و، کەسانی خراپە کاریش هەر بە ئەهلی خراپ لە ڕۆژ قیامەتدا دەردەکەونەوە).

یەکەم:بەرهەمی لەبەرکردنی قورئان.

دووەم: بەرهەمی کاری چاکە و خێر.

سێ یەم: بەهەشت بە چاکە و خێر دەبرێتەوە.

چوارەم: موسڵمان لە سایەو سێبەری چاکەکەیدا.

پێنچەم: بەرهەمی ڕاستگۆی.

---

(١) سورة الرحمن: أیة ٦٠.

(٢) طبری ڕیوایەتی کردووە، ئەلبانی بە (صحیح)ی داناوە.



## بەرهەمی لەبەرکردنی قورئان

ئەم چیرۆکە دکتۆر سید حسین عەفانی لە کتێبی ( الجزاء من جنس العمل) دا هێناویەتی، لە شێخ ئەبوو عبدالرحمن ی کوری عقیلی طاهیری و، ئەویش لە محفوظ شقیطی کە بەڕێوەبەری گشتی یە لە کۆمەڵگای (ملك فهد) بۆ قورئانی پیرۆز، ئەم چیرۆکە سەبارەت بەمامۆستا یەکی گەورە و قورئان خوێنێکی شارەزایە، (شێخ عامری سید عثمان) ڕەحمەتی خودای لێ بێ )، دوایی ئەوەی چەندین ساڵ وانەی بەوقتابیەکانی دەوتەوەو فێری قورئانی خوێندنی دەکردن، قەدەری وابوو لەحەوت ساڵی کۆتایی تەمەنیدا ژێ یە دەنگەکانی لە کار بکەون، لەو ماوەدا کەس نەیتوانی گوێی لە دەنگی بێت تەنها بە ئاماژە و چاوتێبڕین نەبێت، پاشان نەخۆش کەوت و، لەنەخۆشخانە کەوتە سەر جێگە و لە مردن نزیك بوویەوە، هەتا ئێرە چیرۆکەکەمان ئاسایی، بەڵام ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو، ئەم پیاوەی حەوت ساڵ بوو ژێ یە دەنگەکانی لە دەست دابوو کەس گوێبیستی دەنگی نەبوو بوو لەو کاتەوە، لە سێ ڕۆژی پێش مەرگی و لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە بە دەنگێکی ڕوون و ئاشکرا خەتمی قورئانی کرد، لە سورەتی (الفاتحة )ە وەتا سورەتی (الناس) و،هەموو کارمەندان گوێ یان لە دەنگیان بوو، پاشان گیانی سپاردو گەڕایەوە بۆ لای خودا[1].

کەواتە پاداشتی هەموو چاکەیەك هەر چاکەیە..

---

(١) لە کتێبی ( الجزاء من جنس العمل ) - بەشی دووەم -.





## بەرهەمی کاری چاکە و خێر

ڕۆژێکیان جیگیری دەسەلاتداری میسر عەلی کوڕی محمد، ئیبن فوراتی بانگ کردووە، پێی ووت: ماڵ وێران من تۆ بە کەسێکی باش نازانم و نیازی چاکەم پێت نییە، بەڵام هەر کاتێك دەمەوێت دەستگیرت بکەم و دەست بەسەر ماڵەکەتدا بگرم، شەو لەخەوندا دەتبینم و بە کۆلێرەیەك ڕێگەم لێ دەگرێت، چەندین جار لە خەون دا تۆ دەبینم و، من دەمەوێت دەستگیرت بکەم بەڵام تۆ بەرگری دەکەیت، پاشان فەرمان بە سەربازەکان دەکەیت بتکوژن، بەڵام تۆ کۆلێرەیەکت بە دەستەوەیەوە ناهێڵێت هیچ تیرو لێدانێك بگات بە جەستەت ! سەرم سوڕما لە چیرۆکی ئەم کۆلێرەیە و دەمەوێت بزانم ئەمە چی یە ؟

ئیبن فورات ووتی: جەنابی وەزیر، لە کاتەوەی منداڵبووم دایکم هەموو شەوێ کۆلێرەیەك لەژێر پشتی نوستنەکەمدا دادەنا، کەرۆژدەبوویەوە دەیکردە خێر، ئەمە کاری بوو هەتا کۆچی دوایی کرد، دواتر خۆم وام دەکرد و، شەوان لەژێر پشتیەکەمدا کۆلێرەیەکەم دادەناو پاشان ڕۆژدەبوویەوە دەمکردە خێر. ئەم کارە وەزیری زۆر سەرسام کرد و پێی یووت: سوێند بە خودا لە ئەمڕۆ بەدواوە لەلای منەوە هیچ خراپەیەکت پێ ناگات و ئیتر بەرانبەرت نیازم پاك بوویەوەو خۆشم ویستیت[1].

---

(١) (البداية و النهاية).



## بە هەشت بە چاکەو خێر دەبرێتەوە

پیاوێکی خەڵکی شام هات و ووتی: پێم بڵێن صفوانی کوڕی سلیم کامەیە، چونکە لە خەوندا بینیم دەچووە بە هەشتەوە.
ووتم: بە چ شتێك
ووتی: بەکراسێك کەسێکی پێ پۆشتە کردۆتەوە.
(لەبارەی ئەم کراسەوە پرسیاریان لە صفوان کرد، ووتی: لەشەوێکی زۆر ساردا، لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە، پیاوێکم بینی لەوسەرمایەدا بێ بەرگە، منیش کراسەکەی خۆمم داناو ئەوم پێ پۆشتەکردەوە)[1].

(١) لە کتێبی (صفحات مشرقة) ص ١٧٩.





## موسڵمان لە سایە و سێبەری چاکەکەیدا

پیاوێك بەناوی ئیبن جدعان سەر گوزەشتەی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەرۆژێکی بەهاردا بە نێو حوشترەکانمدا دەگەڕام، ئەو بەهارە ئەوەندە بە پیت بوو خەریك گوانی حوشترەکانم لە شیردا دەتەقین، چاووم کەوتە سەر یەکێك لە حوشترەکانم کە خۆشەویسترین سامان بوو لە لام، لە دڵی خۆمدا ووتم: ئەم حوشترە ئەکەم بەخێر و ئەیدەم بە دراوسێکەم، زۆر نەدار و هەژار بوو لەگەڵ کەمدەرامەتیکەیدا حەوت کچی هەبوو،ڕەشووەی حوشترەکەم گرت و لە دەرگاکەیانمدا، کاتێك دەرگای لێ کردمەوە پێم ووت: ئەم حوشترەم بە دیاری بۆ هێناوی.
خۆشحاڵیەکەی بە جۆرێك بوو نەیدەزانی لە خۆشیان چی بڵێ، ئیتر شیرەکەی دەخواردو شتیان پێ هەڵدەگرت، خێرێکی زۆر بۆ دایەوە.
بەڵام وەرزی هاوین هات و گەرماو ووشکی بە دوایی خۆیدا هێنا، دەشتەکیەکانی ناچارکرد کۆچ بکەن بەدوای ئاو و لە وەری زیاتر بگەڕێن، ئیبن جدعان دەڵێت: خۆمان کۆکردەوە لەنێو (دحل)[1]ەکاندا بۆ ئاو دەگەڕاین، من دابەزیمە خوارەوە بۆ نێو یەکێك لەو چاڵاوانە تاوەکو ئاو بدۆزمەوە، لە کاتێکدا هەرسێ کوڕەکەم لە دەرەوەی کونەکە چاوەڕوان بوون، باوك وون بوو ڕێگەی چوونە دەرەوەی نەدۆزیەوەو، کوڕەکانی سێ ڕۆژ چاوەڕوان بوو، پاشان بە خۆیان ووت: لەوانەیە وون بوو بێت لە ژێر زەویداو تیا چوو بێت، حەزیان لە مردنی دەکرد، چونکە چاویان بڕیبوە سامانەکەی، پاشان بە پەلە گەڕانەوە ماڵەوە سامانیان لە نێوانیاندا دابەش کرد، پاش بەش کردنەکە بیریان کەوتەوە کە باوکیان چاکترین حوشتری کردووە بەخێر و داویەتی بە دراوسێکەیان، چوونە سە ری پێ یان ووت: ئەو حوشترەمان پێ بدەرەوە ئەمەی تر لە جیاتی ببە، ئەگینا بە زۆر لێت

---

(١) (دحل) چاڵاوە یان کون لە نێو زەوی دا ئەو شوێنانەت دەبات کە ئاوی تێدا کۆبۆتەوە.



وەردەگرینەوە و هیچیشت پێنادەین لە بری.
دراوسێی هەژار ووتی: لەلای باوکتان سکاڵا دەکەم.
ووتیان ئەو مرد.
ووتی: مرد، چۆن؟ لە کوێ مرد؟!
ووتیان لە نێو بیاباندا چووە نێو(دحل)ێکەوەو نەهاتەدەرەوە
ووتی: حوشترەکەم ببەن و، ئەوەی ئێوەیشم ناوێ، بەڵام تەنها شوێنی (دحل) ەکەم پێ بڵێن.
کابرایان بردە سەر شوێنەکە و لەوێ جێیان هێشت.
پەتێکی ئەستوری لە دەرەوەی (دحل)ەکە بەستەوەو سەرەکەی تری بەدەستی خۆیەوە بەستەوەو چرایەکی لەگەڵ خۆیدا برد چووە خوارەوەو لەسەر سنگ دەخشا و شوێن پێ یەکانی هەڵدەگرت هەتا گەیشتەنەوشوێنانەی بە گاگۆڵکێ دەڕۆیشت و پاشان بەسنگەخشێ، دواتر بۆنی شێ و قوڕ و ئاوی دەکرد لێی نزیك بوو، لەناکاو گوێبستی ناڵە ناڵێك بوو، لەسەر چاوەی دەنگەکە نزیکتر بوویەوەو بەدەستەکانی لەپی دەکوتا تاکو دەستی گەیشتە تەڕای و قوڕکە و پاشان دەستی بەر پیاوەکە کەوت، تەماشای کرد هێشتا هەناسە دەدات و زیندووە، هەستایەوەو دوایی ئەوەی چاوەکانی بەستەوە تاکە ڕۆشنایی خۆرکاری لێنەکات، دەستی کرد بە ڕاکێشانی هەموو هەوڵی خۆی دا تاوەکو هێنایە دەرەوە و پاشان خورما ی پێ داو،کردیە کۆڵی و، هێنایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و ژیانی بوژایەوە سەرلە نوێ تەمەنی بۆنوسرایەوە.
دراوسێ هەژار لێ ی پرسی: پێم بلێ چۆن بۆ ماوەی یەك هەفتە لە ژێر زەوی دا مایتەوە نەمردیت ؟
ئیبن جدعان ووتی: بۆت دەگێرمەوە، سەرەتا چوومە نێو (دحل) ەکەوە پاشان وون بووم و نەمدەزانی بۆ چ لایەك دەڕۆم، گەیشتمە ئاوێك و لێم خواردەوە، بەڵام خۆ ئاو بە تەنها بەس نەبوو، دوایی سێ ڕۆژ برسێتی زۆری بۆ هێنام و هیچ چارەیەکم نەبوو ! لەسەر پشت ڕاکشام و خۆم دایە دەستی خودا، بەڵام هەستم دەکرد شیرێکی خۆش دێتە ناو دەممەوە، خۆم جولاند، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر تاریك بوو هیچم نەدەبینی تەنها هەستم دەکرد قاپێك شیر لە لێوەکانم نزیك دەبنەوە پێ ی تێر دەبم و، پاشان نامێنێت، ڕۆژانە سێ جار هەستم پێ دەکرد، بەڵام دوو ڕۆژە لێم بڕابوو





نازانم هۆکارەکەی چی بوو ؟

دراوسێ ووتی: من هۆکاری لێبڕانەکەت پێ دەڵێم، منداڵەکانت وایان زانی تۆ مردوویت و هاتن و ئەو حوشترە خودا شیری دەدا بە تۆ لێ ی لە منیان سەندەوە، چونکە موسڵمان لە ژێر سایەو سێبەری چاکەکانیدایە[1].

لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خودای لێ بێ ووتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی:

(صنائع المعروف تقي مصارع السوء والافات والهلكات و أهل المعروف في الدنيا هم أهل المعروف في الاخرة)[2].

وات: ((کاری چاکەی مرۆڤ لە شوێن کەوتنی خراپە و بەڵاو نەهامەتی دەپارێزێت،وە کەسانی چاکە خوازی دونیا هەر لە دوا ڕۆژیشدا کەسانی چاکەکار دەبن )).

---

(١) ئەم چیرۆکە لە ڕادیۆی مەملەکەتی سعودیەی عەرەبی یەوە پەخش کراو بڵاو کرایەوە.

(٢) (صحيح، رواه الحاكم ).



# بەرهەمی ڕاستگۆیی

پیاوێکی ئەوروپی دوایی ئەوەی ئیسلامی ناسی موسڵمان بوو، زۆر بە جوانی پەیڕەوی ئاینەکەی دەکردو، شانازی بە ئیسلامەوە دەکرد، لە هەموو کردەوەیەکی دا ڕاستگۆ بوو، زۆر سوور بوو لە سەر ئەوەی بەبێ شەرم و دوودڵی ئیسلام بوونەکەی خۆی ئاشکرا بکات.

خۆی دەگێڕێتەوە: یەکێك لە دامەزراوە حکومیەکانی وولاتەکەم ڕاگەیەندراوەیەکی بڵاو کردەوە، داوای فەرمانبەریان دەکرد بۆ هەندێ کار، منیش داوام پێشکەش کردو پێویست بوو چاوپێکەوتنی تایبەت بکرێم، کێبڕکێ بۆ بەدەست هێنانی ئەم کارە زۆر زۆر بوو، کاتێك چوومە بەردەم ئەندامانی لێژنە، چەند پرسیاریکیان لێ کردم، لە نێو ئەو پرسیارانە دا ئەم پرسیارە بوو:

١- مەی دەخۆیتەوە ؟

بەو پەڕی سەربەرزی و شانازی یەوە وەڵامم دایەوە: مەی ناخۆمەوە چونکە موسڵمان بووم و ئاینەکەم ڕێگری مەی خواردنەوەم دەکات.

٢- ئایا دۆست و هاوڕێ کچت هەیە ؟

لە وەڵامدا ووتم: نەخێر، چونکە ئەو ئیسلامەی من هەڵمبژاردووە ئەمانەی لەسەر حەرام کردووم و،تەنها ئەتوانم پەیوەندیم لەگەڵ هاوسەرەکەم هەبێت کەبەپێ شەریعەتی خودا هێناومە.

لە گێڕانەوەکە بەردەوامە و دەڵێت: کە هاتمە دەرەوە، بێ ئومێد بووم لەوەی سەرکەووتوو بم، لەبەر ئەوەی هەموو کەسەی داوایان پێش کەش کرد بوو، بەڵام ئەنجامەکەی لە بەرژەوەندی من بوو، من بە تەنها وەرگیرابووم.

دەڵێت: چووم بۆ لای لێپرسراوی لێژنەکە و پێم ووت: لە ڕاستیدا من هیچ بە تەما نەبووم لەم چاوپێکەوتنە دا سەر بکەوم و کارەکە بۆ من بێت.

لێپرسراوی لێژنەکە ووتی: لەبەر چی وا گومانت دەبرد ؟

ووتم: لەو باوەڕدابووم ئێوە من بێ بەش دەکەن لەو کارە بەهۆی ئەوەی لە





ئاینەکەتان لامداوەو، ئیسلامم هەڵبژاردووە، بەڵام زۆر لەناکاو بوو بۆم کە وا من وەرگیرام وەك لە برا مەسیحیەکانم، ئاخۆ هۆکارەکەی چی بێت ؟!
لێپرساوی لێژنەکە ووتی: لە ڕاستیدا پاڵێوراو بۆ ئەم کارە مەرج بوو کەسێکی بە ئاگابێت لە هەموو بارەکان دا و، مێشکی لەلای خۆی بێت، ئەو کەسەی مەی دەخواتەوە و سەر خۆش دەبێت ناتوانێت وا بێت، لەبەر ئەوەی تۆ بە تەنها ئەم مەرجەت تێدا بوو کارەکە بوو بە بەشی تۆ.
چوومە دەرەوە سوپاسی خودام دەکرد کە هیدایەتی داوم بۆ ئەم ئیسلامە[1].

---

(١) لە (من ترك شيئا لله عوضه الله خيرا منه ). بە دەستکاریەوە.

# بەشی دووەم ( بەشی غەدرو ناپاکی )

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمویت:

(لكل غادر لواء يعرف به يوم القيامة ).

واتە: هەموو غەدر کاری و ناپاکان بەیداخێکیان پێ یە پێ ی دەناسرێنەوە.

یەکەم: تاوان و گوناه

دووەم: مرۆڤی ستەملێکراو

سێ یەم: بەشی بکوژ هەر کوشتنەوەیە ئەگەر ماوەیەکیشی پێ بچێت

چوارەم: پەیامی مەرگ

پێنچەم: ژەهر خواردم کرد و ژەهر خوارد کرامەوە.





## تاوان و گوناه

تەنها دوو برابوون و، لە نێو کێڵگە کەی باوکیان کاریان دەکرد، یەکێکیان دوای هاوسەرگیری چەند منداڵێکی بچووکی هەبوو، بەڵام ئەوەی تر ئەگەرچی هاوسەرگیری کردبوو بەڵام خودا هیچ نەوەیەکی پێ نەدابوو.
باوکیان کابرایەکی هەبوون و دەوڵەمەند بوو، برا وە چاخ کوێرەکە تەماحی کردە میراتی براکەی و، شەیتان چووە کەلەیەوە بیر لە کوشتنی براکەی بکاتەوە و، کوشتی تاکو خۆی ببێتە تاکە میرات گری باوکی لە دوایی مردنی.
باوکی کورەکەی نەدەبینی پرسیاری لەم برایەی دەکرد، بەڵام وا خۆی دەرخست هیچ دەربارەی نازانێت و، لەگەڵ باوکیدا بۆ برا وون بووەکەی دەگەڕان و کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵك هاوکاری کردن، پاش ماوەیەك دۆزیانەوە خزێنرابوویە نێو کونە بیرێکەوە. پیاوانی ئاسایش و پۆلیس بۆ بکوژ گەڕان، بەڵام ماوەیەك تێپەڕی کرد و هیچ تاڵێکیان دەست نەکەوت بیانگێنێتە تاوان بار.
باوکەی جەرگ سووتا زۆر خەمبار و هەراسان بوو، وای لێ کرد دوایی چەند مانگێك لە پەژارەو غەمدا سەری نایەوە.
هەموو سامانەکەی بوو بە هی ئەم براتاوانبارەو، منداڵە هەتیوەکانیش کەوتنە ژێر سێبەری مامەیانەوە، ئەم پیاوە چەند جارێکی تر هاوسەرگیری کرد بەڵام خودا نەوەی پێ نە بەخشی لێیان، ئەمەش وای لێکرد بەزەیی بە منداڵی براکەیدا بێتەوە چاودێریان بکات و خەرجیەکانیان بۆ بکات، ئەوانیش خۆشیان دەویست و دوایی ئەوەی باوکیان بە منداڵی لە دەست دابوو خومیان بە مامەیانەوە گرتبوو و سوکنایییان پێی دەهات.
ڕۆژگار تێپەڕی و نەخۆش کەت و هەستی کرد گەڕانەوەی بۆ لای خودا نزیك بۆتەوە و دەچێتەوە بەر بارەگای خودای،دادپەروەرو، تارمایی براکەی لێی جیانەدەبوویەو، هەموو ژیانی بەغەم و پەژارە تەندرابوو، ترس لە هەموو کون و قوژبنەکانی ژیانی دا هێلانەی تەنی بوو،هەمیشە بەشی گریان بوو، شەوێکی



نەبڕاوەو ڕۆژگارێکی دەردەدار.
کەس و کارو برازاکانی لە دەورەی کۆبوونەوە، بەڵام هێندە بەکوڵ دەگریا هەموویانی خستە گریان، زۆر بۆی پەرۆش بوون، دڵیان دایەوە و ئەم تۆقین و ترسەیان دەرەواندەوە پێ یان ووت: ئەم گریانەی بۆچی یە ؟ ترسی و تۆقینی ناوی تەنها گەرمە تاوێکەو ئازارت پێ دەگات و بە وویستی خودا بە سەلامەتی رزگار دەبیت. تۆ لە چی دەترسیت هەموو کردەوەکانت چاك بوون. نوێژت دەکرد، ڕۆژ ووت دەگرت، حەجت کرد، خێر بە هەژاران و نەداران کرد، ئەم کارانەت هەموو چاکەن و ڕووت سپی دەکەنەوە.
بەدەم ناڵە و هاوارەوە وەڵامی دانەوە: ئای ئەگەر دەزانن چیم کردووە و.. چیم لە ناخمدا شاردۆتەوە، تەنها خودا پێ ئاگادار بوو، ئەوە هۆکاری ترس گریانە کەمە، چونکە شەرمەزارم لە گەڕانەوەم بۆ لای خودا.. بەڵام پێش مردنم بۆتان باس دەکەم، بەشکو خودا لە گوناهەکانم و ئێوە لێم خۆش دەبن.
بەسەرسامیەوەو وتیان: ئەو نهێنی یە چی یە ؟ !
ووتی من براکەی خۆمم کوشت.
واقیان وڕما وەك ئەوەی دەمیان بەسترابێت، پاشان هەمووان بەیەك دەنگ ووتیان: ئەوە تۆ بوویت براکەتت کوشت ؟!
بەحەسرەت و گریانەوە ووتی:بەڵێ، هەمووی بەهۆی تەماحەوەبوو، نەمدەویست هاوبەشم بێت لە میرات دا و، بەڵام لەو کاتەوە ئەم تاوانەم ئەنجام داوە تامی حەسانەوەو خۆشیم نەچەشتووە، بەتایبەتی دوایی ئەوەی ئەم نەخۆشیە کە تەختی کردووم، لەناو جێگادام، لە هەموو ساتێك دا تارمایی براکەم لەبەر دەممدایە، ئیستا من ڕاستیەکەم پێ ووتن ئێوەش چیتان پێ خۆشە وام لێ بکەن، وویستی خودا وابوو کەمن بێ بەش بم لە نەوەو سەروەت و ماڵەکەی هەر بۆ خۆتان گەراندەوە.. برازاکانم. تکام وا لێم خۆش بن و بم بوورن لەوەی هەر بە منداڵی بێ باوکم کردن و دواواکارم لە خودا لُم خۆش بێت وبەزەیی پێمدابێتەوە.هەموان لێ دوورکەوتنەوەو بە تەنیا بە جێیان هێلا، ئازار بچێژێت و بناڵێنی ولە چاوەڕانی دابێت، هەتا لە دوایی مانگێك لەترس و ئازار و حەسرەت و چاوەڕوانی مرد[1].

(١) جريدة ((الانباء)) ژمارە (٦٩٨١)





## مرۆڤی ستەملێکراو

بازرگانێکی زۆر لە خودا ترس و بێ فێڵ بوو، ئاینەکەی زۆر بە جوانی پەیڕەو دەکرد و ڕۆژووی زۆر دەگرت، خێرو خێراتی زۆر دەکرد و خۆی لە تاوان دەپاراست و بێ خەوش بوو. لە عیراق و ئێران ماڵات و مانگای دەکڕی و دەیبرد لە سوریا دەیفرۆشتەوە.

بەڵام هەموو جارێك بەخت یاوەری نەبوو، ئەمجارەیان یەکێك لە سەفەرەکانیدا کاتێك کەوتە ڕێ و ماڵاتەکەی دەگوێزایەوە، لە ڕێگەی بەفرێکی زۆر باری وڕێگاکانی داخست و لەوەڕگای نەهێشت، هەموو مانگاکانی ڕەق بوونەوە تەنها چواردانە نەبێت، دڵی بەمانەش هەر خۆش بوو، لێرەو لەوێ دەگوێزانەوە بەڵکو بیانگەیەنێتە حەلەب، لە ڕێگادا ڕێی کەوتە لادێ یەکی بچوك لەسەر ڕێگای موصل بۆ حەلەب و دای لە دەرگای یەکێك لە ماڵەکانی گوندەکە، کە دەرگایان لێ کردەوە داوای لێ کردن تەنها بۆ یەك شەو داڵدەی بدەن و سبەینی سبەینی بەرەو لادێ یەکی تر دەڕوات.

خاوەن ماڵ بە خۆشی حاڵیەوەپێشوازی لێ کرد و مانگاکانی بۆ کردە گەورەکانی خۆی یەوە و کاو عەلەفی پێ دان و، خواردنیشی دا بە میوانەکەی، بەڵام خاوەن ماڵ هیچی نەمابوو، هەموو ماڵاتەکانی لە سەرماکەدا مرداربوو‌بوونەوەو، کشتوکاڵەکەی بەهۆی سەرمایەوە تیا چوو بوو، چونکە بارینی بەفرەکە لەم زستانەدا درێژەی کێشابوو وە ڕێژەیەکی زۆر باری بوو، کابرا هاوسەرگیری کردبوو بەڵام تەنها یەك کوڕی هەبوو، خانووەکە تەنها دوو ژووی بۆ نوستن تێدابوو، ژوورێك بۆ خۆی و خێزانەکەی، ژوورێکیش بۆ کوڕەکەیان.

لە دوایی نان خواردن حەوانەوە لە دەوری میوانە نوێیەکە کۆبوونەوەو، شەونشینیەکی خۆشیان بەسەر بردو، قسەو باسی زۆر هێنران وبران، تا خاوەن ماڵ تێگەیشت میوانەکەی پارەیەکی زۆری پێ یە.

دواتر شەو نشینی کۆتایی هات و کاتی خەوتن هات، میوانەکەیان دەبوایە



لە ژووری کوڕەکەیان بنوستایە، میوان لە سوچێکی لای ڕاستی ژوورەکەدا ڕاکشاو، کوڕەکە لەلای چەپی ژوورەکەدا نوست.
پاشان خاوەن ماڵ هات و پرسیاری لە میوان کرد کە هیچی پێویست نی یە و، دڵنیابوو لەوەی شوێنەکەی باشە.
خانە خۆێ گەڕایەوە لە ژوورەکەی خۆی دا بخەوێ، بەڵام ژنەکەی دەستی کرد بە چیە کردن بۆی و ووتی: کابرا تاکەی دەتەوێ لەم هەژاری و دەست کورتیە دابمێنێتەوە ؟.. ئەم میوانە چەورە و، ئێمەش لە هەموو کەس زیاتر پێویستمان بەو ماڵ و مانگایانەیەتی، ئێمە تا ڕۆژیك نانمان دەست دەکەوێ چەند رۆژێك برسین، ئەی چی بکەین ئەگەر برسیەتی بە تەواوەتی بەسەر گوندەکەماندا باڵ بکێشێ و نەسامانمان هەیە و نەخۆراك ئەمرۆ دەرفەت و هەلمان بۆ ڕەخساوە، با ئەم میوانە دەوڵەمەندە ڕووت بکەینەوە و پارەو مانگاکانی بۆ خۆمان ببەین. لەبەر ژیانی خۆمان و تاقە کوڕەکەمان.
خانە خۆی شەرمی لەم قسانە کرد و ووتی: چۆن کاری وا بکەین ئەوە میوانمانە ؟! بەچی پارەو مانگاکانی لێ بسەنین ؟! چۆن دەهێڵێت ؟!
ژنەکە دڵڕەقانە ووتی: بیکوژە فرێ دەدەینە ناو چاڵێك لەو دۆلە، کێ بە هەواڵی دەزانێ ؟!
خانە خۆی زۆر دوودڵبوو...دڵی بڕوای نەدەدا غەدری وا بکات.. بەڵام ژنەکە کۆڵی نەدا و بۆ ئەوەی کابرا دوودڵیەکەی بڕەوێتەوە پێ ی ووت: ئەم کارەت بۆ ئەوەی ئێمە لەمردنێکی حەتمی ڕزگاربکەیت و، شتەپێویست و زەرورەکان حەرامەکان حەلاڵ دەکەن.بەم شێوەیە تاکو شەیتان بووە سێیەمیان
لە کۆتایی دا خاوەن ماڵ قەناعەتی کرد و بڕیاری دا میوانەکە نەفەس بڕ بکات و هەموو سامانەکەی ببات.
لەدوایی نیوە شەو دابوو، دنیا لە ئارامیەکی زۆر دابوو، تاریکی باڵی بەسەر گوندەکەدا کێشابوو، کابرا خەنجەرێکی دەرهێناو تیژی کردەوە، بەرەو ژووری کوڕەکەی رۆیشت و بێ وچان ژنەکەی هانی دەدا و، لەسەر نوکی پێ یەکانی وورده وورده ڕۆیشت، بەرەو لای شوێنی نوستنی میوانەکە ڕۆیشت، لەبەر ئەوەی تاریکیەکەزۆر بوو دەستی کوتا تاکو ملی گرت و وەك مەڕسەری بڕی.
پاشان ڕێك کەوتن پێش ئەوەی ڕۆژببێتەوە پێکەوە لاشە کوژراوەکە بهێننەوە دەرەوە و



لە کۆل خۆیانی بکەنەوە، بەڵام چییان بینی تاقە کوڕەکەی خۆیان سەر بڕی بوو. هەردووکیان لەداخ و حەسرەت هاواریان لێ هەستاو، بورانەوە.
ئەو دەنگە و هاوارە میوان و دراوسێکیان هەژاند و تەماشایان کرد کوڕی ماڵ کوژراوە، میوان و دراوسێکان ئاوی ساردیان هێنا و پرژاندیان لە پیاوو ژنەکە... دوایی ئەوەی هۆشیان هاتەوە، گریانێکی بە کوڵ دەگریان و داوایان لە دراوسێکان کرد هەواڵ بدەن بە پۆلیس، پۆلیس هات و تاوانباریان برد
بەڵام ئەوەی ماوە بیزانین چی لە ژووری نوستنی کوڕەکەدا ڕوویدا وا لە جێگەی نوستنەکە گۆڕدران ؟!
لە ڕاستیدا دوایی ئەوەی باوکە ڕۆیشت و دڵنیابوو لە شوێنەکانیان، کوڕەکە خەوی لێ نەدەکەوت و دووبارە لەگەڵ میوانەکە کەوتنەوە قسەکردن و، قسەکانیان هێندە گەرم و گوڕ و خۆش بوو زۆری برد، هەتا کوڕەکە خەو بردیەوە و لەسەر جێگای میوانەکە خەوی لێکەوت، میوانەکە دڵی نەهات هەڵی بسێنێت لەبەر ئەوەی دایپۆشی و، چووە سەر جیگای کوڕەکە نوست.. بەڵام کاتێك هاتەژوورەوە دڵنیابوو، کەوا هەر یەکێکیان لە کوێ دا نوستوون، وویستی میوانەکە سەربڕێ بەڵام کوڕەکەی خۆی سەربڕی، خاوەن ماڵ میوانەکەی وویست بەڵام خودا کوڕەکەی وویست، دراوسێکانی کوڕە جوانە مەرگەکەیان ناشت و، باوکەکەیش چووە سووچی زیندان[1].

---

(١) چیرۆکی (( الانسان المظلوم )) لە کتێبی ( عدالة السماء ) ل ٣٣و٣٤و٣٥و٣٦



## بەشی بکوژ هەرکوشتنەوەیە
## ئەگەر چی ماوەیەکیشی پێ بچێت

جەستەی پاسەوانێك لە خوێنی خۆیدا گەوزابوو پۆلیس گەیشتە سەری و، ژنەکەی بە پەت بەسرابویەوە و چەند چەقۆیەك لە هەندی بەشی جەستەی درابوو، بەخێرایی گەیەندرایە یەکێك لە نەخۆشخانەکان و لە نێو ژیان و مردن دابوو.
پیاوانی ئاسایش هەموو هەوڵێکی خۆیان چڕکردەوە تاکو تاوانبار دەستگیر بکەن، بەڵام لێکۆڵینەوەکان هیچیان دەرنەدەخست، ماوەیەك تێپەڕی هیچ ئەنجامێکی نەبوو، دوایی هەوڵێکی زۆر و ماندووبوون چەند دڵۆپە خوێنێکی مەییوویان لەلای ژووری یەکێك لە کرێکارەکانی ئەو شوێنەی کابرا پاسەوانی بوو دۆزیەوەو خستیانە ژێر چاودێری وورد.
ژنی کوژراو دەستی بەچاك بوونەوەکردو، پیاوانی پۆلیس لێکۆڵینەویان لەگەڵ دا کرد، بەڵام هیچیان لە قسەکانی دەست نەکەوت، چونکە دەیووت کەسانێکی نەناسراو هێرشیان کردۆتە سەر ژوورەکەیان و داوایان لە مێردەکەی پارەیان پێ بدات، بەڵام دوایی ئەوەی ڕەتی کردۆتەوە ئەویان کووشتووە و ئەمیان بەستۆتەوە و برینداریان کردووە و ڕایان کردووە، لەبەر تاریکی کەسیان نایناسێتەوە.
پۆلیس ناچار ئەو پیاوەی گومانیان لێدەکرد دەستگیریان کرد، بەڵام کرێکارەکە نکۆڵی لەم کارە کردو بەڵگەی بەهێزش نەبوو تاوانەکەی بەسەردا ساغ بکاتەوە، لەبەر ئەم هۆکارە ئازادیان کرد، بەڵام پیاوانی پۆلیس خستیانە ژێر چاودێری بەردەوامەوە و، هەموو جووڵە و هەنگاوێکیان خستە ژێر چاودێری.
ڕۆژێکیان تاوانبار خۆی کرد بە گازینۆ یەکدا و پیاوانی پۆلیسش چاودێریان دەکرد، پێش ئەوەی پۆلیسەکانی بە دوایی دا بچنە نێو گازینۆ کەوە لەناکاو دەمەقاڵێ و شەڕێك لە نێو ان ئەوانەی لە گازینۆکەدا بوون ڕوویدا، هەراو بێنەو بەردەی زۆری لێ کەوتەوە، پۆلیس بۆ زانینی هۆکاری هەراکەو دامرکاندنەوەی چوونە ژوورەوە،بەڵام ئەوە چاوەڕوان نەکراوبوو جەستەیەك خەڵتانی خوێن بووبوو لەسەر زەوی گازینۆ کە کەوتبوو،کەلێ نزیك بوونەوە کابرا تاوانبارەو، لەوە





سەیرتر ئەوە بوو بە هەمان شێوەی پاسەوانەکە مرد بوو، بەهۆی یەکێك لە شوشەشکاوەکان چووبووبەملی دا، بە هەمان شێوەی کابرای پاسەوان لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو، ئەم تاوانبارە هیچ پەیوەندی بەم شەرِەوەنەبوو.

دوایی مردنی کابرای کرێکار ژنەکە دانی نا بەوەدا کەوا لەگەڵ ئەم پیاوەدا پەیوەندی ناشەرعی هەبووە و، پاش ئەوەی پاسەوانەکە بە کرێکارەکەی زانیووە کرێکارەکە بە شووشەیەکی مەی لێ ی داوە و کوشتویەتی، پاشان لەگەڵ کرێکارەکە رێکەوتوون کە چەند چەقۆیەکی لێ بدات بیبەستێتەوە تاوەکو گومان لە هەردوکیان دووربکەوێتەوە و، ئەم رِیوایەتەیان دروست کردووە کەبۆ پۆلیس بیگێرنەوە کەوا نەناسراوە داویانە بەسەریانداو مێردەکەیان کوشتووە، ئەم بەستۆتەوەو برینداریان کردووە، هۆکاری بێ دەنگ بوونی ژنەکە دان نەنانی بە تاوانەکەدا ئەوەبوو لەلایەك دەترسا لەئابرووچوونی بەو پەیوەندیەی هەیبوو، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر دانی بنایە بەتاوانەکەیدا کابرا دەیکوشتەوە لەبەر ئەوەی ئاشکرای کردبوو[1].

---

(١) جريدة (الابناء) ژمارەی(٦٩٨٣)، پاشکۆ، بەدەستکاریەوە



## پەیامی مەرگ

أحمد کوڕی گولون لە پاکی و داوێن پاکی خۆش گوزەرانیدا پەروەردەکرا، لەگەڵ خوێندنی قورئان دەنگی زۆر خۆش بوو، ابن عساکر دەگێڕێتەوە لە هەندێ لە گەورە پیاوانی میسرەوە کەوا: گولون باوکی ڕاستەقینەی نەبوو، بەڵکو لەبەر دینداری و دەنگ خۆشیەکەی بۆ قورئان خوێندن و بەڕێزو ڕێك وپێکی هەر لە منداڵیەوە هەڵیگرتبوویەوە.

ڕۆژێکیان گولون بە کارێکی پێویست دەینێرێت بۆ ( دار الامارة) ەکەی تابۆی بێنێت، أحمد دەچێت و، لەوێ یەکێك لە ئافرەتە پاوانەکانی (جاریەکانی ) گولون دەبینی لەگەڵ خزمەتکارێکدا خەریکی کارێکی خراپ و زینان، ئەحمەد زۆر بە خێرایی پێویستیەکەی گولون ی هەڵگرت و بە پەلە گەڕایەوە بۆلای، هیچ سەبارەت بە ژن و خزمەتکارەکەی نەگێڕایەوە لەوەی بینی بووی، بەڵام ژنەکە وا گومانی دەبرد هەواڵی بە گولون داوە، بۆیە هاتە خزمەتی گولون و سکاڵای لە ئەحمەد کرد و ووتی: ئێستا ئەحمەد هاتە فڵان شوێن پەلاماری دام و داوای خراپەی لێکردم و، گەڕایەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی.

گولون دڵی کرمی کرد لە ئەحمەد و پێ وابوو ژنەکە ڕاست دەکات، بە خێرایی ئەحمەدی بانگ کرد نامەیەکی دایەو مۆری خۆی لێداو ناردیە لای هەندێ لە ئەمیرەکان، سەبارەت بە قسەکانی ژنەکەی هیچی لەگەڵدا باس نەکرد، لە نامەکەدا نوسرابوو ((هەر کاتێك هەڵگری نامە گەیشتە لات دەست بە جێ سەری بپەڕێنەو سەرەکەی بۆم ڕەوانە بکە ))

ئەحمەد بە دڵ سافیەکەی خۆیەوە نامەی هەڵگرتوو، نەیدەزانی چی تێدا نوسراوە، لە کاتی ڕۆیشتنیدا گەیشت بەو جاریەیەو، بانگی کرد.

ئەحمەد ووتی: من سەر قاڵی گەیاندنی ئەو نامەیە بە یەکێك لە ئەمیرەکان. جاریەکە فێڵی بۆ کوڕەی هەژار دانابویەوەو دەیویست لەلای خۆی بەندی بکات و پاشان نامە بنێرێت بۆ گولون تاوەکو قسەی خۆی بسەلمێنێ، لەبەر ئەوەی ئەحمەدی گرت نامەکەی گولون ی پادشای لێ وەرگرت و دای بەو





خزمەتکارەی پێشتر لەگەڵیدا رای بوارد بوو ڕۆیشت بە نامەکەوە بۆ لای ئەمیر کاتێك ئەمیر نامەی کردەوە یەکسەر سەری خزمەتکاری پەڕاندو سەرەکەی ناردەوە بۆ پادشا، بەڵام پادشا سەری سورمابوو لەوەی بۆچی ئەم، ووتی: ئەی کوا ئەحمەد؟ هێنایان بۆ لای و، پێ ووت پێم بڵێ بزانم لە لای من چوویتە دەرەوە چیت بە سەر هات ؟ هەمووی بۆ گێرایەوە.

کاتێك جاریەکە بیستی سەری خزمەتکارەکەی هاتۆتەوە بۆ لای پاشا وای زانی کارەکەی لێ ئاشکرا بووە و، وای زانی پاشا لێکۆلینەوەی لە کارەکەی کردووە، بۆیە بە خێرایی چووە لای پادشاو داوای لێبوردن و لێخۆشبوون کرد و، دانی نا بە هەموو شتێکداکە کردبووی لەگەڵ خزمەتکارەکە و پاکی ئەحمەد ئاشکرا بوو لەو بووختانەی بۆی کرابوو، زیاتر لەلای پادشا بەڕێزتر بوو، وەسیەتی کرد لەدوایی خۆی بیکاتە جێگرەوە[1].

## ژەهر خواردم کرد، ژەهر خواردیان کردم

ئەبو مظفر یحیی ی کوڕی محمد کوڕی هبیرە ی شیبانی دوری عیراقی حەنبەلی وەزیرو پێشەوایەکی دادوەر و دەستە ڕاستی خەلافەت بوو، خاوەنی زۆر کتێب بوو.
زەهەبی دەڵێت: کتێبێکی هەیە لە (الافصاح عن معاني الصحاح) تێیدا شەرحی هەردوو صحیحی بوخاری و موسلیمی کردووە لە دە بەرگ دا، کتێبی (العبادات) داناوە لەسەر مەزهەبی ئیمامی أحمد، هەروەها بە شیعر دەربارەی (مقصور و ممدود) نوسیوە، هەروەها دەربارەی زانستی خۆشنووسی و، پوختەیەکی دەربارەی کتێبەکەی ((اصلاح المنطق)) ی ئیبن سکیت نووسیوە.
لە شەوی سیازدەی جەمادی یەکەمدا و، لە ساڵی ٥٦٠ دا، لەکاتی پارشێودا هەستاو ڕشایەوە، ئیبن ڕشادەی پزیشکیان هێنایە سەری و شتێکی پێدا، دەڵێن: ژەهر خواردی کردو پێ ی مرد.
پاشان دوای شەش مانگ ئەم پزیشکە ژەهر خوارد کراو، لەبەر خۆیەوە دەیووت: ژەهر خواردم کرد و ژەهر خوارد کرامەوە، پاشان مرد.
ئەم زانا پایە دارەی باسمان کرد شوێنەواری ژەهر خوارد کردن لەسەر جەستەو دەم و چاوی دەرکەوت و، تەرمەکەی برا بۆ مزگەوتی (القصر) و خەڵکێکی ئەوەندە زۆر لەگەڵیدا ڕۆیشت پێشتر نەبینرا بوو، کەسانێکی زۆریش بە حەسرەت بوون بۆی فرمێسك و ئەسرینیان هەڵدەوەراند بۆ هەموو ئەو کارە چاکانەی دەیکرد لە چاکە و دادوەری، شاعیرانی ئەو کاتە بە هۆنراوەکانیان لاواندیانەوە[1].

---

(١) ((سیر أعلام النبلاء)).

# بەشی سێ یەم: ( سووخواردن )

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ
﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ
أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾[1].

پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت (صلى الله عليه و سلم):

((الربا سبعون حوبا، اخرها ان ينكح الرجل أمه))[2].

(سوو حەفتا بەشە کۆتا دانەیانەیان ئەوەیە کەسێك دایکی خۆی مارەدەکات )

یەکەم: خودا سوو لە ڕەگەوە هەڵدەکێشێت (سوو سامان بە فیرۆدەدات)

دووەم: جەنگ لەگەڵ خودا بەر پاکردن

سێ یەم: ئەنجامی ڕژدی

---

(١) سورة البقرة: أية ٢٧٨ و ٢٧٩.

(٢) ابن ماجة ريوايەتی كردووە، الالبانی بە (صحيح)ی داناوە.



# خودا سوو لە ڕەگەوە هەڵدەکێشێت
## ( سوو سامان بە فیڕۆ دەدات )

بە هەژاری ژیام، لەنێوان باوکێکی کرێکار و دایکێکی کارەکەر دا، پاشماوەی خۆراکمان دەخواردو، کۆنەی ماڵانم دەپۆشی، کاتێك گەورە بووم گەیشتمە تەمەنی هەرزەکاری دایك‌ە باوکم دەریانکردم، بۆ چی نا! خۆ من بارێکی گرانم بەسەریانەوە.

منیش وازم لێهێنان و ڕووم لە شارێکی تر کرد کەس نەیدەناسیم، ناوەکەی خۆمم گۆڕی، بەڵام ناوی باوکم نەگۆڕی، بوومە کارگوزاری قوتابخانەیەك، هەمیشە لە لایەکی پەنجەرەی پۆلەکان ڕادەوەستام، ئەوەی مامۆستا پێ ی دەووتن گوێم لێ دەگرت، فێری نوسین و خوێندن بووم و، بەشداری تاقی کردنەوەکانی سەرەتایم کردو دەرچووم، پاشان بەردەوام بووم تاوەکو ئامادەیشم بە سەرکەووتوی بڕی، پاشان گەڕامەوە بۆ شارەکەی خۆم، بەڵام دایك و باوکم مردبوون و، کەسم لەبراو خوشکەکانم نەناسیەوە، کارێم دەست کەوت و لەوێوە کۆمەڵە هاوڕێیەکم ناسی هەموو خراپە و کارێکی ئابروو بەرانەیان لێوە فێربووم، بووم بەکەسێکی دەست بڵاو، بەجۆرێك وای لێ کردم قەرز بەسووی زیادەوە وەربگرم بەشێوەیەکی ساڵانە لەکۆتاییدا سووەکەی دووئەوەندەی پارەکەی وەرمگرتبوو لێی دەهات.

لەمیانەی ئەم کارانەدا وام لێ هات خانووەکەی خۆم و هاوسەرە دووگیانەکەمی تێدا دەژیا بە ناچاری بیفرۆشم و قەرزو سووەکانی لێ بدەمەوە، تەنها پارەیەکی کەم نەبێ بۆم مایەوە، کە تەنها بەشی خەرجی دوو مانگی دەکرد.

دوایی بیرکردنەوەیەکی قووڵ بڕیارم دا چیتر قەرز لە سوودەرەکان نەکەم، بەڵو خۆم سوو بدەم بەوانەی خاوەن پێداویستی زۆر زەروورن.

دەستم بەم کارەکرد بەو پارە کەمە و، ڕەهنم وەردەگرت لەبری زەمانی قەرزدانەوەکەدا. تەنها لەماوەی دووساڵ کەمتر دا سامانێکی زۆرم دەست کەوت و، توانیم خانوویەکی گەورەتر بکڕم و ژنێکی نوێم هێنا بازرگانیەکەم فراوانتر کرد و، دوکانێکم وەك سڕافی کردەوە و دواتر وەك داهات سەرچاوەی بژێوی،

بەڵام کاری سەرەکیم قەرزدان بوو بەسوو. بووم بە خاوەن سامانێکی بێ شومار و لە هەژارێکی قەرزارەوە کە قەرزم لە دەوڵەمەندان دەکرد، من قەرزم دەدا و، خودا کوڕ و کچێکی تری پێ دام.ڕۆژێکیان یەکێك لە وانەی مامەڵەی لەگەڵ دەکردین داوایی شمەکێکی لی کرد و بە یەکێك لە بارهەڵگرەکانمدا بۆم نارد، بەڵام ژیان هەروا نابێت خودا بۆسە بۆسەر پێچی کاران دادەنێت، لە ڕێگەدا بارهەڵگرەکە وەرگەرا کوڕەکەم تیاچوو و شمەکانمان لە دەست داو تەنها شوفێرەکە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕزگاری بوو، دایکی کوڕەکەم لە خەم و پەژارەی بۆ سووتانی جەرگەکەی و جوانە مەرگ بوونی ڕۆڵەکەی پاشماوەیەك مرد. دوایی چەند ڕۆژێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا ئاگرێکی زۆر گەورە لە یەکێك لەکۆگاکانم بەربوو نیوەی سامانەکەم تیایدا سووتا لەگەڵ یەکێك لە کوڕەکانم. دوایی ئەم ڕووداوە کچەکەم کەمارە کرابوو تەباغی داگیرساندبوو زەیتەکە لەنێو تاوەکەدا گڕی گرتبوو کچەکەم ئاگری تێ بەربوو بوو، لە کۆتاییدا توشی ئیفلیجی بوو. ڕووداوەکان بە دوایی یەکدا هاتن نەمدەتوانی پێشی بگرم، بەڵام ئێستا دەزانم هەر کەسێك سوو بخوات و ئەو پارانە بەو شێوەیە کۆبکاتەوە دەبێت باجی کارەکەی بدات و،نزای ئەو ستەملێکراوانەی لێ گیرا دەبێت کە ماڵەکەیان لێ زەوت دەکات[1].

خودا هەمیشە لە بۆسە دایە و چاودێری بۆ ئەوانەی ستەمکارن دەکات و، سوو خۆر شەڕی لەگەڵ خودا بەرپاکردووە بۆیە کۆتاییەکەی بە ئازاردەبێت ئەگەر چی ماوەیەکی زۆریشی پێ بچێت.

---

(١) ((من غريب ماسألوني )) بەرگی دووەم، ل ٩٦و٩٧و٩٨



## جەنگ لەگەڵ خودا بەرپاکردن

زۆرینەی خەڵك خەون بە دەوڵەمەند بوون دەبینێت، بۆ هێنانە دی ئەم خەونە چەندەها ڕێگا هەیە مرۆڤ بیگرێتە بەر، کاسبی حەڵاڵ بەو شێوەیەی کە خوداو پێغەمبەرەکەی فەرمان دەکەن مرۆڤ دەگەیەنێت بەو خەونە بەرەکەتی خۆی دەڕژێنی بەسەر دا و خاوەنەکەی پارێزراو دەکەن.
بەڵام زۆر کەس بە دوایی قازانجی زۆر خێرادایە، لەبەر ئەمە ڕێگای شەرعی و ناشەرعی دەگرێتە بەر، گرنگ ئەوەیە سامان کۆ بکاتەوە و، لەپڕێ ببێت بە کوڕێ، ڕێگای تەماح بەر چاوتەنگی و خۆشەویستی دونیا دەست بەسەر هەموو هەستەکانیدا دەگرێت، نابینێ و نابیستێ تەنها پارەو چەکی بانك، تاکە بیر و بیرکردنەوەی کۆکردنەوەی سامانە لە هەر شوێنێکەوە بێت.
خاوەنی ئەم چیرۆکەمان یەکێکە لەوانەی بە دوایی سامان دا هەڵپەیەتی و ڕا دەکات، بەم شێوەیە باسی دەکەین کۆتاییەکەیتی:
فەرمانبەرێکە خودا داهاتیەکی مانگانەی پێ بەخشی بوو، بە زیادەوە بەشی خەرجی مانگانەکەی دەکرد و لێشی دەمایەوە، خودا بەرەکەتی بۆ تێ کردبوو. بەڵام سروشتی مرۆڤ وایە مەگەر تەنها کاتێك خۆڵی بەسەر دا دەکرێت تەماحی دا بمرکێنێتەوەو تێری بکات، ئەو لەمە زیاتری دەویست و ڕێگاکانی حەرام هەمووی دەوریان دابوو، هەموو تەڵەو داو بوو لایەن بانقەکانی سووەوە لەبەر چاویان جوان دەکرد و دەیانڕازاندەوە، لەڕاستیدا کۆمەڵگا بەم کارانە تەندراوە و لە هەموو لایەکەوە دەوریان داوە و مامەڵە بەسوو خواردن و وەرگرتنی دەکەن مەگەر خودا ڕەحمی پێ بکات. لە دڵی خۆیدا ووتی چی لەو خەڵکەکەمترە، با ئەمیش بازرگانی بکات و وەکو خەڵك ببێتە خاوەن پارە لە بانقدا و، بە تەواوەتی ئەم بیرۆکە لەلای گەڵاڵە بوو، کارەکەی زۆر ئاسانە بە پارەی مانگانەکەی بخاتە یەکێك لە بانکەکانی سووەوە و پاشان دەئەوەندەی یان زیاتر وەردەگرێتەوە، بە پێەکانی خۆی خۆی خستە نێو داوەکەوە بە ئاسانی و بێ ماندووبوون بوو بە نێچیریان، بە دڵێکی زۆر خۆش و کراوە وە لە بانقدا هاتە دەرەوە، چونکە ئێستا پارەیەکی لە بانقدا هەیە





و سەرمایەیە تاوەکو بازرگانیەکەی پێ دەست پێ بکات.
یەکێك لە هاوڕێکانی ئەم کارەی بەر گوێ کەوت بە خێرایی چوو بۆ لای و پێ ووت: براکەم من تۆ باش دەناسمء، کابرایەکی چاکەکاری و سوپاس بۆ خودا مانگانەکەت سەرو زیادتە، بۆچی بەلای حەرامدا دەچیت و، خۆت دەخەیتە ژێر باری قەرزەوە ؟! ئازیزەکەم ئەم کارەی تۆ کردووتە حەرامە و سەر ئەنجامەکەی لە دونیا و دوارۆژدا باش نی یە و تیادەچیت، هاوڕێکەی زۆری پێ ووت و ئەم نەیبست، ئامۆژگاریەکانی هیچ سوودێکی نەبوو.
دەستی کرد بەجێ بە جێ کردنی پرۆژەکەی و ئوتۆمبێلی بەکارهاتووی لە ئەڵمانیا کڕی و پاشان بینێرێت بۆ بیروت تاوەکو چاك بکرێتەوەو بیرازێنێتەوە و، پاشان بەهۆی دوو ئوتۆمبێلەی بار هەڵگرەوە ئوتۆمبیل بیگەیەنێتە کوەیت و بیفرۆشێتەوە، بەڵام لەسەر زەوی سعودیە یەکێك لە ئوتۆمبیلە گەورەکان وەرگەراو ئەوەی تریان نەیتوانی ڕایبگرێت و دایەوە بەمەی تردا، هەر لەسەرەتای کارەکەی دا هەموو ئوتۆمبێلەکانی تێك شکان و یەکێکی ساغی تیا نەماو، شوفێرەکانیش بە ویستی خودا ڕزگاریان بوو گەڕانەوە بۆ وولاتەکەی خۆیان.
ئەم هەواڵە گەیشتە بە خاوەنەکەیان، دڵی پڕبوو لە حەسرەت و داخ و هەناسەی سارد، لەلایەکەوە هەموو ماڵ و سامانی تێدا چوو لەنێو بیاباندا و بووبە تۆزو بابردنی، تۆزو بابردنی لەم لایشەوە دەبێت چەند قات بداتەوە بە بانق و، کارەکەی تەنها ماڵ وێرانی لێ دروێنەکرد و، دوایی ئەوەی ژیانێکی خۆشی هەبوو، بوو بە هەژارێکی بێ ئومید و کۆمەڵێك قەرز کەوتە سەر ملی و بوو بە قەرزێکی بێ بڕانەوەو رزگار بوونی نەبوو لێ ی، ئەمە بارودۆخی دونیا بوو خوداش زانایە بەو دنیاکەی تری[1].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾[2].

---

(١) ئەم چیرۆکە بەرێز (سالم بن سلیمان الخشان) گێڕایەوە، کە کەسی نزیکی خاوەن چیرۆکەکەیە.
(٢) سورة البقرة: أیە (٢٧٨و ٢٧٩)



## ئەنجامی ڕژدی

پیاوێکی پیر دراوسێمان بوو، نە هاوسەر نە خزم وکەس و نە ناسیاوی نەبوو، پیاوێکی زۆر ڕژدو بەر چاو تەنگ بوو، خەمی سەرەتاو کۆتای بەس کۆکردنەوە سامان و هەڵگرتنی بوو، دوکانی دروست کردنی نەعلی هەبوو بەڵام ڕۆژێکیان دوکانی نەکردەوە.

منیش دوایی چەند ڕۆژێك و لەدوایی نوێژی عیشا چووم بۆ هەواڵ پرسینی و، پاڵم بە دەرگاکەیەوە نا هاوارم دەکرد ئەی فلان....٠

ڕاپەری بە هەموو دەنگی خۆی وەڵامەی دایەوە: چیت دەوێ ؟

ووتم: هاتووم بۆ هەواڵ پرسینت چەند ڕۆژێکە دوکانەکەت نەکردۆتەوە.

دەری کردم زۆریش هاواری کرد بە سەرم دا و، وای دەرخست پێویستی بە کەس نی یە، بەڵام ووتم تووشی شتێك بوویێت، بۆچی نەچمەوە بۆ لای بزانم چ باسە ؟ ئەمجارمیان بەدزیەوە چوومە ژوورەوە هەستی پێ نەکردم، دەڕوانم کۆمەڵێك لیرەی زۆری لەبەردەمی خۆیدا داناوە و ئەوەند بریقەدار بوو شەڕی لەگەڵ ڕووناکی گڵۆپەکاندا دەکرد، لەولایشەوە قاپێکی دانابوو پڕ لە ڕۆنی زەیت، پاشان لەگەڵ لیرەکاندا دەئاخافت و پێ دەوتن: خۆشەویستەکانم، چاکترین شتەکانی ژیانم خۆ من ژیانی خۆم لە پێناوی ئێوەدا تەواو کردووە، چۆن جێتان دەهێڵم ؟ پێویستە لە گەڵ خۆمدا بتان بەمە گۆڕەوە، پێکەوە بە خاك بسپێردرێن، پاشان دانە دانە لیرەکانی دەکردە بە زەیتەکەدا و قوتی دەدا، دوایی هەر یەکێکیان دەکۆکی هەندێك لە ئازاری هیدەناوی و پاشان بەردەوام دەبوویەوە، منیش لەکەلێنیکەوە لێمی دەڕوانی.

بە خۆمم ووت: ئەی ڕژدی بەخیل کەسی دەستی بەو سامانەی تۆ ناگات خۆم نەبێت، بە ئەسپایی لە ماڵکەی هاتمە دەرەوە و دەرگاکەم لە دوایی خۆمدا داخست و ڕۆیشتم بەو هیوایەی کەس بەم کارەی نەزانێت و بێت بە بەشی خۆم.

دوایی سێ ڕۆژ چوومەوە سەری و سەیرم کرد مردووەو لە جێگاکەیدا ڕەق بووە، هەواڵم بە خەڵکدا و شووشتیان و هەڵیانگرت بۆ سەر قەبران، بەڵام سەریان سوڕما بوو لە لاوازی جەستەی کابرا بەڵام بۆ ئەوەندە قورسە، ئەوان نەیاندەزانی چەند





لیرەی قوت داوەو لە سکیدایە.

لە دوایی بە خاك سپاردنی ئاماژەو نیشانەیەکم لەسەر گۆڕەکەی دا تاوەکو دواتر بیدۆزمەوە، لە نیو شەودا بە پاچێکەوە چووم و دەستم کرد بە هەڵدانەوە گۆڕەکەی و خێرا خێرا تەماشای دەوروبەرم دەکرد نەوەك یەکێك بمبینێت، پاشان گەیشتمە بەردەکەی سەر دەم وچاوی و، بە چەقۆ کفنەکەیم دڕاند و، پاشان سکیم هەڵدڕی، لیرەکان لەبەر ڕۆشنایی مانگ دا وەك مەرجان دەبریسکانەوە، دەستم برد هەڵیبگرم بەڵام وەك پشکۆ گەرم بوو، لە تاو ئازارلیرەم لە بیر نەما فرێم دا و دەستم کرد بە هاوارکردن، گۆڕەکەم بە بەرد و پاشان بە خۆل داپۆشیەوەو، بەڕاکردن هەڵدەهاتم و هاوارم دەکرد و، بەهەر حاڵ خۆم کرد بە ماڵ و کردم بە نێو ئاوی سارددا بەشکم ئەو گەرمەیەی کەم بێتەوە، ساڵانێکی زۆرە ماوە ماوە ئەم پێوەدانە ئازارەکەی سەر هەڵدەداتەوە[1].

﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾﴾[2].

---

(١) ئەم چیرۆکە یەکێك لە ناو دارە بەرێزەکان گێراویانەتەوە، لە زاری ئەو کەسەی بۆی گێراوەتەوە ڕووداوەکان لە سعودیاوە ڕوویان دابوو.

(٢) سورة التوبة: آية ٣٤ و ٣٥.

## بەشی چوارەم: یاخی بوون لە دایک وباوک

خوای گەورە دەفەرمویت:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾[1].

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزامەندی خودای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەر (صلی اللە علیە و سلم) فەرموویەتی:

(( بابان معجلان عقوبتهما فی الدنیا البغی والعقوق))[2].

( دوو مەسەلە هەن سزاکەیان خێراترە لە گوناهەکانی تر و لە دونیادا دێتەدی ئەویش: زۆرداری لەگەڵ داوێن پیسی و یاخی بوون لە دایك وباوك )

یەکەم: دوو تاوانەکەی سزاکەیان خێرا دێتەوەڕێ

دووەم: وەك خۆی.

سێ یەم: دونیا و دواڕۆژی دۆراند.

چوارەم: نزاکەی (ئەبو منازل)

پێنجەم: سەرئەنجامی نچیرەی کچی ساکرون.

---

(١) سورة الاسراء: آية ٢٣.

(٢) حاکم لە مستدرك ریوایەتی کردووە و، ئەلبانی بە صحیح دایناوە.





## دوو تاوانەکەی سزاکەیان خێرا دێتەوە ڕێ

ئەم چیرۆکە ئەوپەڕی دڵڕەقی نەوەکان و یاخی بوونیان دەردەخات و، بۆیە وا پێویست دەکات پێش ڕۆژی دوایی لەم ددونیایەدا سزاکەی وەربگرێت.
باوکەی بەستەزمان بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر و ئارەق ڕشتن سامانەکەی کۆکردبوویەوە و بازرگانی دەکرد، منداڵی نارده زانکۆ بەو هیوایەی وەك خۆی بەژیانەوە ماندوو و شەکەت نەبێت و بحەسێتەوە، بەڵام دەسکە گوڵی کوڕەکەی ئەوە بوو دەیویست کچێکی هاوڕێ بکاتە هاوسەری زۆری لە باوکی دەکرد ڕازی بێت و بۆی بخوازێت، بەڵام باوکەی بە ئەزموون کچەی دەناسی چەند سیفاتی خراپی هەیە و دەترسا ئەو هاوسەر گیریە سەرنەکەوتوویێت و زیانی هەبێت.
بەڵام دوایی ئەوەی کوڕەکەی زۆر سوور بوو لەسەر بڕیارەکەی و زۆر ی لێ کرد، ناچار ملی دابۆ داواکەی، پاشان داوای لەباوکی کرد خانوویەکی بۆ بکڕێت، بەڵام باوکەی بەستەزمان حەزی بە دوورکەوتنەوەی تاقانەکەی نەدەکرد لەبەر ئەوەی پێشنیاری کرد خانوویەکی زۆر گەورە بکڕێت ودوو نهۆم بێت، دایك و باوك لە خوارەوە، بوك وزاوای تازە لەسەرەوە بن، بە پێشنیارەکە رازی بوون، هەموویان پێکەوە چوونە ناو خانووی نوێ، ئەوەندەی نەبرد پیرە دایك کۆچی دوایی کرد و پیرە پیاو بەبێ ناز لە دوای بە جێما، لە حەفتاکانی تەمەنیدا بوو کەس نەبوو خزمەتی بکات و کارەکانی و پێویستیەکانی بۆ جێ بە جێ بکات، ئەگەر جارو بار پاشماوەی خۆراکەکانی خۆیء ژنەکەی فڕێ بدایەتە بەر دەم باوکی،وەکو چۆن بۆ ئاژەڵی فڕێ بدات، ماڵی پیرە باوك پڕبوو لە زبڵ و پیسی،بەبێئەوەی کەس هەبێت بۆی پاك بکاتەوە،دەردو نەخۆشی لەدەوری کۆبوونەوەو لەکوڕەکەی دەپاڕایەوە بیباتە لای پزیشکێك بەڵام کوڕی یاخی وەڵامی هەر نەخێر بوو، لەسەرووی ئەوە شەوە هەمیشە ژنەکەی هانی دەدا کەوا پیرە باوك دەربکات و بە ئاسانی دەست بەسەر هەموو سامانەکانی دا بگرێت.
بەوەوە نەوەستا خزمەتی نەکات، بەڵکو لەشەوێکی زۆر سارد دا هەڵی کوتایە سەر پیرە پیاو، نوزەی لێ برابوو مەگەر گوێ بیستی کۆکەکانی ببوویتایە،



تاجەستە لاوازەکەی سوتاندبوو خەریك بوو کەرت کەرتی دەکرد، بۆنی چڵکی لە جلەکانی رۆژە ڕێیەك دەهات چونکە لەمانگ زیاتر بوو نەگۆڕدرابوو، ئەم کوڕە یاخیە بەم کارە ناشرینانەیەوە نەوەستا بەڵکو لەدوای ئەوەی هەرچی جنێو قسەی ناشیرینء سوکایەتیە بە باوکی کرد، لە بەتانیەکی لوولداو بردی فڕێیدا. کاتێك خەڵك لە نوێژی بەیانی هاتنە دەرەوە، چاویان بە بەتانیەك کەوت جەستەیەکی لە نێو دایە، تەنها لە نسکە پەیکەر دەچێت و، لە سەرما لەبەر بارانەکە بەستوویەتی، کاتێك کە وویستیان فریای بکەونء بەتانیەکەیان هەڵدایەوە خوێن لە لوتی هاتبوو، لەسەر سمێڵی بەستبووی و تازەی کار لە کارترازابوو، هەناسەی لێ بڕابوو.

دوای ئەوەی هەواڵ درا بە پۆلیس و لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە کرا، تاوان بار بە کەلەپچە کراوی برایە شوێنی لێکۆڵینەوە. دواتر دادگا حکومی بیست ساڵ بەسەر بەند کردنی بەسەر دا بڕی، لەو کاتەدا ژنەکەی دوو گیان بوو لە مانگی یەکەمی دا.

دوای ئەوەی ماوەی زیندانی کردنەکەی بەسەر برد، ژنەکەی وویستی کوڕەکەی بۆ بکاتە دیارێکی لە ناوکاو کەوا بیست ساڵی تەمەنە و هێشتا باوکە چاوی پێ نەکەوتووە، لەدەرەوەی زیندانەکە کوڕەکە بەپەرۆشێکی زۆرەوە چاوەڕوانی باوکی دەکرد،لە کاتی هاتنە دەرەوە دایکە ئاماژەی بە کوڕەکەی کرد وەك هەواڵێکی خۆش دێتە بەر دەمی باوکی بە ئوتۆمبێلەکەیەوە، بەڵام کوڕەکەی لە خۆشیاندا لەبری پێ لە ئیستۆپ بنێ، پێی لە بەنزین ناو، ئوتۆمبێل لەدەستی فڕی و لەباوکی داو، کاتێك کوڕەکە بە پەلەو هەڵە داوان خۆی گەیاندە باوکی، تازە کارلەکار ترازابوو باوکی بەدەمدا کەوتبوو خوێن بە لووتی داهاتبووە خوارەوەو پڕدەمی کردبوو.

هەمانی مردنی باپیرەی لەسەر دەستی باوکی بوو، کەدەریهێنایەوە لەژێر تایەکانی تەنها یەك ووشەشی بۆ نەووترا و بەسزای خۆی گەیشت[1].

---

(١) لەکتێبی ( عدالة السماء )ەوە وەرگێراوە.



## وەك خـۆی

زانایان دەگێرنەوە پیاوێك پیرە باوكێكی هەبوو، تەواو لە خزمەت كردنی بێزار بووبوو، تاقەتی بۆڵەو جێ بەجێ كردنی پێویستیەكانی نەمابوو، ڕۆژێكیان هات بە مێشكی دا بیبات بۆ بیابان و سەری ببڕێت و لە دەستی رزگاری بێت و ڕۆیشت...! كاتێك گەیشت لەلای بەردێك داینا.

پیرە پیاو ووتی ڕۆڵە، بە تەمای چیم لێ بكەیت؟

كوڕەكەی ووتی: ئەمەوێت سەرت ببرم.

پیرە پیاو ووتی: ئەگەر هەر سووریت لەسەر سەربرینم ئەوا لەلای ئەو بەردەی تر سەرم ببڕە، چونكە منیس پێش تۆ كوڕێكی یاخی بووم بەرامبەر دایك و باوكم و، لەلای ئەو بەردەدا باوكم سەر بڕی، تۆیش ڕێك وەك خۆی بیكەرەوە پاشتریش تۆ والێ دەكەنەوە....![1].

---

(١) لە كتێبی ((الجزاء العمل))، بەرگی دووەم



## دنیاو دوارۆژی دۆڕاند

عەلی کوڕی یەحی منجم دەڵێت: ڕۆژێکیان لەلای خەلیفەی عەبباسی (مونتەسر باللە) دانیشتبووین ڕای دەبواردو لەکەیف دابوو، پاشا چاوی کەوتە سەر ڕایەخێك ئەسپ سوارێکی تێدا کێشرابوو و تاجێکی بە سەرەوە بوو بەزمانی فارسی شتێکی لەدەور نوسرابوو، داوای کرد بۆی بخوێننەوە.
پیاوێکیان نارد بە دوایەوەرگێردا و هێنایان،لێ ووردبوویەوە پاشان کەوتە نێو بێ دەنگی و خەیاڵەوە و پاشان ووتی (مانایی نی یە)
بەڵام مونتەسر وازی لێ نەهێناو زۆر داوای لێ کرد کە پێ بڵێ چی یە.
لە کۆتاییدا ووتی:
(من شیرویە کورشی کیسری کوڕی هورمزم باوکی خۆم کوشت تاوەکو زوو بچمە سەر تەختی پادشایی بەڵام تەنها شەش مانگ توانیم لەو شوێنە دابم).
دەڵێن: ڕەنگی مونتەسر تێك چوو گۆڕاو هەستایەوە سەر پێ.
شەش مانگ پێ نەچوو نەخۆش کەوت، چونکە دەنگۆی ئەوە بڵاو بوو دەستی هەبوو لەکوشتنی باوکیدا و بەسەریەوەنەچوو.
هەروەها لێ دەگێرنەوەکەوا لە نەخۆشیەکەیدا ووتوویەتی:
(دایکە ماڵ وێران خۆم، دنیاو دوارۆژیشم لەدەست چوو، پەلەم لەباوکم کرد ئەوا پەلە لە خۆیشم کرا).
زەهەبی دەڵێت: تورکەکان پیلانیان بۆ داڕێژراوە و لەکاتی نەخۆشیدا سی ی هەزار دیناریان داوە بە پزیشکەکەی ابن گیفور و ئەویش بەدەسیسەی ئەوان بە پەڕێکی ژەهراوی بریندای کردووە و پێ ی مردووە.
هەر زەهەبی دەڵێت: گیفور دواتر تووشی لەبیر چوونەوەو نەخۆشی هاتووە، بەو پەڕە بریندای کردووەو پێ مردووە[1].

---

(١) لەکتێبی ((سیر اعلام النبلاء)بەرگی ١٢، ل ٤٣و٤٥.





## نزاکەی ئەبو منازل

لە ئەبی الرحمن ی طائیەوە دەگێرنەوە: پیاوێك لە بەنی فەهد پیر بوو بێ هێز و بێ توانا کەوت بە ئەبو مەنازل بانگیان دەکردو، چونکە کوڕە گەورەکەی پێ یان دەووت مەنازل، کۆمەڵە منداڵێکی تریشی هەبوو، ئەگەر شتێکی پەیدا بکردایە دەیدایە مناڵەکانی، بەڵام پیرەپیاو بێ دەسەڵات بووبوو کاتێك خێرو پارەی هەژارانەی وەردەگرت و منازل لە چنگی دەردەهێنا، خۆ پەرستانە پارەی ئەو مناڵانەی داگیردەکرد، کاتی وەرگرتنی پارەکەی دەهات مەنازل باوکی دەدایە پێش خۆی و دایدەناو تا ناوەکەی دەخوێندرایەوە، پاشان مەنازل هەستاو ووتی ئەمەیە پارەکەیم پێبدەن.

پیرە پیاو هەستاوە ووتی: تکایە بیدەن بە دەستی خۆمەوە.

دایانە دەستی خۆی و، هەڵبگرت و دەستی گرت بەکوڕەکەیەوە تاوەکو بڕوات.

مەنازل ووتی: بیهێنە با بۆت هەڵبگرم.

پیرە پیاو ووتی: وازی لێ بێنە.

ئەویش لەگەڵی ڕۆیشت تاکو دەرفەتی بۆ ڕەخسا و دەستی باوکی باداو پارەکەی لێ دەرهێنا و بردی، پیرە پیاویش بە دەستی خاڵی گەڕایەوە بۆ لای منداڵە برسیەکانی. ژن و منداڵەکانی ووتیان. چیت لێ کرد ؟!

ووتی: مەنازل هەمووی برد و، بەدەم شیعرەوە دەستی کرد بەنزا کردنی لێ ی.

جزت رحم بيني وبين منازل جزاء كما يستنجز الدين طالبه

وربيته حتى اذا ماهو استوى كبيرا و ساوى عامل الرمع غاربه

تظلمني مالي كذا و لوي يدي لوي يده الله الذي هو غاليه

دەستی مەنازل بەنزاکەی باوکی گێڕو گرمۆڵە بوو[1].

---

(١) لە کتێبی (مجابو الدعوة) ی ئیبن ئەبی دنیا.



## سەرئەنجامی نضیرەی کچی ساطرون

ساطرون (ضیزن ی کوڕی معاویە)یە، خاوەن قەڵای (خضر). کە دەکەوێتە سەر لێواری ڕووباری فورات و شارێکی زۆر گەورە لە نێوانیدا بوو، سابوور دووساڵ گەمارۆی ئەم قەڵایەی دا بەڵام بێ سوود بوو، ڕۆژێکیان نچیرەی کچی ساگرون سەرو کاری گفتوگۆکەی کرد، کاتێك چاوی کەوت بە سابور جلێکی چوان و ڕازاوەی لەبەر دابوو، تاجێکی ئاڵتونی لەسەر دابووبە یاقوت و مرواری ڕازابویەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا سابور کەسێکی زۆر قۆزو جوان بوو، دەستی کرد بە پرسیارکردن لی: ئایا ئەگەر دەرگای(خضر)ت بۆ بکەمەوە دەمخوازیت؟

ووتی:بەڵی.

کە ئێوارە داهات ساگرون زۆری مەی خواردەوە تا بە تەواوەتی سەر خۆشی بوو، ئەمە پیشەی هەموو شەوێکی بوو، کچەکەی کەدڵنیا بوو باوکی خەوتووە کلیلەکانی دەرگای خضری لە ژێر سەر باوکی دەرهێنا و بە خزمەتکارێکدا ناردی بۆیان و سابور هاتە نێو قەڵاکەوە.

ساطرون کوشت و دەستیگرت بەسەر هەموو شتێکی شارەکەداو کاولی کرد بەسەریەکدا، لەسەرپەیمانەکەی خۆی کچە ی لەگەڵ خۆیدا برد و خواستی. شەوێکیان لەسەر جێگاکەی بوو، هەر ئەمدیوو ئەو دیوی دەکرد خەوی لێ نەدەکەوت، لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاند، فەرمانی کرد مۆمیان بۆ هێنا و سەر جێگا کە گەڕا لقە دڕکێکی لەسەر بوو!

سابور پێ ی ووت: ئەمە بوو خەوی لێ زڕاندبووی؟!

ووتی:بەڵی.

پێ ووت: باوکت چی بۆ دەکردیت و چۆن بەخێوی دەکردیت؟

ووتی باوکم جێگای نەرمی بۆ ئامادەکرد بووم لە جوانترین قوماشی و نەرمتر ینی و جل و بەرگی ئاوریشمی بۆ دەکردم و مەی پێ دەدام.





سابوور ووتی: کەواتە ئەو پاداشتە شایسە بە باوکت بوو کە پێت کرد؟! تۆ زیاتر بۆ ئەو سزایە نزیکتر و شایەنتری.

پەلکە و کەزی یەکانی بەست بە دوایی ئەسپەوە لێ ی خوڕین و بەخێرایی ڕایکێشن هەتا کوشتیان، هەر چۆن بووە هۆی کوشتنی باوکی[1].

بەڕاستی پاداشتێکی پڕ بە پیستی وەرگرتەوە.

---

(١) لە کتێبی ( الجزاء من جنس العمل)، بەرگی دووەم.

# بەشی پێنجەم: ستەم

لە عبداللە ی کوڕی عومەری کوڕی خەتتابەوە ڕەزای خودا لە هەردووکیان - دەفەرموێت: پێغەمبەر (صلی اللە علیه و سلم) فەرموویەتی:

((اتقوا دعوة المظلوم فانها تصعد الى السماء كأنها شرارة ))[1].

واتە: (( خۆتان بپارێزن لە نزای ستەملێکراو چونکە وەك تیشکی ئاگر بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان ))

أما والله ان الظلم لؤم
وماذال المسيء هو المظلوم
الى ديان يوم الدين نمضي
وعند الله نجتمع الخصوم
ستعلم في الحساب اذا التقينا
وغدا عند الاله من الملوم[2].

یەکەم: نیشانەی کۆتایی

دووەم: زریکەی و ویژدان

سێ یەم: ئاخ و حەسرەت

چوارەم: ئەمە نزای ستەملێکراو.

---

(۱) حاکم لە (مستدرك) داهێناویەتی و، الالبانی بە صحیح داینەوە.

(۲) هۆنراوەی (ئەبو عەتا هەیە) یە





## نیشانەی کۆتایی

لەگەڵ هاوسەرەکەم دا ژیانی خۆش گوزەرانیمان هەبوو، خاوەنی کوڕو کچێك بووین، چونکە هەر لە سەرەتاوە لەسەر هەبوونی لێ ڕاهاتبووم هەمیشە منداڵەکانم بە خزمەتکارو بە خێوکەری زۆر بەخێوکرد، بەڵام هیچ خزمەتکاریان ڕاهێنەر لە دوومانگ زیاتر نەیدەتوانی لە لامان بمینێتەوە، هەر زوو ڕای دەرکرد لە توورەیی و دڵ ڕەقی مێردەکەم، سروشتێکی دوژمنکارانەو خۆ پەرستانەی هەبوو، جۆرەها سزای هەبوو بۆ ئەوانەی لەماڵەکەماندا کاریان دەکرد، نایشارمەوە هەندێ جار منیش بەشداری تاوانەکانی بووم.

ڕۆژگارمان تێپەڕاند هەتا کچەکەم تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵان و کوڕەکەیشمان گەیشتە قۆناغی ئامادەیی، لەو کاتەدا هیچ خزمەتکار نەمابوو لە ماڵەکەدا، یەکێك لە جووتیارە گوندنشینەکان کەناسیاری مێردەکەم بوو هات و کچێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو نزیکەی حەوت ساڵان دەبوو، زۆر بە فیزو خۆ بەگەورە زانینەوە پێشوازی لە کابرا کرد.

جووتیارە سادەو هەژارەکە ووتی: ئەم کچەم هێناوە لەماڵتاندا کاربکات مانگانە بەرانبەر بیست جونەیە، ئێمەش وەرمانگرت.

کچۆڵەی بەستەزمان چاو بەگریانەوە توند دزداشەکەی باوکی گرتبوو، کچەکەی ئەوەندە بەهەناسە ساردیەوە دەگریا، باوکی خۆی پێ نەگیراو بەچاوی فرمێسکەوە ڕۆیشت.

منداڵە هەژارەکە دەستی کرد بە ژیانە نوێ یەکەی، بەیانی زوو زوو لە خەو هەڵدەستا و یارمەتی دەدام لە سازکردنی خواردن بۆ منداڵەکانم و، پاشان جانتاکانی بۆ هەڵدەگرتن تاسەر شەقامەکەو دەوەستا تاوەکو پاسەکانیان دەهات بۆی سەر دەخستن، دوایی ئەوە دەگەڕایەوە و بە نانەسکی نانی بەیانی بخوات زۆر جار تەنها لۆبیاکەی بەڕووتی دەخوارد بەبێ کەرێ و، نانێکمان پێ دەدا خەریك بوو کە ڕووی هەڵدەهێنا، پاشان کارەکانی تری ئەم بێ چارەیە دەستی



پێ دەکرد لە پاکردنەوەو سڕینەوەو کڕینی سەوزەو میوە و، دواتر هەتا نیوەی شەو هەر فریای وەڵام دانەوەمان دەکەوت و هەریەکێك بۆ شتێك بانگی دەکرد، پاشان وەکو مردوو دەکەوتە سەر زەوی و دەنوست، کاتێ هەڵەیان لەبیرچوونێك یاخود دواخستنێك ڕووی بدایە، هاوسەرەکەم جامی قین و تووڕەیی خۆی دەکرد بەسەریدا و دڵڕەقانە لێی دەدا، لەگەڵ ئەم هەموو ستەمەدا دانی بە خۆیدا دەگرت و ئارامی دەگرت لەو پەڕی دەست پاکی و پاك و خاوێنی و دڵسۆزی دابوو بۆ کارەکانی، بەبچوکترین شت دڵخۆش دەبوو.

ئەگەرچی نایشارمەوە منیش هاوبەشی هاوسەرەکەم بووم لەدڵ ڕەقی و ئازاردانی خزمەتکارەکاندا، بەڵام ئەوەندە دڵ ڕەق بوو بەرانبەر هەندێ جار دڵم بۆی ی دەسووتا، چونکە زۆر بێ دەنگ و باش بوو، زۆر بەخۆیدا شکاوە بوویەوە و داوام لێ ی کرد کە لێی نەدات، بەڵام دەیووت: نەخێر ئەم، ((چینە)) لە خەڵك بەم شێوەیە نەبێ مامەڵەی تر یان چاك تر ناکرێت لەگەڵیاندا.

ژیانی ئەم منداڵە هەژارە پڕئازارو ناخۆشی و تاڵی بوو، بەڵام بەبێ دەنگی و ئارام گرتن شانی دابویە بەری، تەنانەت چەژنانیش بەشی ئەم هەژارە پاککرنەوەی ماڵ و شوشتن بوو بەبێ ئەوەی بۆی بجولێ، لەلایەکی ترەوە منداڵەکانی ئێمە بەخۆشیەوە خۆیان دەڕازاندەوە و دەچوونە دەرەوە.

باوکی کچە تەنها چەند جارێك نەبێت کە بۆ وەرگرتنی مانگانە کە دەهات ئیتر نەماندیتەوە، دواتر چەند کەسی دەنارد بۆ وەرگرتنی مانگانەکە، ئەم بەستەزمانە دایك و خوشك و براکانی لەو ساڵانەی لای ئێمە کاری کرد تەنیا سێ جار چاوی پیان کەوت، جاری یەکەم کاتێك برا گەورەکەی مردو بۆ پرسە چوویەوە، جاری دووەم پەتایەکی گرت لەترسی ئەوەی نەوەك بگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکانمان ناردمانەوە و دوورمان خستنەوە، کۆتاجاریش کاتی باوکی مرد.

ئێستا هەموو جارێ گریانم دێت کەبیر لەو سزا توندوتیژانە دەکەمەوە کە بەرانبەر هەڵەیەك کە کردبێتی بەرانبەری کردوومانە، هاوسەرەکەم کارەبای لێ دەدا چەندەها جار لە شەوە ساردەکانی زستان دا بێ بەشمان کردووە لەژەمی ئێوارە و تا بەیانی لە برساندا نەخەووتووە، بیرم نایەت لەو هەموو ساڵە لەلامان ژیا شەوێك بەبێ ئەسرین و فرمێسك هەڵوەراندن خەو لە چاوەکانی چووبێت لەوانەیە بپرسن بۆچی ئەو هەموو ستمەی قەبووڵ کرد و ڕای نەکرد و خۆی





لەم دۆزەخە ڕزگار بکات؟
بەڵام هەوڵی دا کاتێك نزیك بوویەوە لە تەمەنی هەرزەکاری و گەورەبوو، ڕۆژێك چووە دەرەوە بۆ کڕینی سەوزەوات بەڵام ئیتر نەگەڕایەوە، دوایی ئەوەی هاوسەرەکەم لێکۆڵینەوەی کرد و لەدەرگا وانەکەوەی بیست کەوا لەگەڵ کوڕێکدا بەیەك ئاشنا بوون وزۆر جار لەسەر ئەم شەقامە پێکەوە قسەیان دەکرد لەلای ئەم گۆشت فرۆشەدا، لەوانە بوو لەگەڵیدا ڕێك کەوتبێت ڕزگاری بکات لەم زیندانە و هاوسەرگیری لەگەڵیدا بکات.
بەڵام هاوسەرەکەم بە دەسەڵات بوو، هەفتەیەکی نەخایاند توانی بیدۆزێتەوەو لەو شوێنەی خۆی شاردبویەوە هێنایەوە، لەکاتی هاتنەوەیدا بە هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجەو سزا پێشوازیمان لێکرد، هاوسەرەکەم کارەبا لێ دەداو، کورەکەم بەلەقەو شەق کەوتە گیانی و زۆر بێ بەزەییانە لێ یاندا، بەڵام کچەکەم زۆر خەمبار بوو، زۆر دڵی بە کچە خزمەتکارە بێ دەسەلاتە دەسووتا..
کیژۆڵەی هەژار جارێکی دی کەوتەوە نێو دۆزەخ، مل کەچ بوو بۆ ئەو هەموو کارەی پێ دەکرا و هەمیشە توڕەیی و لێدان ئامادە بوون بۆی، ئێمە دەگەڕاین لە پشووەکاندا دەچووینە دەرەوە پاشماوەی خۆراکمان بۆ ماوەی هەفتەك بۆ جێدەهێلا، پاشان وورده وورده هەستمان کرد کوپ و قاپەکان لەدەستی دەکەوتنە خوارەوەو زۆر هەڵدەکەوت لە کاتی ڕۆیشتندا، نیشانی پزیشکماندا ووتی: ئەوەندە چاوەکانی کز بوون تەنانەت بەباشی بەر پێیەکانی خۆی نابینێ واتە بووە بە نیمچە نابینا، لەگەڵ ئەمەشدا هیچ سۆزمان بۆی نەجوڵا بەڵکو زیاتر لەجاران هاوسەرەکەم لێ دەداو منیش هەموو کارەکانی ناو ماڵم پێدەکرد و دەمنارد بۆ کڕینی سەوزەو میوەی ڕۆژانە، هاوار بە حاڵی ئەگەر سەوزەو میوەی نوێ ی نەهێنایە، ئیتر ژنی دەرگا وانەکە دڵی پێ دەسووتا و بۆی هەڵدەبژارد وتا لە جنێو و قسەو لێدانەکانی ئێمە ڕزگاری بکات.
ئەم بارودۆخەی ماوەیەکی زۆری خایەند و، پاشان ڕۆژێك چووە دەرەوەی ماڵ و ئیتر نەگەڕایەوە بەڵام دوایی ئەوەی خەریك بوو بە تەواوەتی سۆمای چاوەکانی لە دەست دابوو، جارێکی تر نەگەڕایەوە ئێمەش بە دوای دا نەچووینەوە تازە بە کەڵکمان نەمابوو
ساڵان تێپەڕین و هاوسەرەکەم خانەنشین کراو پلەو پایەی دەسەڵاتەکەی



نەماو، کوڕەکەمان زانکۆی تەواو کرد چووە سەر کارەکەیء ژنی هێنا، پاشان شادمانیەکەمان زیاتر بوو کەزانیمان ژنەکەی دووگیانە، بەڵام دوایی لە دایك بوونی تەماشامان کرد کوڕەو هیچ نابینێ، هەواڵێکی کتوپرو دڵتەزێن بوو، شادی و خۆشی گۆڕین بە پەژارەو خەفەت، زۆر پزیشك و پیسپۆرمان پێکرد بەڵام بێ سوود بوو. کوڕەکەم و بووکەکەم ناچاربوون ڕازی بوون بەم واقعەو نەوەکەمانیان کردە دایەنگایەکی تایبەت بە نابیناکان، بووکەکەمان بڕیاری دا لەترسی ئەوەی نەوەك جارێکی تر ئەم بەڵایە دووبارە بێتەوە ئیتر دووکیان نەبێتەوە.

بەڵام پزیشکەکان دڵنیایان کردەوە و هانیان دا کەوا هیچ مەترسیەکی لەسەر نی یە، ئێمەش هاندەری بووین و پاشان دووگیان بۆوەو کچێکی جوانیان بوو، پزیشك مژدەی پێداین کەوا چاوەکانی دەبینێ و هیچ گرفتێکی نی یە، چەندەبارە پێ دڵشاد بووین، بەڵام پاش حەوت مانگ تێبنیمان دەکرد تەنها تەماشای یەك شوێن دەکات، برمانە لای پیسپۆری چاو، ڕاستیەکی دڵتەزێن و جەرگ بڕمان بۆ ئاشکرابوو لەوەی تر خراپتر، ئەویش کەوا کچەکەمان نابینێ تەنها بەقەد بریسکەی ڕووناکیەك دەبینێ و ئەگەری ئەوەی هەیە بەتەواوەتی چاوەکانی لەدەست بدات، هاوسەرەکەم لەتاوا تووشی نەخۆشی دەروونی بوو کەوا ڕقی لە هەموو شتێك دەبوویەوە و ژیانی لێ تاڵ بوو، پزیشکەکان وایان پێ باش بوو ببرێتە نەخۆشخانەی دەروونی تاوەکو چارەسەری نەخۆشی دڵتەنگی بۆ بکرێت. دوایی ئەم هەموو نەهامەتیە دڵم زۆر بەپەلە لێدەدا ئەو کچەهەژارە دڵشکاوە کەوتەوە بیر، کە کەلە دۆزەخەکەی ئێمە ڕای کرد دوایی بەسەربردنی دەساڵ لەئەشکەنجە و سزاو کارەبا لێدان و لێدان و ڕیسواکردن و بێ بەشکردنی لە مافەکانی، ئەوەندەی تر تۆقیم لەوەی کە ئەمانەی بەسەرمان دا هات تۆڵەی خودا و لە ئاسمانەوەیە لەسەر ئەوەی بەرانبەر ئەو کیژۆڵەبەستەزمانە بێ کەسەدا کردمان؟

شێوەی ئەم کچە هەژارە هەتیوە لەبەر چاوم لانەدەچوو، کە چارەسەرکەیمان پشتگوێ خست و بوینە هۆکاری نابینابوونی بوو بووە تارماییەك و لەتەنیایی دا بەدوامەوە بوو، پاشان بیرم کردەوە و ئومێدم پەیدا کرد کە بچم بیدۆزمەوەو ئەو خراپانەی کردمان بیسرمەوە بەکاری چاکە.





دوایی ئەوەی زۆر بەدواییدا گەڕام و پرسیاریم کرد تەماشام کرد لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا خزمەت دەکات، چووم بۆ لای و لەگەڵ خۆمدا هێنا تا تا ئەوەندەی تەمەنم ماوە پێکەوە بژین، سەرباری ئەو هەموویادەوەریە خراپە ناخۆش و تاڵانە، هێشتا زۆر شادمان بوو لەوەی کە وا پرسیارم کردووەو لیَ ی و دەیگەڕێنمەوەو، دەستی گرتم لە ڕێگادا پەلی دەکوتی، کچەکەم لەلای خۆمان بەخێوکردو بەڵکو خزمەتم دەکرد لەگەڵ دوونەوە نابیناکەم دا و داوا لە خودا دەکەم لێم خۆشی ببێت لەوانەی پێشتر کردبووم.

لەم ئەزمونەی خۆمەوە بەهەموو ئەوانە دەڵێم دڵیان خاڵی یە بەزەیی: خودا نەنوستووەو نانوێت، دڵتان ڕەق نەبێت بەرانبەر هیچ کەسێك، چونکە ڕۆژگارێك دێتەوە ڕێگاتان و بەرۆکتان دەگرێت لەسەر ئەوەی لەکاتی هێزو دەسەڵاتدا کردوتانە[1].

بەو ئومێدەی ئەم چیرۆکە بەندی لیَ وەربگیرێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تر داو، بەتایبەت خزمەتکارو ئیش کەرو هاوشێوەکانیان.

---

(١) جريدة (الاهرام)المصرية، بەرواری ١٩٩١/١/١٥ز



# زریکەی ویژدان

پیاوێك دوو ژنی هەبوو، ژنی گەورە کوڕێکی هەبوو، بەڵام دووەم منداڵی نەدەبوو، لەبەر ئەمە بە هەموو شێوەیەك هەوڵی لەناو بردنی ئەم کوڕەی دەدا. ڕۆژێکیان گوێرەکەیەك لەلانکی منداڵەکە نزیك بوو بووەو قوماتەکەی دەخوارد، تاگەیشتە سەر پەنجەکانی دەستی ڕاستی و خواردی بەڵام لەبەر چاوی بوو دووری نەخستەوە، زۆری نەبردو دایکی منداڵەکە مردو ساواکە کەوتە بەر ڕەحمەتی بەخێوکردنی باوکی، کوڕەکە گەورە بوو باوکیشی مرد،باوەژنەکەشی خودا ویستی وا بوو سێ کوڕی لەسەر یەك بوو، بەڵام هەموویان هەربەساوایی دەمردن، بۆیە تەنها کەسێك مابوویەوە ئاگای لێ بێت و دڵی بۆی بسوتێ ئەم کوڕە گۆجە بوو کە کوێرەکە دەستی خواردبوو، کەوتەژێر چاودێری وسۆزو بەزەیی و خەرجی ئەوکەسەی هەمیشە برینی دەکولاندەوە، وویژدانی خەریك بوودەهاتە هۆش و ئازاری دەکێشا لەناخی خۆیدا.

هەتا ڕۆژێکیان لە دوورەوە لێ دەڕوانی، کەوا بۆتە پیاوێکی بەرێزو ڕێکو پێك خاوەن قسە لەنێو هۆزەکەیدا لەنێو مێوانەکاندا دانیشتووە و فنجانی قاوەکەی بەدەستێکی بێ پەنچە هەڵدەگرێ، لەناکاو هاتە ژوورەوەو بەهەموو دەنگی خۆی ئەوەی بەسەر هێنا بوو بۆی گێڕایەوەو، داوای لێخۆش بوون و لێبوردنی لێ کرد، دوایی ئازاری ویژدانی سێ ڕۆژ بەو حەسرەتەوە بوو بۆ یەکجاری ماڵئاوایی لە ژیان کرد[1].

خودا تۆڵەی لەم ئافرەتە دڵڕەقە کردەوە، هەموو ژیانی لەئاخ و حەسرەت دا بەسەر بەرێت و هەمیشە پەنچەی پەشیمانی بگەزێت و بەشی هەر پەژارە بێت، دەبێت بزانیت کەوا خودا هەمیشە ئاگادارە لێت و تۆڵەی بۆ هەڵگرتویت.

---

(١) لە ( من غريب ماسالوني )، بەرگی دووەم، ل ١٤٠.





## ئـــاخ و حەسرەت

پیاوێ ژنەکەی مردبوو کوڕێکی حەوت ساڵانەی لەپاش بەجێما، زۆری نەبرد باوکە ژنی هێنایەوە، بەڵام ژنێك بەرد زۆر لە دڵی ئەو نەرمتر بوو، هەمیشە زۆر بە چاوی ڕق و کینەوە تەماشای ئەم بەستەزمانەی دەکرد، لەبەر ڕق و حەسوودی لە قوتابخانە دەری هێنا و هەندێ مەڕی بۆ کڕی کردیە شوانی مەڕەکان، هەر بەمەوە نەوەستا لەسەر بچوکەوە گەورە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرد سەبارەت بەم مەڕانە، لەسەر ئەوەی بۆچی دڕك نووساوە بە خوری مەڕەکانەوە. ئەم دڕندەیە کوڕێکی بوو، نازی دەدا بەو دەیلاواندەوە تاوەکو کوڕی مێردەکەی خەفەتبار بکات پێ ی، ئەم بەستەزمانە گوێ بە شتی وا نەدەداو چونکە ساڵانێك بوو هەستەکانی لەژێر ئەشکەنجەو مامەڵەی خراپ دا مردبوو.
کوڕە کلۆل تەمەنی گەیشتە (١٥)ساڵ و براکەی بوو بە (٨)ساڵ، کوڕەی نازدار تووشی نیکاف بوو، نەخۆشیەکە کاری کردە ژێ ی دەنگەکانی و لەدەستدانی، کاتێ گەیشتە دوانزە ساڵان مرد، بەڵام ئەم کوڕە کە گەیشتە حەڤدە ساڵان لەدەست ئازارو ناخۆشیەکان ڕای کرد، باوکی زۆر بۆی گەڕا بەڵام نەیدۆزیەوە، لەبەر ئەوەی زۆر بە خۆیدا چۆوەو هەستی دەکرد ستەمی لە کوڕەکەی کردو دوایی سێ ساڵ لەم ڕووداوە مرد.
باوکە مرد و حکومەت دوایی ئەوەی بەشی ژنەکەی دا لەمیراتی پیاوەکە دەستی گرت بەسەر بەشەکانی تری داو، بەدوایی میرات گرەوەکەیدا دەگەڕا، دوایی ماوەیەك ڕوون بویەوە کەوا کوڕەی کلۆڵ ڕووی لە یەکێك لە وولاتەکانی ئەمریکای لاتینی کردووەو لەوێ خودا ڕۆزی خۆی ڕژاندوە بە سەریدا و ئیستا دەوڵەمەندە.
کاتێك هەواڵ گەیشت بە کوڕەکە، نامەیەکی نارد بۆ باوەژنەکەی و تێدا سەرە خۆشی مردنی باوکی لێ کردو، هەروەها ڕێگەی پێدا سوود لە بە شە میراتەکەی ئەمیش ببینێت هەتاوەکو دەرفەتێکی بۆ هەڵدەکەوێت و دەگەڕێتەوە ببیات.



بەم شێوەیە ئەگەر نامەکە سەیر بکەیت سادەیە، بەڵام ئەم نامەیە لە لێدانی خەنجەرێك بە تاووتربوو ئەو ژنە دڕندە دڵ ڕەقەی هەمیشە دڵی پڕ حەسرەت بوو، باڵا دەست بوو، هەرچیەکی بیوویستایە دەیکرد هەرچی لە دەست هات لە بێ ویژدانی کردنی، ئیستا کوڕی مێردەکەی و ئەو کەسەی ئەم هیچ حسابێکی بۆ نەدەکرد بۆتە خاوەنی هەموو شتێك و دێت سەردانی ئەم دەکات، تاوەکو بەڕووخاوی و بە بێ ئەوەی تەنانەت تەندروستیشی مابێت، تەنها دڵێکی پڕ ئاخ و حەسرەت و چەند ئەسرینێکی بێ ئومێدو پەژارەیەکی نەبڕاوە خاوەن هیچی تر نی یە.

ڕۆژان ڕۆژی تریشی لە دوایە، بەڵام پیرەژن دڵی بەمەش خۆش بوو، کەوا لەگەڵ ئەم هەموو خراپەیەی کردی هێشتا کوڕەکە بەبەزەیی یە بۆی، داوای لێبوردن و لێخۆش بوونی لێ کرد و ڕووی کرد خودا و بەوئومێدەی خودا لەتاوانەکانی خۆش بێت لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی دا[1].

---

(١) لە (من غريب ماسألوني) بەدەستکاریەوە، بەرگی دووەم، ل١٤٠-١٤١





## ئەمە نــزای ستەملێکراو

خێزانەکە لە دەوری خوانەکەیان کۆبوونەوەو، چاوەڕێ بانگی ئێوارە یان دەکردو ڕۆژوەکەیان بشکێنن، بەڵام خۆزگە سفرەو خوان ڕەش و ڕووتەکەیانت دەبینی، ووشك و بەتاڵ هیچ شتێکی بەتامی لەسەر نەبوو دڵ بکاتەوە، ئەگەر بەچاوی خۆت بتبینیایە، ئاگر لە جەرگت بە ردەبوو بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموویان دەیان ووت: ((سوپاس بۆخودا)).

لەسوچێکی خوانەکە باوکەی هەژارلەگەڵ خۆیدا وورتە وورتەی دەکرد و ئەو گفتوگۆیە هەر لەبەر چاوی بوو کە لەگەڵ ئەو زۆرداراە دا ڕووی دابوو، خەیاڵ بیر پەرتەوازەبوو هەبیری دەکردەوە ئەوەی بیری نەمابوو گەدە بەتاڵ و خاڵییەکەی بوو، قسەکانی ئەو بێ بەزەییەی بیر دەهاتەوە کە هەڕەشەی لێ دەکردو بەسەریدا دەینەڕاند، ئەگەر ئەو قەرزەی بردۆتە خێرا نەیگەڕێنێتەوە تووشی توند ترین سزا دەبێت، بەڵام ئەگەر چی پارەکەی چەند جونەێك بوو بەڵام ئەم هەژارە بە چی بیداتەوە، لە کوێ پیدا پەیدا بکات، لەکاتێکدا تەنانەت نەیتوانیوە ئەم گەدەبرسیانە منداڵەکانی پڕبکات، ئەم ڕووت و بێ بەرگانە پۆشتە بکاتەوە، چۆن دەتوانیت ئەم کێشەیە چارەسەر بکات.

دەنگێکی گەورە دەرگاکەی هەژاندن، بەڵکو خەریك بوو دیوارە ڕزیوەکانیان وەك بوومە لەرزە بڕوخێنێ خەیاڵ بیرکردنەوەکانی پچڕاند، دەنگێك ئەینڕاندو دەیقیراند وەك گایەکی هار.

بە هەڵمەتەوە هاتبێت، ئەم بێ دەرەتانە بەدەستە لەرزیوەکانی دەرگاکەی بۆ ئەم زەبەلاحی تێر نەخۆرەوەکردەوە، گڕ لەچاوەکانی دەهاتنە دەرەوە، بەبێ ئەوەی هیچ بەم باوکە داماوە بڵێ بەزللە و لەقە تێی بەر بوو، جگە لەو جنێو قسە ناشرینانەی لەبەر چاوی منداڵە وردەکانی پێ دەووت، منداڵە بەستەزمانەکان دەستیان بە هاوار و داوای یارمەتی کرد و، لەولایشەوە ژنەبێ دەسەڵاتەکەی دەستی کرد بەهاوار کردن و داوای یارمەتی لە دراوسێکانی دەکرد، دوایی ئەوەی دراوسێکان گوێیان لەم هاوارو ناڵەی دراوسێکەیان بوو، هاتن بە هانایانەوە، دوای



بێنەو بگرەو لێپاڕانەوە وتکاکردن کابرایان لە ژێر پێ ی ئەم دڕندە یە دەرهێنا، دوای ئەوە تێری خوارد لە لێدان و کوڵی دڵی خۆی خاڵی کردەوەو لەزەوی دا بەشەکەتی خستی، دوای ئەوەی ئەم باوکە جوڵەی لێ بڕا و کەوتبووە سەر زەوی، لەم ساتەدا لە مینەری مزگوتەوە ((الله أکبر، الله أکبر ))ی کرد.. بەڵام دوایی چی...لەگەڵ گوێ بیست بوونی بانگ دا ئەم بەستەزمانە نیگای بڕییە ئەم زۆردارە وپاشان سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و بە دەنگێکی پچڕپچڕەوەوچاوی فرمێسکی هەڵدەوەراند: ((بڕۆ خودا تۆڵەت لێ بکاتەوە، خودات تۆڵەت لێ بکاتەوە...)).

دە ڕۆژ بەسەر ئەم کارەساتە دڵتەزێنە دا تێپەڕی، کابرای زۆردار کەلەو پەڕی لە خۆبایی بوون و بێ منەتی دابوو لە خودا، ئازارێکی زۆر ئەو قاچەی گرتەوە، لە کابرای پێ دابوو، پزیشکەکان سەریان لەم ئازارە سوڕما بوو، کاتێك هیچی بۆ نەکرا ە بێ ئومید بوو، گوندەکەی بەجێهێڵاو بەرەو شار کەوتە ڕێ، چونکە هێشتا پێ ی وابوو پارەو سامانەکەی هەموو شتێکی بۆ فەراهەم دەکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە کەچووە نەخۆشخانە بەیەك قاچەوە دەرچوو.

تووشی شێر پەنجە بووبوو...بەڕاستی شێرپەنجەیەك بوو زۆری نەبرد گەیشتە قاچەکەی تری و ئەویشیان بڕیەوە، زۆرداری لووت بەرزی بێ بەزەیی هەردووباڵی شکاو وتوانای ڕۆیشتنی نەما، بەڵکو پەکەوتەبوو پێویستی بەکەمترین شت بەکەسانی تر بوو ئەم دیو دیوی بکەنء خواردنی پێ بدەن و خزمەتی بکەن و لەهەموو شتێکدا چاو بەرە ژێرکەسانی دی بوو.

بەڕاستی ئەم دڵ ڕەقی ستەم کارە لەکاتی وەڵامدانەوەی داوای ستەملێکراو نزاکەی لێ گیرابوو، ئەو چارەنووسەی هەموو ستەمکارێك پێ دەگات پێ گەیشت. بەڕاستی (فإن الله یمهل ولایهمل)[1].

---

(١) ((مواقف ذات عبر)) ((عمر الأشقر)).

# بەشی شەشەم: سزای تاوان

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾[1].

لەئەبی مالکی ئەشعەریەوە دەگێڕیتەوە: پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی:

(حلوة الدنيا مرة الأخرة، ومرة الدنيا حلوة الأخرة).

( تاڵی و ناخۆشیەکانی دنیا لە دواڕۆژدا دەبنە خۆشی شرینی، وە خۆشی و ڕبواردنەکانی دنیا تاڵاوەکەی لە دواڕۆژدا دەچێژیت ).

یامن تمتع بالدنيا و زينتها
ولاتنام عن اللذات عيناه
أفنيت عمرك فيما لست تدركه
تقول لله ماذا حين تلقاه

(ئەی ئەو کەسەی بە دنیاو خۆشیەکانی ڕات بواردو لەبەرانبەر هیچ خۆشیەکدا خۆت نەبوارد و وازت لێ نەهێنا تەمەنی خۆت لەو شتانەی نەتزانی تەواوکرد و بەفیڕۆدا- چی بە خودا دەڵێت کاتێك پێ دەگەیتەوە).

یەکەم: ژیر کەسێکە بەدەمەوە هاتنی دنیا نایخەڵەتێنێ.

دووەم: بووبە نەسرانی قورئانی لە یادکرد.

سێ یەم: خودا تۆڵەیەکی لاتان ماوە کەهێشتا جێ بەجێ نەکردووە.

چوارەم: سزای کەسێك کاڵتە بە ووتە پیرۆزەکانی ئیسلام بکات.

---

(١) سورة التوبة: أية ٨٢.



## ژیر کەسێکە بەدەمەوە هاتنی دنیا نایخەڵەتێنێ

پاڵەوانی چیرۆکەکە لەسەر زمانی خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت:
لەو کاتەوە چاومان بە دونیا هەڵێنابوو، باوکم و مامەم لەیەك خانوودا پێکەوە ژیابوون، لەدوایی مردنی باوکیان کەبە هەژاری سەری نابوویەوە، بەڵام هەرچەندە باوکم برا گەورە بوو مامەم زۆر بێ ڕێز مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرد و هەمیشە شەڕی پێ دەگێرا...
بەڵام باوکم هەمیشە ئارامی دەگرت و دەیخواردەوە
مامەم دەستی کرد بە بازرگانی کردن و بوو بەکەسێکی ساماندار، بەڵام باوکم تەنها فەرمانبەرێك بوو هەر لە دەست کورتی و کەم گوزرانیدا مایەوەلەگەڵ ئەوەدا منداڵی زۆرو خەرجی زۆری بەسەریدا کەوتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەسۆز بوو بۆ منداڵەکانی و ئەوەندەی هەبوو بۆی خەرج دەکردن و هەمیشە سەردانی خوشك و برا بچوکەکانی دەکرد.
ڕۆژێك کۆمەڵە خزم و کەس و کار هاتنە سەردانمان باوکم بە سیفەتی برا گەورە داوەتی کردن، پاشان مامەم داوەتی کردن. کاتێك چووینە ماڵی مامەم لەگەڵ میوانەکانماندا مامەم زۆر بە سوکی مامەڵەی دەکرد لەگەڵ باوکم داو، هەندێ شتی دەکرد تاوەکو ڕێزی باوکم کەم بکاتەوە، بەڵام باوکم زۆر هێمن ئارامانە وەری دەگرت، بەڵام ئەگەر چی بچوکیش بووم لەناخەوە هەستم بە ئازار دەکرد.
پاش ئەم ڕۆژانە هاتن و ڕۆیشتن و، چەژن هاتە پێشەوەو بە خۆمانمان ووت بابرۆین چەژنە پیرۆزەی لێ بکەین.
کاتێك چووینە ژوورەوە مامەم باوکم گرژو مۆن بوو ترشی دەفرۆشت، لەبەر ئەوەی هەستی دەکرد من لەهەمموویان گەورەترم و من هێناومن لەباتی نوقل و جەژنانە تفێکی کردە ناوچەوانم.
دڵم شکاو بەلایەکی عەگالەکەی سەرم سڕیمەوە، بەدەرکراوی بە پەژارەوە ڕۆیشتین، دوایی ئەم ڕووداوە پەیوەندیمان پچڕیو ئەوە ماوەی سی ی ساڵە چاوم بە ناو چاوی مامەم نەکەتووە.





ڕۆژەکانمان بەرەو بەهار چوون و توانیم خوێندن تەواو بکەم و سوپاس بۆ خودا بووم بە ئەندازیارێکی بەناوبانگ زۆر لە کارەکانمدا سەر کەوتووبووم،زۆر پلەو پایەم وەرگرت و لە کۆتاییدا بووم بەسەرۆکی لیژنەی یەکێك لە کۆمپانیا تایبەتیەکان.لەناکاو ڕۆژێکیان مامەم خۆی کرد بە نوسینگەکەمداو بەڕێزەوە سڵاوی لێ کردم، بەپەلە چووم بە پیریەوە و پێشوازیم لێ کرد و دەستەکانیم ماچ کرد و، پێم ووت: لەڕاستیدا لێت ناشارمەوە ئەم سەردانەت زۆر نامۆ و سەیرە...!

ووتی کوڕم من ئێستا بە دوای کاردا دەگەڕێم، زۆر دەستم کورتە...!

بەبیستنی ئەم قسە چاوەکانم پڕ فرمێسك بوون. پاشان فرمانم کرد چاییەکی بۆ بهێنن و، نووسراوەم بۆ کرد لەلای خۆم کارم پێ دا..مامەم بوو بە فەرمانبەر لەلای من...!

لەدوایی تەواو بوونی دەوام خۆم گەیاندە لای باوکم، باوکم ئەم سەردانە ناوەختەی پێ سەیر بوو، خێرا لێ پرسیم کوڕم خێرە؟!

ووتم: هاتووم پێت بڵێم کەوا مامەم بووە بە فەرمانبەری من...!

باوکم کدماوەیەکی دوورو درێژ بێ دەنگ بوو، تەواو لە بیرکردنەوەدا ڕوچوو، پاشان سەری بەرزکردەوەو ووتی: کوڕم نەکەی بە تۆڵە حەزبە کەوتن و سەرکزی خەڵك بکەی و دڵ خۆش بی بە خەمی خەڵك پاشان فرمێسکەکانی بەچاودا دەهاتە خوارەوە سڕی و ووتی: مامەت پێویستی بە تۆیە بۆی باش بە.

ئیتر لەم کاتە بە دواوە هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەمەزان دا باوکم زەکاتی ماڵی خۆی دەدایە مامەم و، زوو زوو بە بیری دەهێنامەوە کە باش بم لەگەڵیدا و خۆم بە گەورە نەزانم بەسەریدا، چونکە ئەمە فەزڵی خودایە و سوپاسی دەکەین[1].

---

(١) (من غريب ماسألوني) شێخ عبدالله نوری، بەرگی یەکەم، ل٢٤، بەدەستکاریەوە.



## بووە بە نەسرانی قورئانی لەیاد کرد

عەبدەی کوڕی عبدالرحیم گێڕایەوە کەوا: لەگەڵ دەستەیەك بە فەرمان دەچووین بۆ خاکی ڕۆم، لاوێکمان لەگەڵدابوو لەهەمووومان زیاتر قورئان خوێن و شارەزابوو پێ ی، بەڕۆژوو دەبوو شەوەکەی شەو نوێژی دەکرد، دامان بەلای قەڵایەکەدا، کاتێك سەربازەکان لەولایە نەبوون، کوڕەکە لەنزیك قەڵاکە چوو بەرەو خوار، وامان زانی بۆ میزکردن دەچێت، لەوێوە تەماشای ئافرەتێکی نەسرانی دەکردو عاشقی بوو، ئەویش تەماشای ئەمی دەکردەوە، دوایی گۆڕینەوەی نیگا بەزمانی ڕۆمانی بە ژنەکەی ووت: چۆن دەتوانم بگەم بە تۆ؟

ووتی: کاتێك ببیت بە نەسرانی و دەرگات لێ دەکەینەوە و دەبم بە هی تۆ.

وای کرد و چووە نێو قەڵاکەوە.

دەڵێت: چووین بۆ شەڕەکە و لەپەڕی غەم وپەژارەدا بووین بۆی، هەموو وای دەزانی کوڕی خۆی وای بە سەر هاتووە، پاشان لە دەستەیەکی تردا تەواو بووین و گەڕاینەوەکاتێك بەلای قەڵاکەدا تێپەرمان کرد لاوەکە لەگەڵ نەسراینەکاندا پاسەوانی دەکرد، پێمان ووت: کابرا قورئان خوێندنەکەت و زانستەکەت و نوێژەکانت کوا چیان لێ هلت ؟

ووتی: من هەموو قورئانم لەیاد چوتەوە تەنها ئەم ئایەتە نەبێ کە دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مِن دِيَـٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴾ (١).(٢)

---

(١) سورة الحشر: أية ٢ و ٣.

(٢) لە (غرائب الاخبار)، بەرگی یەکەم.





## خودا تۆڵەیەکی لاتان ماوە
## کە هێشتا جێ بەجێ نەکردووە

خەلیفەی عەبباسی منصور شەوێکیان لە ڕابواردن و خۆشیدابوو شەو نشینی دەکرد، باسی خەلیفەکانی بەنی ئومەیە دەکرد و کەوا حاڵیان لەسەرەتاوە باشتر بوو ڕێگای ڕاستیان بە تەواوەتی بەرنەدابوو، بەڵام دواتر کار کەوتە دەست منداڵە دەست بڵاوەکانیان زیادە ڕۆییان کرد، هەموو خەم و هەوڵێکیان لە پادشای و هێزدا بە دەست هێنانی ئارەزووەکانیان و لە زەت وەرگرتن بوو لە سەرپێچیەکانی خوداو تورەکردنی خودا و بێ ئاگا لەوەی خودا وورده وورده ڕایان دەگرت و، لەم لای خودا بێ خەم بوون و، بۆیە خودا پاشای و گەورەیی و دەسەڵاتی لێ وەرگرتنەوە.

لەم کاتەدا صالح کوڕی عەلی پێ ی ووت: ئەی ئەمیری بڕواداران! کاتێك عبیداللە کوڕی مەروان ڕای کرد و خۆی کرد بە ناوچەی(التوبة)دا بەخۆی و دەست و پێوەندەکانیەوە، پادشای (التوبة) پرسیارياتی کردو چۆتە لای عوبەیدوڵڵاو گفتوگۆیەکی سەر سورهێنەر لەنێوانیاندا ڕووی داوە، بەڵام من بەباشی نایزانم، ئەگەر جەنابتان حەزبکات ئەم شەو فەرمان بکەیت لە زیندانەوە بیهێنین بزانین چی بوو.

مەنسور فەرمانی کرد هێنایان و پرسیاری دەربارەی ئەو چیرۆکەی لێ کرد، ووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران کاتێك ڕام کرد بۆ خاکی (التوبة) و بەو کەلوپەلانەی بۆم دەرچوو بوو، هەڵمان دایە فەرش و شتە گرانبەهاکانمان ڕاخست و سێ ڕۆژ لەوێ بووم، پادشاکە هاتە لام و، هەواڵی ئێمەی بیستبوو، پیاوێکی باڵا بەرزو سادە بوو لەسەر زەویەکەدا دانیشت و نەهاتە سەر شتومەکەکانی ئێمە.

ووتم: چی وات لێ دەکات لەسەر شتەکانمان دانەنیشت و لەسەر زەوی بیت؟

ووتی: من پادشام و پێویست هەموودەسەڵاتدارێك خۆی لە بەرانبەر دەسەڵات و گەورەی خودا بە کەم بزانێ و دەربببڕێ.

ووتم: ئەوە لە نەفامی دەست پێوەندان و کۆیلەکانمانەوە ڕوویدا.

ووتی: ئەی بۆ کشتوکاڵ و سەوزایی بە ماڵات و شەڕەکانتان دەفەوتێنن



لەکاتێکدا ئەم خراپە کاریەتان لەسەر حرام کراوە.
ووتم ئەویش لە نەفامی کۆیڵەو کاربەدەستەکانمانەوە بوو.
ووتی: ئەی بۆ چی خشڵ و زێرو ئاوریشتان دەپۆشی لە کاتێکدا لە قورئانەکەتاندا لە سەرتان حەرام کرابوو؟
ووتم: دەسەڵاتەکەمان لە دەست چوو بوو، دواتر بە هۆی کەسانی عەجەمەوە کە هاتبوونە نێو ئاینەکە ماوە سەرکەوتنەوە ئەوانە ئەو شتانەیان لەبەر دەکرد بەبێ ڕەزامەندیمان.
بەدەستەکانی دەیدا بە زەویدا هەڵی دەکەند و پاشان ووتی: وانییە کەتۆ باسی لێوە دەکەیت، بەڵکو ئێوە قەومێك بوون ئەوەی خودا حەرامی کردبوو حەڵاڵتان کرد بۆ خۆتان و ئەوەی فەرمانتان پێ کرابوو نەیکەن و قەدەغەبوو کردتان و، لەوەی پێتان درابوو ستەمتان کرد، هەر بۆیە خودا لێ ی وەرگرتنەوە و بەرگی سەرشۆری و ڕیسوایی بەو تاوانەی کردبووتان بە باڵاتاندا کرد و، هێشتا تۆڵە و بەڵایەك هەیە نەگەیشتۆتە جێ ی خۆی، منیش دەترسم ئەو سزایە بتانگرێتەوە لە کاتێکدا لە وولاتی مندان و بەر منیش بکەوێت، میوانداری سێ ڕۆژە و پاشتر چەند پێویستە بۆ خۆ کۆکردنەوە بەکاری بهێنە و زەویەکەی من بەجێ بهێڵە[1].

---

(١) لە (جولة في رياض العلماء)، ل ١٥ و ١٦.





## سزای کەسێك
## گاڵتە بە ووتەو پیرۆزیەکانی ئیسلام بکات

لە ئەبی داودەوە دەگێڕنەوە- خاوەنی کتێبی (السنن)- کەوا: یەکێکە لەوانەی فەرموودەی دەخوێندو لەبەر فاسقی و نەبوونی سیفاتەکان هیچی لی وەرنەدەگیرا، ڕۆژێکیان ئەم پیاوە گوێ بیستی ئەم فەرموودەیە بوو کەوا:
(ان الملائکة لتضع اجنحتها لطالب العالم).
واتە: فریشتەکان باڵەکانیان بۆ ئەوانەی بە دوای زانست دا دەگەرێن ڕادەخەن، ئەمیش چوو بزماری لەم لاو لای پێڵاوەکانی داو، دەیووت دەمەوێت باڵی فریشتەکان بشکێنم و کونی بکەم، دەڵێن تووشی نەخۆشی کوژەر هات لە قاچیدا. لە ریوایەتێکی تردا دەڵێت: دەستەکانی و قاچەکانی و هەمووی جەستەی تووشی ئیفلیجی بوو[1]. ئیبن خەلەکان لە (وفیات) و ابن کثیر لە (البدایة والنهایة)دا هێناویانە و هەندێ لە مێژوو نوسانیش هێناویانە لە نوسینی (شێخ قطب الدین یونینی )ەوە کەوا: کابرایەك لە بەسری ی دەژیا پیان دەوت ئەبا سەلامە، کەسێکی زۆر خراپ بوو گاڵتەی دەکرد بە هەموو شتێك، لە لای دا باس لە فەزڵی سیواك کردن و لایەنە باشەکانی کرا، ئەویش ووتی، سوێندم بەخوا مەگەر لە کۆمدا سیواك بکەم و سیواکەکەی کرد بە کۆمی خۆیدا و دەریهێنایەوە، دوای نۆ مانگ هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد لە سکی دا و کۆمی زۆر بە ئازار بوو، لەگەڵ ژانەکاندا گیاندارێکی دانا لە شێوەی جرج دابوو، چوار کەڵبە و کلکێکی درێژ و چوار پەلی هەبوو، لە دواوە لە کەروێشك دەچوو، ئەم گیاندارە سێ دەنگی لێوەهات و، پاشان کچی کابرا هات و سەری پان کردەوە، کابرا دوو ڕۆژ دوای ئەم کارەساتەی ماو، سێ یەم ڕۆژ مرد و هەر لەبەر خۆیەوە دەیووت: ئەم گیاندارە ریخۆڵەکانی بڕیم. کۆمەڵێك لە خەڵکی شارۆچکەکە و ناودارانی گیاندارەکەیان بینی و، هەندێکیان بە کوژراوی بینیان[1].
ئەم دوو ڕووداوە پەندێکی گەورەیە بۆ ئەوانەی گاڵتە بە پیرۆزیەکانی ئیسلام دەکەن و وە بۆ ئەوانەی گاڵتە بە دین پەیڕەوکارانی سوونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەکەن.

---

(١), (٢) لە (نصب الموائد) ل١٦.

# بەندی سێیەم

## بەشی یەکەم: یاخی بوون لە دایك و باوك

خوای گەورە دەفەرمووی:

﴿ وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِي وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾[1].

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموویت:

(رضا الرب في رضا والدين، وسخطه في سخطهما)[2].

(ڕەزامەندی خودا لە ڕەزامەندی دایك و باوكدایەو، تووڕەیی لە تووڕەییانەوەیە)

یەكەم: سزای یاخی بوون.

دووەم: یاخی ترین كەس.

سێیەم: شاعیرە یاخیەكە.

---

(١) سورة الاحقاق: أية: ١٧.

(٢) طبراني گێراویەتیەوەو، ئەلبانی بە صحیح ی داناوە.



## سزایی یاخی بوون لە دایك

زۆر نازداربوو لە لای دایك و باوكی نازێكی زیاد لە پێویستی پێدرابوو، بەڵام زۆری نەبرد باوكی كۆچی دوای كرد، دایكی ئەم نازەی لێ كەم نەكردەوە، بەڵكو زیاتر لە جاران گرنگی پێداو، قۆڵی لێ هەڵماڵی و تاقە كوڕەكەی كردە پیاوێكی نێو كۆمەڵگا، بەو پارەیەی لە باوكیەوە بۆی مابویەوە توانی بازرگانی پێوە بكات، بۆ هەركوێیەك دەچوو نزاو پارانەوەكانی دایكی بۆی قەڵغان بوو، بۆ هەموو هەنگاوێكی هەمیشە دەم بە دوعا بوو بۆی و لە خودا دەپارایەوە سەركەوتووی بكات، هەمیشە وای دەزانی جگەرسۆزەكەی منداڵەكەی جارانە خزمەتی دەكردو بە دەوری دا دەهات دەچوو، دڵی بە خۆشیەكانی خۆش دەكردو خەمی لە خەفەتەكانی دەخواردو دڵی ی دەدایەوە و هانی دەدا بەرەو پێش بڕوات و كۆڵ نەدات، لە دوایی فەزڵی خودا دایكی هۆكاری یەكەمی كۆكردنەوەی ئەم سامانە و قازانجە زۆرە بوو ڕژابوو بە سەری دا و، ئەو ناوبانگەی لە نێو خەڵك دا هەیبوو، بەڵام هێشتا دایكی دڵخۆشیەكەی تەواو نەكردبوو، چونكە ئاواتی بوو تاقانەكەی ژن بهێنێت وە پێش مردنی چاوی بە نەوەكانی بكەوێت، لەگەڵیاندا ئەوەندەی تەمەنی ماوە بە سەری ببات، دایكە سەرو سۆراخی كچی چاكی بۆكرد، بەڵام كوڕەكە بە وانە قایل نەبوو، بەڵكو خۆی ئافرەتێكی هەڵبژاردوو دایكیشی هیچ ڕێگریەكی نەبوو، بەڵكو لەوە زیاتر دڵخۆش بوو پێی و، لە نزاكانی بە ردەوام بوو تاوەكو نەوەكانی ببینێت، خودا نزایی پیرەژنی قبوڵ كرد و خودا دوو كوڕی بەخشی پێی وە بە هەموو توانایەوە لەگەڵیاندا بە خێوی كردن وە زۆر گوێ ڕایەڵ بوون، پیرەژن لە خۆی خۆشتری دەویستن و چەندەها شەو بە دیاریانەوە شەو نخونی كرد، ڕۆژگار تێپەری ء ئاوڕی نەدایەوە منداڵەكان گەورەبوون و، دایكیش تەمەنی رۆیشتبوو ئیتر پێویستی بە كەسانی تربوو كارەكانی بۆ جێ بە جێ بكات و یارمەتی بدات، كوڕەی سپڵە هەموو ئەو



هەوڵ و ماندووبوونەی دایکی لەبیر کرد و لێ بیزاربوو، سەرباری ئەوەی زۆر هەبوون و دەوڵەمەندبوو بەڵام ڕژدوو بەرچاو تەنگ بوو بەرامبەر دایکی و دڵی نەهات خزمەتکارێکی بۆ بگرێت بەڵکو بیری لە ڕێگایەك دەکردەوە لە دەستی رزگاری بێت ئیتر حەز ناکات سەیری ئەم پەکەوتەیە بکات و ناڵە و نرکەی دێت، بیرکردنەوەکانی گەیاندیە ئەوەی فرێی بداتە خانەی پیرانەوە.
نەفرەت لەو کوڕەی ئەو هەموو شەو نخونیەی لە بیرکرد و یاخی بووە لە دایکی فرێی دەداتە خانەی پیرانەوە؟ ئەی کوا ئەو هەموو دەردەسەریەی چەشتی بە دەستیەوە؟ کوا ئارام گرتنەکەی؟ سۆزی؟ چاودێریەکانی؟ بە بێوەژنی تاکە دەست بە خێوی کرد.. هەمووی با بردی، ئەمە پاداشتی ئەو دایکە بوو هەموو ژیانی کردە قوربانی لە پێناوی تاقانەکەی دا؟ هەزاران نەفرەتی لێبێت. پاش ئەم کارەی لە لای یەکێك لە هاوڕیەکانی دانیشتبوو، سکاڵای لە دەستی ئەو کەسانە دەکرد کەوا لۆمەیان کردووە، باسی لەوە دەکرد بێ بەختە لە دوور و نزیکەوە خزم و ناسیار قسەی پێدەڵێن بۆ ئەم کارەی کەوا بە ووتەی خۆی کارێکی ئاسایی و پێویست بە لۆمە ناکە، هاوڕیەکەی قسەکەی پێ بڕی و داچەڵکیء ووتی: مەبست لە دایکت کێ یە بردۆتە خانەی پیران: دایکی ڕاستەقینەتە کەوا لە سکی دا هەڵیگرتبووی؟ دایکت فلانە کەسە کە لە ساوایەوەی بە خێوت دەکات و؟ گەورەی کردی و؟ یان باس لە دایکێکی دی دەکەی؟
ووتی: بەڵێ فلانە کەسە دایکم؟ چی تێدایە؟ ئەی بۆچی حوکمەت ئەم خانانەی کردۆتەوە ئەگەر بۆ هاوشێوەکانی ئەمانە نەبێت.
هاوڕێکەی ووتی: پاك و بێگەردی بۆ خودا: خودایە تووڕەیی و خشمی خۆتمان لێ دووربخەیتەوە ئایا بەم هەموو دەسەڵات و هەبوونیەتەوە، بەم هەموو پلە و سامانەتەوە لەم پیرەژنە سەغڵەت بوویت وە جێگای نەدەبوویەوە لات، خۆ ئەم سەرکەوتنانەی بە دەستت هێنا هەموو نزاکانی ئەو بوو گیرابوون، هاوڕێکەم عەقڵت بخەوە کار و، داوای لێخۆش بوون لە خودا بکە و خێرا بە پەلە بیهێنەوەو پێیەکانی ماچ بکە، داوا لە خودا بکە ئەو لێخۆش بوونەت بە نسیب بکات، داوای لێ بووردن بکە لەو دایکە بەستەزمانەت، بیگەڕێنەرەوە، ماڵێ بۆ ئامادە بکە و خزمەت کاری بۆ بگرە، هەوڵ بدە دڵی خۆش بکەیت و





بێ حەوێنەرەوە، ئەم ئەم کارەت زۆر نامەردانەیە، من وام دەزانی زۆر پیاوانەی و ئەم کارە لە تۆ ناوەشێتەوە.
بە بیستنی ئەم قسانە زیاتر دڵ تەنگ بوو ئەوەندەی تر هاربوو ووتی: کاکە من ئەوەی تێدام لە ئیش و ئازار بەسمە، ئەوە تۆ خوێ دەکەیتە برینەکانمەوە، ئیتر من تۆ ناناس.
هاورێکەی ووتی: هاورێیەتی کەسی وەك تۆ یاخی لەو پیرە دایکە بۆ من شەرمەزاریە و منیش حەزی پێناکەم.
ڕۆژانێکی سەخت بەسەر پیرێژنی بێ کەسدا تێ پەریان کرد، کە لە خانەی پیران کەوتبوو، بە بێ ئەوەی کەسێك لێی بپرسێت، جگە لەم پەژارانەی بەدەستی پیرو نەخۆشی و نەبوونیەوە دەینالاند، نەخۆشیەکەی زیاتر بوو، بەڵام کەس نەبوو سەردانێکی بکات، دواتر برایە نەخۆشخانە، بەڵام ئەم دڵەی لە بەرد ڕەقتر بوو نەرم نەبوو بۆی، خەڵك و منداڵەکانی هانیان دا لە نەخۆشخانە سەردانی بکات، بەڵام بە پێچەوانەوە زیاتر لە خۆی بایی بوو، بەڵام ئایا ئەو کوڕە یاخیە بە خۆی داچۆوەو تۆبە بکات و ڕێگەی ڕاست بگرێت.. هەرگیز، بەڵکو سەفەرێکی لە ناکاوی بۆ خۆی سازداو چووە دەرەوەی وولات، هەتا دڵنیابوویەوە لەوەی بە تەواوەتی دنیای جێهێلاوە بە خۆی و ئەو دەردە سەریانەی چەشتی لە گۆڕەکەیدا بە خاك سپێراوە، گەڕایەوە، بەڵام بۆچی و چی بکات گەڕایەوە؟ تاوەکو ئەوەی چاندوویەتی دروێنەی بکات، ئای لەو بەرهەمە خراپەی؟ بەرهەمەکەی یاخی بوون بوو، چی دەروێنە بکات؟ ئەبێ چی چاوەڕوانی کەسێکی وا بکات؟. بێ گومان بێ ئومێدی نەگبەتی و بەلا.
چەند ڕۆژێکی کەم بەسەر چوو، هێشتا گۆڕی دایکەی بێ چارە ووشك نەبووبوویەوە، خۆشەویسترین کوڕی بە کارەساتی ئۆتۆمبیل تیاچوو، وەك خەنجەرێك وابوو لە دڵی باوکی درا،ساڵێك بە سەر ئەم کارەساتەدا تێنەپەریبوو کوڕەکەی تری، باڵی ڕاستی باوکی لە کاروباری بازرگانی دا و بەڕێوەبەری کارەکانی تووشی (نەخۆشیەکی قورس) بوو، کەوتە ناو جێگا، هەر شوێنێکی شك ببردایە دەیبرد و دەیگەڕاند بە ئومێدی دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆی، بەڵام بێ سوود بوو، ئەویش مرد و چوو بۆ لای براکەی، باوکە بە تەنیا



مایەوە و هەر دوو باڵی شکا و، باری دەروونی تێك چوو، زەوی لێ بوو بە چەرمی چۆڵەکە و بازرگانیەکەی کورتی هێناو، فەرمانبەرو کارگوزارەکانی دزیان لێ دەکردو، دەستی کرد بە دروێنەی بەرهەمەکەی چاندبووی، ژیانی تێك دەشکاو ئەوەی دروستی کردبوو لە بەرچاوی دا دەروخێنرا و دەستەو سان بوو لە بەرانبەری دا، سزای خودایی ڕۆژانە بە سەریدا دەڕژاو، خوداش دەزانێ لە دوارۆژدا دەبێ حاڵی چۆن بێت[1]. بەڕاستی ئەمە حکمەتی خودایی و دادوەری خودایە.

---

(١) لە رۆژنامەی (الواطن الكويتية) ژمارە (٧٢٢١) بە دەستکاریەوە





## یاخی ترین کەس

ئەصمەعی دەڵێت: کابرایەکی دەشتەکی بۆی گێڕامەوە ووتی: چوومە دەرەوە لە هۆزەکەی خۆم دەگەڕام بە شوێن یاخی ترین کەس و چاکترین کەسدا، بە شوێنەکاندا دەگەڕام هەتا گەیشتم بە پیرە پیاوێك پەتێك کرابوو ملی و دۆڵکەیەکی پێوەکرابوو بە حوشتر بەرزەفە دەکرایەوە، لە و دەشتەدا گەرما زۆر بە تین بوو، گەنجێکی لە دواوە راوستابوو شتێکی بە دەستەوە بوو لە قامچی دەچوو لولی کردبوو لێی دەدا پێی، شوێنی دەرچوو لە پشتی دا.

پێم ووت: تۆ لە خواناترسی بەرانبەر ئەم پیرە زۆر لاوازە؟ ئایا ئەم بەتی ملی بەس نیە بۆی وەك ئازار و سزا؟!!

ووتی: ئەگەر نەتزانیوە باوکیشمە؟!

ووتم: ئەی خودا چاکت بۆ نەکات.

ووتی: ووس بە، خۆ ئەمیش وای لە باوکی خۆی دەکرد، باوکی ئەمیش هەروای لە باوکی خۆی دەکرد.

لێرە دا ووتم: ئەمەیە یاخی تریم کەس[1].

واتە یاخی بوون وای لێ بێت ئەم کوڕە دڕندەیە باوکی ببەستێتەوە و لە پشتی بدات بە قامچی، بی گومان دنیا و دوارۆژی دۆڕاندووە، ئەمەش پاداشتی هەریەکێکیان بووە کەوا ستەمی لە سەرووی خۆی کردووە و ڕاکردن لە سزانییە و چی بچێنی دروێنەی دەکەیتەوە.

---

(١) لە (المحاسن والمساوىء)ەوە وەرگێراوە.



## شاعیرە یاخیەکە

جریری کوڕی عطیە ی شاعیر زۆر لەگەڵ باوکی دا خراپ بوو، هەر بە هەمان شێوە بیلالی کوڕی کوڕەکەی خۆی دەشێلاو لەگەڵیدا خراپ بوو، لە قسەیەکدا لە یەك گیران، بیلال بە باوکی ووت: درۆزن ئەو کەسەیە کە کاری خراپی لەگەڵ دایکی خۆی کردووە!! مەبەستی باوکی بوو-

دایکی هات بە سەری داو پێی ووت: دوژمنی خودا ئەوە بە باوکت دەڵێت؟

جریر ووتی: وازی لێبێنە ئەڵێی لەو کاتە لەوێ بووە کەمن بە باوکی خۆم وا دەوت[١].

بەم شێوەیە هەندێ جار مرۆڤ سزایی کارەکانی لە دنیادا و بە ڕۆژی رووناك دێتەوە بەردەمی و، ئەوەی ئەوەی دەرخواردی خەڵکی داوە دەکرێتەوە بە قورگی داو، ئەو ژەهرەی بۆ خەڵکی ئامادەکردووە، دەرخواردی خۆشی دەدرێتەوەی، بە تایبەت ئەگەر ئەو سەر کێشیانە لە دژی دایك وم باوك بێت، چونکە باشبیت لەگەڵیاندا، منداڵەکانت بۆ خۆت باش دەبن، بێ گومان چی بچێنی دروێنە دەکەیت.

---

(١) لە (الجزاء من جنس العمل).

# بەشی دووەم: ( ستەم )

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِۦ ﴾ [1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت:
(أشد عذابا للناس في الدنيا أشد الناس عذابا عندالله يوم القيامة) [2].
(هەرکەسێك لە دوونیادا ئەشکەنجەی خەڵك بە توونتدی بدات خودا لە رۆژی دواییدا سزاکەی زۆر توندەکات).

وما من يد ألايد الله فوقها ولا ظالم الا سيبلي انظالم
(هەموو کەسێك ستەم دەکات و دەستی درێژە دەستی خودا لە و باڵاترەو هەموو ستەم کارێك ستەم کاری گەورەتری هەیە خودا خودا بۆی دەنێرێت)

یەکەم: سزایەکی رێك وەك خۆی.
دووەم: پێ بکەنن! بەڵام قەدەریش پێ دەکەنێ!.
سێ یەم: خودا ئاگای لێ یەو چاودێریت دەکات.
چوارەم: هەڵبەستنی قسە و درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه و سلم) و سزاکەی.

---

(١) سورة العنكبوت: ئایەتی ٤٠
(٢) أحمد بەیهەقی و حاکم ریوایەتیان کردووە، ئەلبانی بە (صحيح) دایناوە.



## سزایەکی ڕێك و پڕ بە پێستی خۆی

شێخ عبدالله تلیدی لە کتێبی (نصب الفوائد) دادەڵێت: هەندێ لە وانەی هەموو قورئانیان لەبەر بوو بۆیان گێرامەوە کەوا فەقێیەك بۆی گێراونەتەوە کەوا: لە لادێیەی دادەنیشتم بانگیان کردم بۆ شوشتنی مردوویەك، کاتێك چووم پەردەکەی بە سەری دادرابوو لامبرد، دیمەنەکەی ترسێنەر بوو، بە جۆرێك سەری وەك بەراز دەینواند و جەستەی وەك خۆی بووو، دامپۆشتەوەو بە پەلە خۆم گەیاندە مەلای لادێکە و بۆم گێرایەوە، لەگەڵم دا هات و کابرا بینی بە هەمان شێوە بوو، ژنەکەی بانگ کرد و زۆر لێکۆلییەوە کە ئەم پیاوە چ کارە بووە، ژنەکەی ووتی خەریکی سحربازی بوو، قورئانێکی خستۆتە ژێر خۆڵەوە میزی بەسەر دادەکردو لە پەیوەندی دابوو لەگەڵ شەیتانەکاندا[1].

بەڕاستی سزایەکی پڕ بە پێستی بوو خودا لە دنیادا پێش ئەوەی بشارێتەوە و کارە خراپە کاریەکانی لە گۆڕبنی. بەڵکو خودا کردی بە پەند بۆ جگە لە خۆی و، ئەوەی چاندبووی دروێنەی کرد.

---

(١) لە (نصب الفوائد)ەوە.





## پێ بکەنن و قەدەریش پێ دەکەنێ!

کاتێك شووم بەم پیاوەکرد، لە ژنە مردووەکەی کچێکی چوار ساڵانی لێ بەجێ مابوو، کابر کچەکەی زۆر خۆش دەویست و هەمیشە یادی باشەکانی دایکی دەکردەوە، ئەم دووکارەی تەواو توڕەی کردبووم، هەموو هەوڵێکی خۆم خستەکار تا ئەو کچ و دایکەی لە یادی بەرمەوە بەڵام بێ سوود بوو، خۆی خزمەتی کچەکەی دەکرد و بە باشترین شێوە چاودێری دەکرد، تەنانەت ئەگەر نەخۆش بکەوتایە لە ئامێزی خۆی دایندەگرت و لە سەر جێگاکەی خۆی دەینواند، خێرا خێرا پێ دەوت (هەر تۆم هەی، هەموو کەسم).

بە خۆمم ووت: ئەم هەموو سۆز و خۆشەویستیە بۆی من هیچ کارێکم پێناکرێت، تەنها ئەوە نەبێت بە پیلانێك بیکوژم، بەلام نەك کوشتنی جەستەیی، بەڵکو بە ئازاردانی ڕۆحی دەیکوژم، منیش نازێکی سەر زارەکی پێدەدەم هەتا وەکو گێژاو بێ دەستەڵات بێت و، نەتوانێ خزمەتی خۆی بکات و، فێرە دوورمان و چێشتی ناکەم، دەبێت وای لێ بکەم دەستە وسان بێت بەرامبەر هەرشتێك ئافرەت پێویستی بێت لە ژیانی و ماڵەکەیدا، دەبێت ئافرەتێکی تەمبەڵی لێ دروست بکەم هیچ کارێکی پێ بەرێوە نەبرێت.

دەستم کرد بە جێ بە جێ کردنی پیلانەکەم و هەڵس و کەوتی خۆمم گۆڕی، هاوسەرەکەم زۆر دڵخۆش بوو کەوا بۆ کچەکەی دڵنەرم بووم و وای دەزانی نازی هەڵدەگرم، تەنانەت وام لێ کرد کاتێك لە سەر سفرە بوویستایە ئاو بخواتەوە، یان خۆم بۆم تێدەکرد، یاخود فەرمانم بەکچەکەم دەکرد بچێت ئاوەکەی بۆ بهێنێت!

بەلام کچەکە زۆر زرنگ و زیرەك بوو، بەمە دڵمی لەت لەت کردبوو، لە هەموو ساڵەکاندا یەکەمی دەهێنا، دەرس خوێندن و سەعی کردنم لەبەر چاوی دەخستەء، وام بۆ دەردەخست کەوا ماندووی ئیتر بنوو ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە بە دەرسەکانتەوە، بەڵام سەرباری ئەم ڕێگریەم خۆی ئەوەندە زیرەك بوو، پێویستی بە خوێندن نەبوو، هەموو قۆناغەکانی خوێندنی بە سەرکەوتووی تەواو کردو گەیشتە زانکۆ، بەڵام داواکارێك هاتە پێشەوە منیش زۆرم پی خۆش بوو،



چونکە وام دانابوو دەستە وسانەو نەماڵ و نە خوێندنی پێ بەڕێوە ناچێت، باوکەم ڕازی کردو، زۆر ئامۆژگاریم کرد کەوا کەسی وا دووبارە نابێتەوە، شووی کرد.. بەڵام بەکێ؟!

چووە ماڵی ئەوکەسەی خۆشی دەویست و دەیپاراست، هەمووشتێکی حەوانەوەی بۆ فەراهەم هێنا، خزمەتکار لە ماڵەکەی دا دەهاتوو دەچوون و فەرمانەکانی پێش ووتن جێ بە جێ کرابوو، ئیتر با هەر لێنان و پاك کردنەوە نەزانێت.. ژیانێك هەمووی خۆشی و حەوانەوە، ئەوەی من پیلانم بۆی دانا وا دەرنەچوو، هەمووی هەڵگەرایەوە، لە هەمووی بە ئازارتر ئەوە بوو کچەکەی خۆم دوایی دووساڵ دوایی ئەو شووی کرد، بەڵام کابرایەکی دڵ ڕەق و جنێو فرۆش و، مەزاجی وەك ئاسن بوو، ڕژد و ڕەزیل هەمیشە وەك ترش فرۆش نێوچەوانی تاڵ کردبوو.

کچەکەم هیچ تاوانێکی نەبوو، گوناهبار من بووم و، خودا بە کچەکەم سزای دامەوە[1].

ئەم باوە ژنە ویستی بوو ئەم کیژۆڵە بەستە زمانە بێ دایکە دابماڵی لە هەموو زانست و زانیاریەکی ژیان و بیکاتە کچێکی گێل و، هیچ نەزان، بەڵام خودا ئەوە دەکات کە دەیەوێ، وویستی لە سەر بوو خێر بهێنێتە ڕێی و لە پیلان و فێڵەکانی ئەم ژنە بیپارێزێت، کردیە کچێکی ووریا و خوێندەوار، لە هەمان کاتدا ئافرەتێکی خاوەن ماڵی پلەیەك و، هەروەها پیاوێکی پێ بەخشی خۆشی دەویست و نازی هەڵدەگرت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ [1].

خودای باڵا دەست پیلانی ئەم ژنەی دایەوە بە ڕووی خۆیدا و هێنایەوە ڕێگا و پیشانی دا کەوا ئەگەر کچەکەی خۆی بێت چی دەکات، دڵی پڕکرد لە حەسرەت و داخ و، تەنها مەگەر لە ئازاری پەشیمانیدا بژی، بەڕاستی ئەوەی دەیچینی دروێنەی دەکەیت.

---

(١) لە (من غريب ما سألوني).

(١) سورة الانفال: ئایەتی (٣٠)





## خودا ئاگای لێ یەو چاودێری دەکات

خێزانەکەی باری ئابووریان مام ناوەند بوو، بەڵام باوکێکی کەمتەرخەمی هەبوو، هەمیشە سەرقاڵی ڕابواردنی شەوانەی خۆی و کارە تایبەتیەکانی بوو، لە ڕۆژیشدا کاری بازرگانی دەکرد، دایکێکی خۆپەرست تەنها خەمی جل و بەرگی خۆی و ڕازاندنەوەی خۆی بوو، ئەم گەنجە لە باری خێزانیەکی نا هەموار و خراپ دابوو، هەموو شتێکی دەکرد بە بێ چاودێری و لێپرسینەوە، ئەم بارودۆخەوای لێ کرد لە بواری خوێندن دا سەرنەکەوت و، هەر لە تەمەنی پانزە ساڵیەوە شەوانە لە ڕابواردن بوو تا بەیانی و، پاشان کە دەگەڕایەوە کەس لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەدەکرد، چەند ڕۆژ هەر نەدەهاتەوە بەڵام کەس پرسیاری لێ نەدەکرد. ئەم هەرزەکارەی ئەمە ژیانی بێت و لەم بارو دۆخە خراپەدا وا بژی، بێگومان نێچیرێکی چەوری شەیتانە، بۆیە ڕێگای خراپەی گرتە بەر و هیچ بەرگریەکی نەبوو، فێری مەی خواردنەوەو، دزی بوو، بەڵکو بە وە نەوەستا بوو بە وەستای کارە خراپ و تاوانکاریەکان، بوو بە پسپۆڕێکی شارەزای ئەو بوارەو، مێشکی تەنها بۆ خراپە و تاوان کاری دەکرد و، بە جۆرێك هیچ بەڵگەیەکی لە دوای خۆی جێنە دەهێلا تا تێوە بگلێ پێی، زۆر بە ئاگاییەوە پلانەکانی دادەڕێژاو هەموو زیرەکیەکی خۆی تەرخان کردبوو بۆ جێ بە جێ کردنی تاوانکاریەکانی و بەردەوام بوو لە سەری، بەم زیرەکیە توانی چاوی پۆلیس لە خۆی دووربخاتەوە، بەڵام چاوی خودا کە هەرگیز ناخەوێ و لە کۆتایشدا چەندیش درێژە بکێشێت هەردەگیرێت، هەرچەندە تاوانبار زیرەك و وورياو بە ئاگا بێت، هەر چیەکیش ڕوویدات، هەرپێویست دەکات کە خودا لوتی بشکێنێت:

لەبەر زرنگی و وورپایی و لێزانیەکەی زۆر لە خۆی دڵنیا و بایی بوو، ڕۆژێکیان ئەم تاوانبارە دڕندەیە لە یەکێك لە قاوەخانەکاندا دانیشتبوو لەگەڵ هاوەڵەکانی چای دەخواردەوە، بەڵام لە ناکاو پۆلیس خۆی کرد بە قاوەخانەکەدا و لە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەوەو، دەستیان کرد بە پشکنین هەموو ئامادەبوان، لە بەر ئەوەی ئەو پەری لە خۆی دڵنیابوو و دەیزانی پۆلیس بۆ ئەم ناگەڕێت و کەس وەك



خۆی نایناسێت و له هیچ ناترسێت، به هێمنی دانیشتبوو خۆی تێك نەدا و نەترسا، پۆلیسەکان لێی نزیك بوونەوه و یەکێك له پۆلیسەکان دەستی کردبه پشکنین و هیچی له لانەبوو، پشتی هەڵکرد بڕوات، بەڵام چاوی کەوته سەر شتێك لەژێر پێیەکانی داو، له پڕ گەڕایەوه و پارچەیەکی گەورەی له مادده هۆشبەرەکان دۆزیەوه، ئەمه بوو به دوای دا دەگەڕان و هەواڵیان پی درابوو، بەڵام سەیر لەوەدا بوو ئەم پارچەیه به چی گەیشته لای قاچی ئەم، پۆلیس هەواڵی هەبوو تاوانبارێك ماددەی هۆشبەرەکانی پێیه و لەو قاوەخانەیەدایە، ئەویش له ترسی گیانی خۆی فڕی داوه و بەبێ ئەوەی ئەو بیەوێ کەوتۆته ژێر پێی ئەو[1].

بەم شێوەیه خودا ویستی ئەم تاوانباره سزا بدات بەڵام تاوانێکیش ئەم نەیکردبوو، بەم شێوەیه تاوانبارکەوته دەستی دادگا و زۆر به ئاسانی، دڵنیا به خودا بوارت پێ دەدات بەڵام پشت گوێت ناخات، وه ئەم تاوانباره بواری پێ دا تۆ به بکات و بگەڕێتەوه، بەڵام ڕۆچوو له خراپەکاری داو، زیاتر له خۆی بایی بوو، خودای گەورەیش ئەم تاوانبارەی چەندەها ماڵی کوێر کردەوە، هەموو تاوانێکی ئەنجام دا تۆڵەی لێ کردەوه ئاگادار بوو لێی، هەرچیەکی چاندبوو دروێنەی کرد.

---

(١) له (غريب ما سألوني) بەرگی یەکەم.





## هەڵبەستنی قسە و درۆکردن بە دەم پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه و سلم) و سزاکەی

بوخاری لە(صحیح)ە کەیدا هێناویەتی لە (عبدالعزیزی کوڕی صهیب)ەوە لە ئەنەسەوە ووتی: پیاوێکی نەصرانی هات موسڵمان بوو، پاشان سوورەتی (بەقەرە و آل عمرانی خوێندو، شتی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەنووسی، پاشان پاش گەزبوویەوەو بۆوە بە نەسرانی و، خۆی هەڵدەکێشاو دەیووت محمد نازانێ من چیم نووسیوە، پاشان مرد و خستیانە گۆڕەوە، بەڵام بەیانی چوونەوە فڕێ درابوویە دەرەوە، ووتیان ئەمە کاری محمد و هاوەڵانی بووە، ئەم هاوڕێیەی ئێمەیان دەرهێناوە لە گۆڕ و فڕێیان داوە، گۆڕێکی زۆر قوڵیان بۆ هەڵکەندەوە، بەڵام هەر فڕێیدا، ئیتر زانیان کەوا کاری کەس نییە و خۆیان ماندوو نەکرد پێوەی و فڕیاندا. موسلیم دەگێڕێتەوە کە (سلیمان کوڕی مغیرە) لە ثابت ی کوڕی ئەنەسەوەی ووتی: پیاوێکی بەنی نەجار سورەتی (البقرة) و (آل عمران)ی لە بەرکردبوو، بووبووە نووسەری پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) و، دواتر ڕای کرد و خۆی گەیاندە لای نەسرانیەکان و، بەڵام زۆری نەبرد مەرگ ملی گرت و گۆڕیان بۆ هەڵکەند و شاردیانەوە، بەڵام زەوی فڕێیدا، پاشان ناشتیانەوە هەر بە هەمان شێوە بوو، بەڵام هەر نەیدەگرتە خۆی، بۆیە وازیان لێ هێنا.

تەنانەت زەویش حەزی نەدەکرد ئەم هەڵگەڕاوە بوختانی هەڵدەبەست بە دەم پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه و سلم) نەیدەگرتە خۆی، حەزی بەم جەستە پیسە نەدەکرد، نەیگرتە خۆی و فڕێیدا، چونکە تاوانی هەڵگەڕاوان زۆر ترسناکە و، لە هەمان کات دا درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه و سلم) گەورەترە، ئەمە خراپترین سزا بوو لە سەر دنیا داو خراپترینیش لە دوارۆژدا چاوەڕێدەکات.

زۆر وورپابە گاڵتە بە سونەتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) نەکەیت و لەو بارەیەوە هەڵە و بووختان نەگێڕیتەوە.

# بەشی سێیەم: زیناکردن

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ [1]

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(اذا زنى العبد خرج منه الايمان فكان على راسه كالظلة فاذا أقلع رجع اليه)[2]

واتە: ( ئەگەر بەندەیەك زینای كرد ئیمانەكەی لێ دەردەچێت و لە سەر سەری وەك هەور دەوەستێت. ئەگەر وازی لێ هێنا بۆی دەگەڕێتەوە).

تفني اللذاذة ممن ذاق صفوتها
من الحرام ويبقى الاثم والعار
تبقى عواقب سوء في مغتبها
لاخير في لذة من بعدها النار

(ئەو لەززەت و چێژەی وەری دەگریت لە حەرام دەڕوات و تاوان و ڕیسواییەكەی دەمێنێتەوە)

(سزا دەمێنێتەوە و هیچ خێر لە و چێژە دانییە كە دواتر ئاگری لە دوایەوەیە)

یەكەم: داوێن پیس دێتەوەڕێی خۆی.

دووەم: كۆتایەكی خراپ.

سێیەم: باوەڕم پێ بكەن من دەمرم.

چوارەم: شەهوەت.

---

(١) سورة الاسراء: ئایەتی ٣٢

(٢) ابو داود و حاكم روایەتیان كردووەو ئەلبانی بە (صحیح)ی دایناوە.





# داوێن پیس دێتەوە ڕێی خۆی

بە شێوەیەکی ئاسایی گەورەبوو، زۆر بەی کاتەکانی لە نێو شەقامەکان و لەگەڵ هاورێکانیدا بە سەر دەبرد. زۆر تووڕەو هارو هاج بوو، حەزی نە دەکرد کەس لێی بدات یان جنێوی پێ بدات، ئیهانەی قبوڵ نەدەکرد و، هەمیشە حەزی دەکرد خۆی سەرۆك بێتە، هاورێ خراپەکانی پێشوازیان لی دەکرد و، کردبوویانە ئەندامێکی کارا لە کۆمەڵەی دواکەوتوو و دۆڕاو وبێ ڕەوشتەکاندا، لە لایەکی ترەوە لە بواری خوێندن دا زۆر تێك شکاو ڕووخابوو هەمیشە دەکەوت، ئەی لە نێو خێزانەکەیدا چی ڕووی دەدات، بۆ ئەم نە خۆشی و سەر گەردانەیە؟!

بارودۆخی خێزانەکەی لە و پەڕی شلۆقی دابوو، وەك کەشتیەك لە ناوەڕاستی دەریادا بەم لافاوەوە بێت و بچێت وە نەزانن چی لە دەوریاندا ڕوو دەدات، لەو پەڕی پەرتەوازەیی دابوو، باوکێکی تیا چوو نەیدەزانی چی دەکات و، جلەوی ماڵی دابوویە دەستی دایکەکەلە کاتێکدا دایکە کەسێتی یەکی لاوازی هەبوو، هیچ ئومێدێکی ڕزگاربوون و گەیشتنە ووشکانی ئارامیان نەبوو.

دوای ئەوەی لە قوتابخانە دا سەرکەوتوو نەبوو، وازی لێ هێناو بە دوایی کارێکدا گەڕا، تەنها توانی لە بورای سەربازی دا جێگەی خۆی بکاتەوە و، تیایدا مایەوە بەڵام لەبەر ئەوەی کەسێکی نالەبار بوو لە ڕووی دەروونییەوە جێگیر نەبوو، نەی توانی زۆر لە بواری سەربازیەکەی دا بمێنێتەوەو، وازی هێنا و بڕیاری دا لە کەرتی تایبەت دا کاربکات، بەڵام کەسی سەرنەکەوتوو سەرکەوتنی سەختە، هەر بۆیە هاورێ خراپەکانی ئاماژەیان پێ کرد ئاسانترین کار و زۆرترین قازانجی هەبێت بازرگانی مادده هۆشبەرەکانە، لەبەر ئەوەی هیچ بەر بەستێکی ئاینی، یان ئەخلاقی، یان کۆمەڵایەتی نەبوو بیپارێزێت لەم بیرۆکە خراپانە،هیچ لێی دوودڵ نەبو، بەڵکو خێرا دەستی بە کارەکە کرد.

کارەکەی سەرکەوتوانە بۆ چووە پێشەوە و، دەست مایەیەکی زۆری کۆکردەوە و، دەوڵەمەند بوو داوێن پیسی و کارەکانی زیاتر بوون، ئاشکرایە ماڵی حەرام لە



حەرام دا دەڕوات، خاوەنەکەی هەر بەرەو تیاچوون دەبات، ساتێکی بە فیڕۆنەدەدا بۆکاری خراپە، تەنانەت کاتێك لەماڵەوە دادەنیشت تەماشای فلیمە ڕووتەکانی دەکرد، لە ڕووی ڕەوشتەوە گەیشتە ئەو سەری و بنی بنەوە، بێ ئاین و ڕەوشت و غیرەت بوو، تەنانەت گیاندارانیش حەزیان نەدەکرد لە ڕەگەزی ئەوان بێت، بە نێو شوقەکانی بی ڕەوشتی و مەلهاکاندا دەگەڕا و هەمووو شوێنێکی قێزەونی بەسەر دەکردەوە و مەیمون و بەراز لە ڕووی ڕەوشتەوە زۆر لەم باشتر بوون.

لە یەکێك لە شەوە سوورەکاندا، بانگێهێشتی شوقەیەکی بۆگەنی کرا، سەری پێوە نەبوو کاتێك چوو یەکێك لە ئەکتەرەکان یاری بە (عودی ئاگرێك) دەکرد و، چەند سەماکەرێك لە دەوری سەمایان دەکرد و چەپڵەیان لێدەدا و پێ دەکەنین و وەك ئەوەی هەمیشە نەمرین!!

دووکەڵ لە هەموو لایەکەوە بەرز بووبوویەوە، کاسەی مەی و ئارەقەکانیان بریقەی دەدایەوە لە بەر گڵۆپەکان،خواردنەوەو لێدانی کاسەی مەی و بە خۆشیە یەکترەوە نۆشیٚ بکە لە نێو ئافرەت و پیاوەکاندا دەکرا، ئەم مرۆڤە پیس و قێزەونە پیشەی هەموو شەوێکی بوو بە سەر شوقەکانی داوێن پیسی دادەگەڕا و هەموو شەوێك کەسانی نوێ و جوانتر و سەماکەری تری دەبینی و پێی شاد دەبوو.

هەموو شەوێ تا بانگی بەیانی بەم کارانەی بەسەر دەبرد. کاتێك بانگی دەبیست.. جەستەیان نەیدەویست چونکە تازە ژیانی لێ بڕابوو، وەك شاعیر دەڵێت:

لقد سمعت لو ناديت حيا

ولكن لاحياه لمن تنادی

(ئەگەر زیندوویەك بانگ بکەیت گوێبیستت دەبێت، بەڵام چی دەکەیت لە کەسێك کە ژیانی نی یە و تۆش دەتەوێ بانگی بکەیت).

شەوێکیان بڕیاری دا بحەوێتەوەو نەچێت و ئەمشەو پشووبێت، بەڵام هاوڕێکانی لە شەیتانیان بردبویەوە لە خراپەو پیسیدا وازیان لێ نەهێناو نەیانویست تەنها ساتێك بێ تاوان بەسەرببات، بەڵام سوور بوو نەچێ، دەستیان کرد بە هەڵنانی و وەسفی کەشی و شوێنەکەیان بۆ دەکرد کە ئەمشەو زۆر گەرمە و، گۆرانیبێژێکی ناودار ئەمشەو دەیرازێننەوە کچێکی جوان و باڵا باریك و سەر سورهێنەری لەگەڵدایە

سەمای بۆ دەکات، ئەم قسانە وایان لێ کرد خێرا خۆی کۆکردوە ڕۆیشت، زۆر پەرۆش بوو بۆ ئەو کچە جوانە و دەمی هەر پێش بینینی ئاوی دکرد، هەروا بوو کچێکی لەگەڵ دابوو لەگەڵ مۆسیقاکاندا سەمای دەکرد و خۆی بادەدا و دڵەکانی گیرۆدەکردبوو و، هەمووان چاویان تێبری بوو، ئەمییش لە نووکی پێیەکانیەوە لێی دەروانی و تاگەیشتە دەم و چاوی، بەڵام کاتێك چاوی بەدەم و چاوی کەوت ڕەش داگەڕا و هیچ چاوی نەتروکاند و واقی وورما لەم شتە لە ناکاوەو، حەزی دەکرد بە هەموو دەنگی خۆی بنەڕێنێ، بەڵام نەیتوانی چونکە کاسێتی ژیانی خۆی و کارەخراپەکانی هاتە بەرچاوی و، بە خۆی دەگوت:

من هەمیشە بەکچی کەسانی ترم ڕابواردووە و، چۆنم ویستووە ڕام بواردووە و شەرمیانم پیس کردووە و خێزانەکانیانم سووك کردووە؟.... ئاژەڵێکی وەك من. پیس و چەپەڵ ئەمە بە سەر خۆمدا دێت؟!

بۆچی وا هەژا؟ ئەو کچە جوانەی بە تەمابوو ئەمشەو بیکاتە نێچیری خۆی و لە نێو ئەو هەموو پیاوە دا سەمای دەکرد خوشکەکەی بوو!! خوشکی لە دایك و باوکی.. بێ ئاگابوو لە وەی براکەی بانگهێشت کراوە تەماشای بکات و پێی رابوێرێت، لەکاتێك دا براکەشی و هاورپیەکانی ئەمەیان نەدەزانی، بەڵام هەمووو کارێك کۆتایەکی هەیە خۆش یان ناخۆش بە گوێرەی جۆری کارەکە، ئەگەر کاری چاکە بێت کۆتاییەکەی خۆشی و کاری خراپیش کۆتاییەکی دڵتەنگی هەیە ئەگەر زۆریشی پێ بچێت.

بینینی خوشکەکەی خۆی بەم شێوەیە و لەم کەش و هەوایە دا خورپەیەکی کتوپڕ و جەرگ بڕ بوو بۆی.

بەڵام خۆی گرت و نەیتوانی هیچ بڵێ تەنها بی دەنگ بوو، لە ناخەوە دەسووتاو، هیچ جووڵەیەکیشی نەکرد،کاتێك خوشکەکەی چاوی کەوتە سەری زۆر شێواو، زۆر ترسا و وای دەرخست ماندووە و هەست بە شەکەتی دەکات و بە خێرایی شوێنەکەی جێهێشت و خۆی گەیاندە ماڵەوە، ئەم برایەی هەر لەبیری ئەوە دابوو چی لە خوشکەکەی بکات، شەو نشینەکەی بەڕووکەشیانە لەوێ تەواو کرد، بەڵام مێشکی تەواو سەرقاڵ بوو هەتا شەیتان بیرۆکەیەکی پێیدا.

بۆ سبەینێ چووەوە بۆ ماڵەوەو وا خۆی دەردەخست لەو شوێنە خوشکەکەی نەبینیووە، هەتا خوشکەکەی دڵی لە خورپە و ترس دڵنیابوویەوە و وای زانی بێ



گومان ئەو ئەمی نەناسیووە و نازانێ ئەم چی کارێکی لەوێ بووە، هەتا وەکو نزیکەی یەك مانگ، تا تەواو دڵنیای کردەوە و، ڕۆژێکیان پێکەوە چوونە بازاڕ و لە گەڕانەوە دا لە ڕێگە لای داوو چووە سەر ڕێگای خۆڵ و بەرەو بیابان ڕۆیشت، خوشکەکەی پێی سەیر بوو لێی برسی بۆ کوێ دەچیت؟

وای دەرخست کەوا خۆی کارێکی لە وێ هەیە.

کاتێك گەیشتە نێوە ڕاستی بیابان دایبەزاند. لەو زەویە ڕووتە لە ڕووەك و باڵندە و مرۆڤ چەکەکەی دەرهێناو چەند فیشەکێکی نابەسەریەوەو جێهێلا بەتەنیا لەوشوێنە و چۆڵە دا گیانی بسپێرێ، پاشان خۆی گەیاندە بنکەی پۆلیس و خۆی تەسلیم کرد، کاتێك پۆلیس چووە شوێنی ڕووداوەکە بینیان ماوەی (٢٠) مەتر بەرەوشەقامە سەرەکیەکە خۆی ڕاکێشاوە، بەڵام ڕزگاری نەبووەو مردووە. دوایی پشکنین دەرکەوت دەستدرێژی نەکرابوویە سەر و نە سەلمێنراوە کەوا زینای کردبێت.

دادگا تەنها دە ساڵ زیندانی بە سەر داسەپاند[1].

بەڵام تەنها دە ساڵ وەك سزایەك بۆ ئەم تاوانبارەی ماددەی هۆشبەری دەفرۆشت و هەموو کارێکی خراپی دەکرد چ ئەنجامێکی هەبوو؟ ئەم مرۆڤە داوێن پیسە نەیتوانی دوای ئەم کارەساتەیش واز لە کارەخراپ و قێزەونەکانی بهێنێت، بەڵکو لە هەمووی خراپتر لە نێو زینداندا پەلاماری گەنجێکی داو دەست درێژی سێکسی کردە سەری، چونکە شەریعەتی لەسەر جێ بە جێ نەکرابوو، یاساکانی تری لە سەری دا جێ بە جێ کرا.

بەڵام پوختەی چیرۆکە ئەوەی گەیاند هەمووشتێك کۆتایی دەبێت، هەرچەند مرۆڤ جلەوی بۆ شل بکرێت و ماوەیەکی زۆری بۆ برخسێت و ماڵ و سامانی لە بەردەستدابێت، خودا هەر چاودێری و خۆی چی کردووە دێتەوە ڕێ و وەك قەرزوایە لای، ئەم ناموسی کچانی خەڵکی ئەتك کردووە و، لەبەردەم چاوی دا هەتکی شەرەف و ناموسی خۆی دەکرێت، کەواتە پەندی لێ وەربگرن و بزانن چی بچێنی هەر ئەوە دروێنە دەکەیت.

---

(١) لە ڕۆژنامەی (الرأي العام) (١٠٧٨٨)





## کۆتایەکی خراپ

هەموو سامان سەرووەتی تەرخات کردبوو بۆ تێرکردنی نەفسی و ڕابواردنی حەرام، هەمیشە گەشتی دەکرد و زیاتر مەبەستی ڕابواردنی حەرام بوو، خودای گەورە کاتی بۆ درێژ کردەوە تاوەکو تۆبە بکات، پەشیمان بێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە زیاتر لە خراپەکاریەکاندا ڕۆ چوو، هەموو خەمێکی تەنها گەڕان بوو بەدوایی بێ ڕەوشتی و داوێن پیسی، بی ئەوەی لە خودا بترسێ، ئەمجارەیان گەشتی کرد بۆ (بانکۆك) و ئەم گەشتەی وەك ئەوانی تر نەبوو، تێدا ئافرەتێکی ناسی و زۆر پەیوەست بوو پێوەی و وەك ژن و مێرد هەموو هەڵس و کەوتێکی لە گەڵ دا دەکرد و لەگەڵیدا ڕای دەبوارد، بە پێچەوانەوەی ئەوانی تر کە پێی ڕادەبواردن و لێیان دوور دەکەوتەوە، ئەم جارە نەی دەتوانی لێ جیابێتەوە و دەست بەرداری نەدەبوو، توانای نەبوو چاوی پێی نەکەوێت، لە بەر خاتری ئەم ئافرەتە وازی لە هەموو شتێك هێنا، نیشتمان و، کەس و کار و، پیشەکەی، لە هەمووی بایەخدارتر بە تەواوەتی ئاین و خوداکەی لە بیرکردووە نەیدەتوانی یەك سات لێی دوور بکەوێتەوە.

ڕۆژێکیان ئافرەتەکەی مۆڵەتی لێ خواست کەوا دەڕوات و کارێکی زۆر بچوکی هەیە و زۆر زوو دەگەڕێتەوە، بەڵام دواکەوت، ئەم سەر گەردان بوو، کەوتە گومانەوە ئەگەر نەیەتەوە ئەم چی بکات و؟ چۆن ژیان بەسەر بەرێت؟ ئەو چەند کاتژمێرەی وەك چەند سەدەیەك لێ ڕۆیشت، تەواو بیرکردنەوەی شێواو دڵی تەنگ بوو و، زۆر لە دڵە ڕاوکێ دابوو، بەڵام لە ناکا و دەرکەوتەوە، خۆشی بۆ گەڕایەوە و دوودڵیەکانی ڕەویەوە و، خێرا پێشوازیەکی وای لێکرد تا ئەو پەڕی نیازپاکی و خۆشەویستی خۆی بۆ ئەم بەرەڵایە بسەلمێنێ، لە خۆشیاندا کڕنوشی بۆ برد، بەڵام ئەوە کۆتاجاری بوو ئیتر هەڵنەسایەوە[1]!!

خودایە پەنا بە تۆ دەگرین و داوات لێ دەکەین جێگیرمان بکەیت لە سەر ئاینەکەت.

---

(١) لە (أخبار المنتكسين)ەوە



بەراستی کۆتاییەکی دڵتەزێن بوو، شەیتان ئەوەندە کارەکەی لە بەر چاو ڕازاندەوە تا گەیشتە ئەو ڕادەی کڕنووشی بۆ بەرەڵایەکی داوێن پیس برد و لە بری ئەوەی کڕنوش بۆ خودا و دروستکەری ببات و ئومێدی لێخۆش بوونی هەبێت، تەماحی سڕینەوەی گوناهەکانی هەبێت لای، ئەم بێ چارەیە بۆ ئەم ئافرەتەی برد کە پێش ئەم و دوایی ئەم لەگەڵ چەندەها دا ڕادەبوێرێت. بەڵام کۆتا کڕنوشی بوو و، پەنا بە خودا و، باخاوەن ئاوەزو عەقل پەندی لێ وەربگرن.

## باوەرم پێ بکە من دەمرم

خێزانەکەی هەر لە سەرەتا وە شیرازە پچڕا بوو، هیچ پەیوەندیەکی خۆشەویستی و سۆز و بەرزەیی لە نێوانیاندا نەبوو، باوکێکی دڵ ڕەقی، تووڕە و ڕژد و ڕەزیل و هیچ خەرجی ژن و منداڵەکانی نەدەکرد، دواتر بەمەوە نەوەستا و هەر جێ ی هێشتن، بەبێ ئەوەی چاودێریان بکات، دایکەی هەژار هەموو لێپرسراویەکی گرتە ئەستۆی، کڕین و فرۆشتنی دەکرد تاوەکو نانیان بۆ پەیدا بکات و خەرجی منداڵەکانی بکات.. وازهێنانی باوکەکە و سەرقاڵ بوونی دایکەکە بە پەیداکردنی ڕۆزی و خەرجی بووە کەلێن تا ئەم کوڕە بەلاڕێ دا بڕوات و، بکەوێتە شوێن هاوەڵی خراپ کە تاکە خەمیان ڕابواردن بە کچان و گەڕان بە دوایی داوێن پیسی لە شوقەکانی تایبەت بەو کارەدا و، نقوم بوو لە حەرام دا و دواتر هاوڕێکانی هانیان دا کەوا ئیتر با بڕۆینە دەرەوە و گەشتی بانکۆك بکەین چونکە لەوێ هەرچیت بوێ بە نرخێکی کەم بۆ فەراهەم دەبێت.
کوڕەی خراپەکار دەستی کرد بە پەستان خستنە سەر دایکەی بەستەزمان و، بە ناوی ئەوەی دەچێت بۆ ئەوێ لەبەر ئەوەی لە خزمەتی سەربازی ڕا دەکات، دایکی هەژار باوەڕی پێ کرد و دڵی نەرم بوو بۆی و سوودی لەم ساویلکەییەی دایکی وەرگرت؟!
فێڵی لەم ژنە هەژارە کرد و گەشتی کرد و لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ئەوەی خەونیان پێوە بینی بوو هاتە دی بۆ یان، بەڵام زۆرمایەوە تا وای لێ هات یەکێك لەو داوێن پیسانەی خواست و، کچێکی لێ ی بوو، بەڵام هەموو شتێك سەرەتایی هەبوو کۆتایشی هەیە، پارەکانی کۆتاییان هات و داوای لە دایکی دەکرد بۆی بنێرێت، هەتا ناچاری کرد دایکی قەرز وەربگرێت و بۆی بنێرێت، بەڵام ئەمەش کۆتایی هات، ئیتر لە توانایيدا نەما هیچ بۆ کوڕەکەی بنێرێت، نا چار بوو لە بێ پارەییدا بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان، بەڵام فێڵی لە ژێر سەردا بوو هیچی لە لای دایکی باس نەکرد، دایکی هەژار داوای لێ کرد لەو کچە چاکانەی وولاتی خۆی ژن بهێنێت بە بێ ئەوەی بزانێت لەوێ ئافرەتێکی بەرەڵای خواستووە.



کوڕەکە داواکەی دایکی ڕەت نەکردەوە و ئەوەی دایکی بۆی دیاری کرد بوو خواستی، بەڵام بە غەدر و فێڵ و پاش ئەوەی دەستی لە پارە گیر بوویەوە هەر لە مانگی هەنگوینی دا ژنەکەی سەرگەردان کرد و بەجێ ی هێلا، چونکە هاوشێوەی ئەمانە ناتوانن لە هەوای پاك دا بژین، بەڵکو فێری کەش و هەوای پیس و تاریکیە تاونکارەکانت کانت و هەموو پاڕانەوەکانی دایکی نایە ژێر پێ ی کە تکای لێ دەکرد نەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنە، دواتر دایکی هەموو شتێکی بۆ ڕوون بوویەوە، کەوا ئەم جگەر سۆزەی هەموو تەمەنی کردۆتە قوربانی بۆیانە نقومی خراپە و داوێن پیسیە و ژنی هێناوە لەوێ، بڕیاری دا پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنێت و گوێ خۆی لە هەموو داواکاریەکانی دەیکرد و داوای پارەی دەکرد کەڕ کرد، ئیتر باوەڕی بە بیانووە درۆکانی نە دەکرد و تەواو لەبەرچاوی ڕوون بوویەوە.

ساڵێکی پڕنەکردەوە لە دوایی بە جێهێلانی ئەو بەستەزمانە و دڵ شکانی دایکە سادەکەی تووشی ئایدز بوو، کەوتە ناو جێگا نەخۆشیەکەی هەر بە زیندوویی ڕۆژانە چەندین جار دەیکوشت، ئیتر کۆتاییەکەی دەهاتەوە بەر چاو و بە دەنگێکی پچڕ پچڕ پەیوەندی تەلەفۆنی کردو ووتی دایکە: (من دەمرم.. باوەڕبکەن.. پێش ئەوەی بمرم وەرن با بتانبینم)، بەڵام تازە کێ باوەر بە درۆزنێك دەکات، وەڵامی دایکی ئەوە بوو: تۆ درۆزنی وەك و هەمیشە و من باوەڕت پێ ناکەم ئەمەش یەکێکی تر لە فێڵەکانی تۆیە دوای چەند ڕۆژێك لە پەیوەندیە تەلەفۆنیەکەی، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەو وولاتە پەیوەندی کرد و هەواڵی پێدان کەوا جەستەی کوڕەکەیان وەربگرنەوە کەوا لە (بانکۆك)[1]ەوە بۆیان دێتەوە.
درۆکانی وای لە دایکە بە سۆز و دڵنەرمەکەی کرد دڵی ببێت بە بەرد، نەیدەزانی هەموو ڕێگایەك کۆتایی دێت، بەڵام ڕێگای چاکە خۆشبەختی دنیا و دوارۆژە و ڕێگای خراپەو نەهامەتی دنیا و دوارۆژ بە دوایی خۆیدا دەهێنێت، کەواتە چی بچێنی دروێنەی دەکەیت.

---

(١) ڕۆژنامەی (الانباء) لە بەروار ٣ / ٥ / ١٩٩٦، بەدەستکاریەوە



## شـەهـوەت

ئیمامی قور توبی دەگێڕێتەوەکەوا پیاوێك لە میسر ساڵانێکی زۆر بوو بانگدەربوو لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا دا، پیاوێك بوو بە چاکە و خواناسی باس دەکرا، دەم و چاوی پڕبوو لە نوری خواپەرستی، هەموو ڕۆژێك پێش بانگ چاوەڕێی دەکرد تا کاتی بانگ دەهات. تا ڕۆژێکیان لە وێوە تەماشایی خوارەوەی دەکرد و چاوی کەوتە سەر ماڵێکی نەسرانی کەوا نزیك بوو لە وێوە. کچی خاوەن ماڵەکەی بینی و، عاشقی بوو، وازی لە بانگدانەکەی هێنا و چوو بۆ ماڵیان.

کچەکە دەرگای کردەوە ووتی: چیت دەوێ؟!

ووتی: تۆم دەوێت.

ووتی بۆچی؟

پێ ووت تۆ هەموو دڵ و عەقڵت لێ سەندووم و من عاشقت بووم.

ووتی من وەڵامت بۆ ئەم کارە نادەمەوە.

ووتی: دەتخوازم!!

کچەکە ووتی: تۆ موسڵمان و، من نەسرانی باوکم پێت ڕازی نابێت.

پێی ووت: ئەبم بە نەسرانی.

ووتی: ئەگەر وابکەی باشە.

بوویە نەسرانی و مارەی کرد، پێش گواستنەوە چووە سەربانەکە بۆ کارێك کەوتە خوارەوە مرد!!

لە هەردوو چەژنەکە بوو، نەکچەی بەدەستهێنا و، نە ئیمانەکەی[1].

مرۆڤ چاوی گێراو لە ترسی خودا خۆی نەگرتەوە و شەرمی نەکرد بەرەو تیاچوونی دەبات، مەترسیدارە بۆی و زۆربەی جار شەهوەت باڵا دەست دەبێت

---

(١) لە (اخبار المتنسكين)



بەسەریداو لە خودا و لە خودای خۆیدادەبڕێت..
چەندەها جاربینراوە مرۆڤ بە هۆی شەهوەتەوە گومڕابووە و هیدایەتەکەی لە یاد بردۆتەوە، بۆتە مرۆڤێك لە پێستی گورگێکی شێت دا، زۆر وووریا و ئاگاداربە و، چاوەکانت لە حەرام دابخە و گوێ یەکانت لە بیستنی ئەو شتانەی بەرەو تیاچوونت دەبات بگرە...

# بەشی چوارەم: سزای تاوان

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت:

(كما لایجتبی الشوك من العنب كذلك لاینزل الفجار منازل الابرار، وهما طریقان فایهما اخذتم أدركتم الیه)

واتە: هەر چۆن بەروبوومی ترێ و دار مێو درك نابێت، ئاوەهاش چاكە كاران و خراپەكاران لە یەك پلە و شوێن دا نابن و، ئەمە دووڕێگا هەركامیان بكریتە بەر پێی دەكەیت)

رأیت الدبوب تمیت القلوب وقد یورث الذل ادمانها

وترك الذنوب حیاة القلوب وخیر لنفسك عصیانها

(بینومە تاوان كردن و گوناه دڵەكان دەمرێنێت و بەردەوام بوون لە سەر ڕیسوایی و سەر شۆڕی بە دوای خۆیدا دەهێنێت- وە وازهێنان لە گوناه و تاوان دڵەكان دەبوژێنێتەوە و تۆش وازهێنان لێی هەڵبژێرە).

یەكەم: سەتەلایت.

دووەم: لە خۆبایی.

سێیەم عەقید.



## سەتەلایت

کوڕێکی لە خوا ترس و باش بوو، خواناس و خۆ پارێز و، هەموو قورئانی لە بەر بوو، نوێژەکانی هەمووی لە مزگەوت دەکرد و، شەوانە شەو نوێژی دەکرد و، لە خودا دەپارایەوە و، ڕۆژانە ڕۆژووی سوننەتی دەگرت. هەتا ئەم ئامێرە نەهاتبووە ماڵەکەیانەوە زۆر باش بوو، بەڵام هەرچەندە وویستی ئەمی لە سەر نەبوو، بەڵکو هەوڵی زۆری دا نەهێڵێت، بەڵام زۆرینە لە ماڵەوە دژی بوون و ڕوویە ڕووی بونەوە و باسیان لە سوودەکانی بۆ دەکرد و دەیان ووت هەواڵ و ڕووداوەکانی جیهانمان پێ ڕادەگەیەنێت و، بەم شێوەیە وەك دەڵێن زۆرینە زاڵ بوو، ڕازی بوو ئەمیش لەگەڵیاندا سەیری لایەنی چاکەکانی بکات، بەم شێوەیە شەیتان لە و ماڵە دا تەنها ئەم لاوە مابوو فریوی بدات، چۆن وازی لێ دەهێنێت و کەمەندە کێشی ناکات، بە فێڵ و پیلانەکانی خۆی بۆچی ئەمیش نەبێت بە هاوبەش پەیداکەر؟ باتاقی بکەمەوە!!
شەیتان چووە بن سەری و پێ دەوت ئەم ئامێرە شتی چاك و سوودی زۆری تێدایە، بۆ سوودی لێ نابینیت و، ئەوەی باشە وەری بگرە و ئەوەی خراپە لێی دووربکەوەرەوە. ئەم بیرۆکەی پەسەندکرد، بەڵام خۆی گرت و ئارەزووەکانی سەرکوت کرد، جارێکی دی وەسوەسەی بۆ دەکردو پێی دەوت: بەرنامەکانی لەوانەیە بۆ ژیانت بە سوودبن بۆچی تاقی ناکەیتەوە؟! بڕیاری دا بیکاتەوە، بەڵام خۆزگە نەیکردایەتەوە، چاوەکانی کۆمەڵە دیمەنێکیان بینی وای لی کرد لە شوێنی خۆی جووڵەی لێ ببڕێ و سەرەتا شەرم گرتی و، بەڵام نەیتوانی بیکوژێنێتەوە، ئیتر لەو ساتەوە ناتوانێ لێی دووربکەوێتەوە، چونکە دەڵێی جادووی لێ کردووە و، چاوەکانی برد و، هەموو عەقڵی داگیر کرد، بەشێوەیەك لە نوێژەکانیدا کەمتەرخەم بوو، وازی لە نوێژی مزگەوت هێنا و ووردە ووردە لە ماڵیشەوە نوێژەکانی دەچوو و تەمبەڵی تێدا دەکرد، بەم شێوەیە بەستەزمان کەوتە نێو هاوبەش پەیداکردنەوە، لەخوا داواکارین دامەزراویمان پێ ببەخشێ و



داوای هیدایەتی لیٚ دەکەین[1].

بڵاوبوونەوەی ئەم ئامێرە لە نێو خەڵك دا بووە بە بەڵایەکی گەورە و، بووە هۆکاری بڵاوکردنەوەی کاری خراپ و، هەندیٚ کەس هەستا بە دروست کردنی و چەند بیانوویەکی بۆ خۆی هێنایەوە خەڵکی پیٚ چاو بەست کرد، بەڵام خودای بیسەر و بینەر کە تەنانەت چاوتروکانێکی خیانەتکارانە دەبینێت چاو بەست ناکات و، دەزانێت سبەینەکان چیان تێدا شاراوەتەوە، ئەی خەڵکینە وووریابن لە وشتانەی بە سادەیی دەگرن و پاشان دەکەونە نێو تەونی جاڵجاڵۆکەکانی شەیتانەوە پێی.

---

(١) لە کتێبی (أخبار المنتکسین) بە دەستکاریەوە.



## لە خۆبایی

لە یەکێك لە گوندەکانی سوریادا دەژیا، جوتیارێکی زۆر لە خۆبایی بوو بە خۆی و هێزی جەستەیی کە خودا پێی بە خشیبوو، ئەم جوتیارە شەوانە بە ڕێگەی گۆڕستانەکەدا دەگەڕایەوە ماڵ جیا لە خەڵکی گوندەکە کە ڕێگا یەکیان هەبوو هاتوو چۆیان لێ دەکرد، یەکێکیان لە دانیشتوانی گوندەکە ئەم پیاوەی ئاگادار کردەوە کەوا ئەو ڕێگەیە چۆڵە و مەترسیدارە بەشەوان، بەڵام هیچ بایەخێکی نەدایە ئەم ئامۆژگاریە دڵسۆزانەیەوە ئەوەندەی تر لە خۆبایی بوو، شانازی بەوەوە دەکرد کەوا کەس ناوێرێت لەگوندەکە ئەم نەبێت لە و ڕێگەیەوە بڕوات.

وا ڕێك کەوت جووتیارێکی گوندێك تر بە هەمان ڕێگا دا بڕوات و شەوی بە سەرداهات و، ڕێگەکە تا دەیگەیاندە لای گوندەکەی خۆی دووربوو، بڕیاری دا ڕێگەی گۆڕستانەکە بگرێتە بەر بۆ ئەوەی نزیك بێتەوە و زووبگات، زۆر بە خێرایی ڕایدەکرد تابگاتە ئەوسەری گۆڕستانە کە، بەڵام هێشتا نەگەیشتبوو چاوی کەوت بە دەروازەی ئەو سەر و چرا هەڵواسراوەکەی بینی سەیری بەرپێی خۆی نەکرد و لە خۆشیاندا ڕای کرد و ترسی نەمابوو، کەمێك لە ڕێگەکە بەولاوە ڕۆیشت و کەوتە ناو گۆڕێکەوە ئامادەکرابوو بۆ ئەوەی ئەگەر مردوویەك مرد. لە ناوی دابنێن، ئەوا ترس باڵی بەسەر داگرت، زۆری هاوار کرد و دەنگی هەڵبڕی و داوای یارمەتی کرد ئەگەر ڕێبوارێك لە وێوە بڕوات، بەڵام نەبوو، هەموو هەوڵێکی خۆی دا دەربچێت بەڵام سەرنەکەوت، چاری نەبوو تەنها ئەوە نەبێت واز بێنێت و، ئەمشەو لە نێو ئەم گۆڕە هەڵکەندراوە دا بنوێ، زۆری نەبرد لەبەر ماندووبوونی و شەکەتی ڕۆژ خەوبردیەوە و نووست.

پاش ماوەیەکی کەم کابرای لە خۆبایی کە هەموو شەوێ بە ناو گۆڕستانەکە دا دەڕۆیشت، وەك هەمیشە بەبێ ترس بەڵام ئەم جارە قەدەر ویستی بوو کەوتە نێو هەمان چاڵەوە کە کابرای تری تێدابوو، هەستی کرد دڵی کەوتۆتە خوارەوە پێش خۆی، ئەمجارەیان وەك جارەکانی تر چاونەترس نەبوو شپرزە بوو هەموو





هەوڵێکی دا بۆ خۆڕزگارکردن، لەم کاتەدا کابرای تر خۆی گر مۆڵە کردبوو لە قوژبنێکدا خەبەری بویەوە و چرپاندی بە گوێ دا و ووتی: پێش تۆ من هەوڵم زۆردا بەڵام بێ سوود بوو، با ئەمشەو پێکەوە لێرە بمێنینەوە. هێشتا قسەکانی تەواو نەکرد بوو جوتیاری لە خۆبایی لە ترساندا کەوت و مرد، وای زانی مردوو قسەی لە گەڵ دەکات[1].

بەم شێوەیە ئەگەر چی زۆریشی پێ بچێت، کەسی لە خۆبایی و خۆ بە گەورەزان کۆتاییەکی چاوەڕواننەکراوی دەبێت، بۆیە نابێت مرۆڤی بە هێز و سامان دارو پارە و پلە و پایە دار پایەی لە خۆی دەربچێت، چونکە هەرکەس لە بەر خاتری خودا خۆی بەکەم بزانێ خودا بەرزی دەکاتەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: (بينما رجل يمشي في حلة تعجبة ونفسه مرجل جمته إذ خسف الله به الارض، فهو يتجلجل فيها يوم القيامة)[2].

واتە: (کاتێك یەکێك بەسەر زەوی دا خۆی ڕازاندۆتەوە و لە خۆی ڕازی یە دەست بە قژەکانی دەهێنێت، چی دەکات ئەگەر خودا بە ناخی زەویدا بیبات و، ئەو هەتا ڕۆژی دوایی تێدابمێنێتەوە).

---

(١) لە (الكشكول الصغير) بە کەمێك دەستکاریەوە.

(٢) موسلیم و بخاری گێڕاویانەتەوە.



## عــەقــیــد

لیوا ڕوکن محمود شیت دەگێڕێتەوە کەوا: بارو دۆخی تەندروستیم ناچاری کردم بچمە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی بەیروت، تاوەکو هەندێ پشکنینی پزیشکیم بۆ بکەن لە هاوینی ساڵی ١٩٧٢ز دا، ئەو نەخۆشانەی کەوتبوونە بەشەکەی منەوە هەندێ ئەفسەری پلە دار (چابگ)ی خانەنشین کراوە و هەیانبوو گەنجییش بوو، منیش ئاشنایان بووم و سەرم لێ دەدان و دڵنەواییم دەکردن و دیاریم بۆ دەهێنان، گەورەترین دەسکە گوڵم نارد بۆ ئەوەیان کە شەوانە خەوی نەبوو نەشی دەهێڵا کەس بخەوێ، پرستارەکە لێی پرسیم: (ئایا پێشتر دەتناسی؟)

ووتم: نەخێر، بەڵام ناخەوێ و ناهێڵی منیش شەوانە بنوم. لەبەر هاوار هاوار.. بەڵکو چیتر بەزەیی بە خۆیدا بێتەوە و کەمێك لەپەرستارەکەوە زانیم کەوا چەند مانگێکە لێرەیەو،نەخۆشێکی هەمیشەیی یە لەنەخۆشخانەکەدا، بەزەیشی بۆ من هەبێت لە دوایی وەرگرتنی دیاریەکەم).

تەنها چەند ڕۆژێك نەبێت لە نە خۆشخانە دەرناچێت، لەوکاتەدا دەچێتەوە بۆ ناو کەس و کاری و پاشا دێتەوە دایدەکوتێ، چوومە سەردانی عقیدەکەو، پێیان دەووت (کۆلۆنێك)، ئەفسەرێکی پلەداری دێرین بوو لەگەڵ پۆلیسی فەرەنسی دا کاری کردبوو ئەو کاتەی لبنانیان داگیرکردبوو.

ئەوەی لە جەستە بدا بە ساغی مابویەوە عەقل و یادەوەری بوو، دڵیشی لێی دەدا، ئەمە هەمووشتێك بوو.

لەو نەخۆشیانەی تووشی هاتبوو، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و، شەکرەو، ڕق بوونی دەمارەکانی دڵ و ژەهراویبوون لە خوێن داو، سست بوونی جگەر و گورچیلەکان وە گوشتی پێوە نەمابوو، بە ڕۆژویان دەزانی ئیتر چاك بۆتەوە، بەڵام شەو دەکەوتەوە ناڵە ناڵ دەتگووت ئیتر چەند کاتژمێرێکی دی ناژی!!شەوانە جارێك لە ئاوان و ئازارەکانی دەیناڵاندو، جارێکی دی هاواری دەکردە پەرستارەکان فریای بکەون، کاتێك دەهاتنە سەری تەماشایان دەکرد





داواکاری نییە، ئیتر تا بەیانی دووجار و سێ و چوار بانگی دەکردنەوە، هەموو شەوێکی بەم جۆرە بەرێ دەکرد، دەنگی بەس نەبوو بۆ هاوار هاوار دەستی دەخستە سەر دوگمەی زەنگی کارەبایی و داوایی یارمەتی دەکرد. تەنانەت دوایی هاتنی پەرستاریش دەستی لانەدەبرد لە سەری.

چوومە سەردانی و دڵی پڕبوو پاش ئەوەی کەوتینە قسە و باسە وە دەستی کرد بە گێرانەوەی چیرۆکی ژیانی ووتی:

لە ناو پۆلیسی فەرەنسی دا کارم دەکرد و، پلەی کۆڵۆنێلم هەبوو، پۆلیسی ناوخۆم بەرێوەدەبرد، هەموو بەیروت لێم دەترسا، کاتێك ناوم بهێنرایە ئازا ترین کەس دەتۆقی، فەرەنسیەکان متمانەی تەواویان پێم هەبوو، لە کارەکانیان دا تەواو پشتیان پێ بەستبووم، منیش لەو پەڕی دڵسۆزی دا بووم بۆیان، ئەگەر گیریان بەدەست هەر تاوانبارێکەوە بخواردبایە و دانی بە هیچ دا نەنایە، خۆم بۆم چارەسەر دەکردن، جۆرەها ئەشکەنجە و سزام لە سەری تاقی دەکردەوە، ئیتر یەکسەر دەڕووخان و دانیان بەوەدادەنا کەمن یان فەرنسیەکان دەیان ووسیت، ئیتر ڕاپێچی دادگا دەکران و سزای خۆیان وەردەگرت.

دەستی کرد بە گێڕانەوەی هەشتا و چوار جۆر ئەشکەنجەدان کە بەکاری هێناوە، لە کاتی گێرانەوەیدا موچرك بە هەموو جەستەمدا دەهات لەبەر دڕاندایەتی گێڕانەوەکەیش دەیترساندم.پاشان ووتی: ئەمەی ئەمڕۆ دەیچێژم سزای ئەشکەنجەی خودایە بۆم، چونکە بە هۆی لێدان وئەشکەنجەکانمەوە چەندەها کەسی چاکەکارم ئەشکەنجەداوە، تەنها بۆ ڕازی کردی فەرەنسیەکانی ئاغام.

فەرەنسیەکان ڕۆیشتن و، نەگبەتی و نەفرینەکان بۆ عقید بەجێ ما، تەنانەت ژن و منداڵەکانی و خزمەکانی خۆشیان نەدەویست و بە ئاواتی مردنی بوون، چونکە ئەم هاوار هاوارەی ئەشکەنجەی دەدان و بەڵکو لە پێش هەموویانە خۆی ئازاردەدا زیاتر لە کەسانی تر.

قوربانیەکان شەوان ئەشکەنجەی دەدان، ئەمڕۆ خودا بە شەو ئازاری دەدا، لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاردا ئەندامەکانیان دەڕزا، وا ئەمڕۆ ئەندامەکانی خۆیشی یەك لە دوایی یەك لە کاردەکەوێت و، تەنها زمانی ساغە بۆ ئەوەی باسی ئەو کارە تاوانکاری و قێزەنانەی پێ بکات کە کردوویەتی و، یادەوەری بە ساغی بۆ هێشتۆتەوەتا وەکو تاوانەکانی خۆی بۆ خەڵك پێ هەژماریکات، عەقڵی ماوە

تاوەکو هەمیشە پەشیمانی بکێشێت و یادی ئەو کاتانەی پێ بکاتەوە، دڵەکەشی لە لێدان ناکەوێت تاوەکو ئەو ئازارەی خودا لە دنیادا بۆی داناوە بەسەریدا بدات و ئەبێ سزای دوارۆژی چەند توندتربێت[1].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت: (لايزال العبد في فسحة من دينه مالم يصب دما حرما)[2].

(بەندە هەر ماوەی لەبەر دەمدا ماوەو بۆی درێژ دەکرێتەوە هەتا ئەوکاتەی خوێن بە حەرامی و ناحەق دەڕێژێت).

ئەشکەنجە دانی بێ تاوانان و، دەست درێژی کردنە سەریان بەبێ حەق ستەمێکی گەورەیە و، خودا تۆڵەی ئەوەبێ نەوایانە دەکاتەوە لە خوێن ڕێژ و ملهوران لە دنیا و دوارۆژدا، ئەم چیرۆکە واقیعییە پەندێکە بۆ کەسانی خاوەن عەقڵ، ئایا کەس پەندی لێ وەردەگرێت؟!

---

(١) لە (عدالة السماء)وە ل ٧٤-٧٧.

(٢) احمد و بخاری ڕیوایەتیان کردووە.

# بەشی پێنجەم: چاك بوون لەگەڵ دایك و باوك دا

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾[1].

پێغەمبەری خوا دەفەرموێت:

(رغم انفه، ثم رغم انفه، ثم رغم انفه، قيل من يا رسول الله ؟ قال: من أدرك والده عند الكبر احدهما أو كليهما ثم لم يدخل الجنة)[2].

واته: (لوتی بە قوڕدا چەقێ، ئینجا لوتی بە قوڕدا چەقێ، ئینجا لوتی بە قوڕدا چەقێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! کێ ؟ فەرمووی: هەر کەسێ لە کاتی گەورە بوونیدا یەکێ لە دایك و باوکی، یان هەردوکیانی لەلابێ بەشێوەیەك خزمەتی وایان نەکات کە پێی بچێتە بەهەشتەوە)

یەکەم: پاداشتی چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا.

دووەم: باشترین عەرەب بۆ دایك و باوکی.

سێ یەم: ئەویسی قەرەنی ڕەزای خوای لێ بێ.

---

(١) سورة لقمان: ئایەتی (١٤)

(٢) موسلیم ریوایەتی کردووە



## پاداشتی چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوك

چوار کوڕی هەبوو، نەخۆش کەوت، یەکێك لە کوڕەکانی ووتی: دەبێت ئێوه خزمەتی بکەن و بەخێوی بکەن و هیچیش لە میراتەکەی نەبەن، یاخود من بە خێوی دەکەم و خزمەتی دەکەم و، هیچ لە میراتەکەی، نابەم !!
ووتیان: خۆت خزمەتی بکە و میرات مەبە.
هەتا مردن خزمەتی کرد، دڵسۆزانە هەروەك چۆن جاران باوکی بە منداڵی بۆ ئەم دەسووتا، پاشان مردوو هیچیشی لە میراتەکەی نەبرد.
چەند شەوێك بەسەر مردنی باوکی تێپەڕی و، پیاوێ هاتە خەوی و پێ ووت: بچۆ بۆ فڵان شوێن سەد دیناری لێ یە بیبە بۆ خۆت.
کوڕەکە ووتی: ئایا ئەو پارەیە بە بەرەکەتە؟ ووتی: نەخێر.
خەوەکەی بۆ ژنەکەی گێرایەوە و ژنەکەی ووتی: بەرەکەتی بۆ چی یە، بەرەکەتی ئەوەیە خۆمانی پێوە پۆشتە بکەینەوە و پێ بژین، بەڵام بە دوایی دانەچوو.
دواتر هاتەوەو خەوی و پێ ووت بچۆ بۆ فڵان شوێن دە دیناری لێ یە بۆ خۆت.
کابرا پێ ووتەوە: ئایا بەرەکەتی تێدایە؟ ووتی: نەخێر.
دوبارە گێرایەوە و بە قسەی ژنەکەی نەکرد و نەچوو.
شەوی سێ یەم خەونێکی لەو جۆرەی بینیەوە بەڵام ئەمجارە ووتی بچۆ بۆ فڵان شوێن یەك دینار وەربگرە.
لێ پرسی بەرەکەتی تێدایە؟ ووتی: بەڵێ؟
سبەینێ زوو چوە شوێنەکەو دینارەکەی وەرگرتوو بردی بۆ بازاڕ، تەماشای کرد پیاوێك دوو ماسی پێ یە؟ لێ پرسی بە چەندە؟ ووتی: بە یەك دینارن.
هەردووکیانی کڕیء بردیەوە و بۆ ماڵەوە، لە دوای چاکردن و لەت کردنی لە هەریەکێکیاندا پارچە مرواریەکی تێدابوو، بێ وێنە بوو!!
خودا وای ڕەخساند لەو کاتەدا دەسەڵات داری ووڵات ناردبووی مرواری بۆ بکڕن، زۆر گەڕان، تەنها لەلای ئەم پیاوە هەبوو کە بۆ باوکی زۆر باش بووبوو،





بە سێ هەزار دیناری ئاڵتونی فرۆشتی.

کاتێك چاوی پێ کەوت بێ وێنە بوو، دەسەڵاتدار ووتی: ئەمە دەبێت تاکێکی تری هەبێت تەنها بەو هاوشێوەی تریانەوە بەکەڵك دێت بچن ئەوەی ترم بۆ بکڕن تەنانەت ئەگەر نرخەکەی دووئەوەندەش بێت.

چوونەوە بۆ لای لێیان پرسی ئایا دانەیەکی ترت لێی هەیە، ووتی بەڵێ، دووئەوەندە پارەت بۆ دادەنێن بۆمان بهێنە و پێ فرۆشتن[1].

بڕوانە فەزڵی خودا بەسەر ئەم کابرایەی نانی ئەو ڕۆژەی نەبوو بیخوات، خودا چ ڕۆزیەکی بەسەری دا باراند، سامانێکی بێ شومارو هەموو بەهۆی ئەوە بوو زۆر بێ تەماحانە باوکی بە خێو کردوو لەو نەخۆشیدا پشتی لێ نەکرد، چاك بوون لەگەڵ دایك وباوکدا دەبێتە مایەی خێرو خۆشی دنیا و پادشتێکی زۆر گەورە لە ڕۆژی دوایی دا.

---

(١) لە(سمیر المؤمنین)، بەدەستکاریەوە.



## باشترین عەرەب بۆ دایك و باوكی

ئەصمەعی دەڵێت: پیاوێكی دەشتەكی بۆی گێڕامەوە و ووتی: لە شارەكەی خۆم چوومە دەرەوە دەگەڕام بزانم باشترین كەس كێ یە بۆ دایك و باوكی، گەیشتم بە گەنجێك شتێكی گەورە وەك زەمبیلە كردبوو ملی و پیرە پیاوێكی تێدابوو وەك بەچكەی باڵندەیەلەبەردەم خۆیدا دابنابوو وەك بێچوو خزمەتی دەكردو خواردنی دەكرد بە دەمیەوە.

ووتم: ئەمە چی یە؟!

ووتی: ئەمە باوكمە خەڵەفاوە و من بەخێوی دەكەم.

ووتم: ئەمەیە چاكترین عەرەب بۆ دایك و باوكی[1].

ئەم گەنجە و بەم تەمەنە كەمیەوە گەیشت بەو پلەو پایەی كە باوكی خزمەت بكات و خواردنی پێ بدات لەكاتێك دا پیرە پیاو لەتەمەنێكی زۆر دابوو و هیچ هۆشی لە خۆی نەبوو، بێ گومان پاداشتی كارە چاكەكەی لە دنیاو دوارۆژدا وەردەگرێتەوەو پاداشتی چاكەكەران نافەوتێنێت، بەتایبەتی چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك دا!!

---

(١) لە(المحاسن والمساويء)





## ( ئەویس ی قەرەنی ڕەزای خودای لێ بێ

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت: (إن خير التابعين رجل يقال له: أويس وله والدة هو بها بر، لو أقسم على الله لأبره، وكان به بياض، فمروه فليستغفرلكم)[1].

((واتە: باشترین شوێنەکەتوان پیاوێکە پێ دەوترێت: ئەویسی قەرەنی، پیرەدایکێکی هەیەو ئەو زۆر لەگەڵی باشە،

لە دوایی ئەم فەرموودەیە ئیمامی عومەر کاتێك هەرکاروانێ لە یەمەنەوە دەهات لێی دەپرسین: ئەویسی کوڕی عامرتان لەگەڵدایە؟ هەتا دۆزیەوەو،

ووتی: تۆ ئەویسی کوڕی عامریت؟

ووتی: بەڵێ

ئیمامی عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی: (يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد اليمن من مراد من قرن، كان به ابرص فبرامنه الاموضع درهم، له والدة هوبار بها، لوأقسم على الله لأبره، فان اسطعت ان يستغفر لك فأفعل)

واتە ( ئەویس کوڕری عامر لەگەڵ کاروانیەکانی یەمەن دادێت لە مرادەوە پاشان لە قەرن، شوێنەواری بەڵگەکی پێوەیە کە خودا چاکی کردۆتەوە و تەنها بەقەدەر درهەمێکی پێوە ماوە، دایکێکی هەیە و ئەو زۆر بۆ دایکی باشە ئەگەر هەر داوایەك لە خودا بکات بۆ جێ بە جێ دەکات، ئەگەر پێی گەیشتین داوای لێ بکەن داوای لێخۆش بوونتان لە خودا بۆ بکات)، ئێستا داوات لێ دەکەم داوای لێخۆش بوونم بۆ بکەی، ئەویش کردی.

پاشان ئیمامی عومەر پێ ووت: بەتەمای بچیت بۆ کوێ؟

ووتی: کوفە

---

(١) موسلیم ڕیوایەتی کردووە



ئیمامی عومەر ووتی: ئایا نامەت بۆ بنوسم بۆ سەرکاری ئەویٚ؟
ووتی: نەخێر پێم خۆشە لە نێو هەژارانی شارەکەم دابم.
ئەویس ڕەزایی خوای لێبێ زۆر حەزی دەکرد، بێتە خزمەت پێغەمبەر خودا (صلی الله علیه و سلم) بەڵام لەبەر ئەوەی خزمەتی دایکی دەکرد نەیتوانی ء بەردەوام خزمەتی کرد هەتاوەکو کۆچی دوایی کرد.
چاکە کرد ن و خزمەتکردنی داك و باوك پاداشتەکەی زۆر مەزنە، بە تایبەتی لە پیریدا و دایکیش بە تایبەت تر. ئەم ئەویسیە تەنها بەو هۆیەوە گەیشتە بەو پلەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) پێشبینی هاتنی بکات و هان هاوەڵەکانی بدات و داوای لیٚ بکەن داوای لێخۆشبوونیان لە لای خودا بۆ بکات، ئەمەش عومەرە لەم لاوە، دووەمین خەلیفەی ئیماندارانە و یەکێکە لەو دەکەسەی مژدەی بەهەشتی پێدراوە چاوەڕیٚ دەکات و چاودێری کاروانەکانی یەمەن دەکات و بە دوایی ئەویس دادەگەڕی تاوەکو داوای لیٚ بکات داوای لێخۆشبوونی لەلای خودا بۆ بکات، ئەم کارە مەزە نەچی بوو ئەوەندە لە لای خودا پایەداری کرد! تەنها چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکدا، خودای گەورەیش گوێڕایەڵی دایك و باوك دەبەستێتەوەبە پەرستنی خۆیەوە:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾[1].

(١) سورة الاسراء: أية ٢٣.

# بەشی شەشەم: خێرکردن

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوۡ نَذَرۡتُم مِّن نَّذۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُهُۥۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٍ﴾[1].

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت:

(صنائع المعروف تقی مصارع السوء والافات والهلكات، وأهل المعروف فی الدنیا هم أهل المعروف فی الاخره)

واتە: (کاری خێرو چاکە لە شوێنی کەوتنی خراپە و بەڵاو ناخۆشی مرۆڤ دەپارێزێت و، خەڵکانی چاکە کار لە دنیا هەر کەسانی چاکە کارن لە ڕۆژی دواییدا)

یەکەم: کابرای کولێرەکە.

دووەم: یەك درهەمی کردە خێر خودا سەد و بیست هەزاری باراندبەسەریدا.

سێیەم: کاری چاکە مرۆڤ لە شوێن کەوتنی خراپە دەپارێزێت.

چوارەم: بەرهەمی خێرکردن.

---

(١) سورة البقرة: أية ٢٧٠.



## کابرای کولێرەکە

ئەبی بردە دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێك ئەبو موسی لە سەرە مەرگ دابوو بە منداڵەکانی ووت: رۆڵەکانم کابرای کۆلێرەکە هەمیشە لە یادتان دابێت، پیاوێك بوو حەفتا ساڵ لە خلۆەتگەکەیدا خوداپەرستی کرد، تەنها یەك رۆژی هەبوو دەهاتە دەرەوە، چونکە لەگەڵ ئافرەتێك دا کە ئاشقی بوو، یاخودشەیتان خۆی کردە شێوەی ئافرەتێکە وەبۆی و ئەمیش عاشقی بوو حەوت ڕۆژیان حەوت شەو لەگەڵیدا بوو، پاشان کە پەردەی لەسەر لابرد بینی پیاوە، هاتەدەرەوە تۆبەی کرد و پەشیمان بویەوە، ئیتر هەموو هەنگاوێکی نوێژ و سوجدەبردن بوو، شەوێکیان ڕێگەی کەوتە دوکانێك دوانزە هەژاری تێدابوو، گوێ لە لورە لورو دەنگە دەنگ بوو خۆی کرد بە نێوان دووپیاویاندا، ئەمانە راهیبێك هەبوو هەموو شەوێك یەکی کۆلێریەکی بۆ ئەم هەژارانە دەنارد، پاشان لە لای ئەم تۆبە کارەوە ڕۆیشت و دوای زانی هەژارەو کولێرەیەکی پێداوە، پاشان یەکێکیان کولێرەی بۆ نەما، ئەوەی بەشی نەمابوو ووتی: بۆچی کولێرە بەمن نادەیت؟!

ئەوەی دابەشی دەکرد ووتی: سوێند بە خوا ئەمشەو هیچت پێ نادەم.

تۆبەکارەکە هەستاوە کولێرەکەی خۆی دایە ئەوپیاوە هەژارە، لەگەڵ ئەوەی زۆری پێویستی بوو برسی و هیلاك بوو پیان نەدا.

پیاوە تۆبەکارەکە مرد و، حەفتاساڵەکەیان بۆ کێشا بەرانبەر حەوت شەوەکە، تاوان حەوت شەوکە قورس بوو، بەڵام کولێرەکە خرایە کێشانەوە کولێرەکە قورستر بوو.

ئەبو موسی ووتی: ڕۆڵەکانم ئەم کابرای کولێرەتان لە یادبێت.

چونکە خێرکردن تووڕەیی خودا دەکوژێنێتەوە، خێرا سامان لە ڕێگەی خودا دابەخت بکەن و، بزانن کەوا دنیا کۆتایی دێت و تەنها ئەوەی دەیکەیتە خێر دەمێنێتەوە لەلای خودا و لەوێ هەرچیەکمان پێش خۆمان داوە دەیبینینەوە، بەڵام ئەگەر لە هەژاری ترساین و ووتمان خۆمان پێویستمانە و ڕژدیمانکرد ئەوا لەودنیا دەبێت بەحەسرەت بۆمان.



## یەك درهەمی كردە خێر و
## خودا سەد وبیست هەزاری باراند بەسەری

لە فضیل كوڕی عیاج ەوە، ووتی: پیاوێك بۆی گێڕامەوەو ووتی: پیاوێك چنراوێكی برد و بە یەك درهەم فرۆشتی، تاوەكو ئاردی پێ بكڕێت، دای بەلای دووپیاو دا یەخەی یەكیان گرتبوو شەڕیان دەكرد.

ووتی: ئەمە چییە؟

ووتیان: لەسەر یەك درهەم شەڕیانە، ئەویش درهەمەكەی پێ دانە خۆی ئیتر هیچی پێ نەما، گەڕایەوە ماڵەوەو بەسەر هاتەكەی بۆ ژنەكەی گێڕایەوە، ژنەكەی هەندێ شتی لە ناو ماڵەكە دا بۆ كۆكردەوە تا بیبات بیفرۆشێت، بەڵام شڕە بوو كەس پارەی پێ نەدا و مایەوە، كابرایەك ماسی دەفرۆشت ماسیەكی مابوویەوە بۆنی تێك چووبوو.

ماسیگرەكە ووتی: تۆ شتێكت پێیە خراپە و، منیش شتێكم پێیە خراپە، بۆچی ئەوانەم بەم ماسیە پێ نافرۆشیت؟ كابرا لە ناچاریدا ماسیە بۆگەنەكەی بردەوە بۆ ماڵەوە وبە ژنەكەی ووت: هەستە چاكی بكە، خەریكە برسیەتی لەناومان دەبات، ژنەكە دەستی كرد بە پاككردنی و ماسیەكەی شەق كرد، مرواریەكی تێدابوو، ژنەكە هاواری كرد و ووتی: شتێكی تێدایە تۆزێك لە هێلكەی مریشك بچوكترە و بە قەد هێلكەی كۆترێكە.

ووتی: پیشانم بدە، تەماشای كرد بەڵام لە ژیانی دا مرواری نەدی بوو، لە خۆشیاندا جێگەی بەخۆی نەدەگرت بە ژنەكەی ووت: لەوانەیە مرواری بێت.

ژنەكە ووتی: دەزانی مرواری بەچەندە؟!

كابرا ووتی: نەخێر بەڵام كەسانێك دەناسم چاكی لێك جیادەكەنەوە.

پاشان بردیە لای هاوڕیەكی دوكانی خشڵی هەبوو، پاش سڵاو چووە تەنیشتیەوەو مرواریەكەی دەرهێناو پێی ووت نرخی ئەبێت چەند بێ؟

هاورێكە ووتی ئێستا من چل هەزارت پێ دەدەم، بەڵام ئەگەر زیاتر داوابكەی بڕۆ بۆلای فلان هاوڕێم ئەو ئیشی زیاتری پێی هەیە.



گەیاندیە لای کابرای تر و زۆر لەلای جوان بوو، هەشتا هەزاری بۆ دانا و پێی ووت ئەگەر زیاترت دەوێت برۆ لای فلان کەس.

چووە لای دوکانداری سێیەم و سەد وبیست هەزاری پێ داو پێی ووت کەس ناناسم بتوانێت لەمە زیاترت پێبدات.

کابرا بە دڵێکی زۆر خۆشەوە پارەکەی هێنایەوە بۆماڵ. کاتێك کە گەیشتە ماڵ هەژارێك لە دەرگاکەیانی دەدا و داوای سواڵی دەکرد، ئەمیش چیرۆکی خۆی و هەژاریەکەی بۆ گێڕایەوە پێی ووت: وەرە نیوە ئەم پارانە ببە و یەکجار لە هەژاری رزگار بە و چیتر سواڵ مەکە.

هەژارەکە نیوەی پارەکەی برد و پاش ماوەیەك گەڕایەوە، بە کابرای ووت: من هەژار و سواڵکەر نیم تەنها خودا ناردمی تاوەکو تۆ تاقی بکاتەوە کە بە یەك درهەم سەد و بیست هەزاری بۆناردی، بەم کارەت خودا بەشێکی پی داویت و نۆ بەشی بۆ هەڵگرتوویت[١].

پاداشتی کاری چاکە و بەزەیی هاتنەوە بە هەژاران و خۆشەویستی خێرکردن زۆر مەزنە و سەرکەوتنێکی بێ وێنەیە و بە کەم سەیر ناکرێن، ئەگەر چی خێرەکە زۆر سادەش بێت نابێت بە کەم بگیرێت، موسڵمانی راستەقینە ئەو کەسەیە خێر و چاکەی بۆ موسڵمانانی تر دەوێت.

---

(١) زاد المتقين.





## کردەوەی چاکە و چاکە کردن
## مرۆڤ لە شوێن کەوتنی خراپە دەپارێزێت.

ئافرەتێکی زۆر لەخواترس و چاکە کار بوو، هەمیشە حەزی بە کاری چاکە دەکرد و خێر و بە خشینی بێ شوماربوو، بە دوایی هەژاران دادەگەڕا و هەمیشە لە بارو دۆخیان دەکۆڵیەوە، زمانی بەردەوام پاراوبوو بە یادی خوداو، زۆر زۆر لە ئاگری دۆزەخ دەترسا، ئەگەر لە لایەکدا باسی لێوە بکردایە دەتۆقی و بەدڵ تکای لە خودا دەکرد ڕزگاری بکات و، زۆر بە پەرۆشەوە کاری دەکرد بەهەشت بە دەست بهێنێت، لەکاری خێردا بچوك و گەورەی نەدەبوارد و دەیکرد، لە ناوکاو ڕانەکانی تووشی ئازارێك هاتن و زۆر ئارام بوو لەسەر ئازارە کانی بەڵکو خودا چارەی بکات، بەڵام ئازارەکەی هەر لە زیادبوون دا بوو، هاوسەرەکەی بردی بۆ لندن دوای ئەوەی لە هەموو نەخۆشخانەکان بێ ئومێد بوو، لەوێ دوایی پشکنین و شیکردنەوەکان بۆیان دەرکەوت شێرپەنجەیەو دەبێت بە زووترین کات ببرێتەوە، هەروەها هەموو قاچەکە دەبێت ببڕدرێتەوە نەوەکو بگوێزرێتەوە بۆ بەشەکانی تری.

ژووری نەشتەر گەری بۆ ئامادەکراو پزیشکەکان لێی کۆبوونەوە، هەرکاتێك موسەکەیان دەکردە نێو مقەستەکە دەشکا و، هەموان بێ دەنگ دەبوون و چەند جارێك ئەم کارەیان دووبارە دەکردەوە هەر دەستیان لە مقەستەکە دەدا موسەکە دەشکا، پزیشکەکان دوودڵیەکی سەیر بە ڕووخساریانەوە دیاربوو، کەوتنە ڕاوێژکردن کەوا قاچەکە نەبڕنەوە، بەڵکو نەشتەرگەری بۆ قاچەکە بکەن و هەڵی بدڕن، ئای چەند سەرسورهێنەربوو، هەر کە گەیشتنە نێو گۆشت تەماشایان کرد لەفافی بۆگەنی تێدایە و، دوایی کەمێك شوێنەکەیان پاك کردەوە و ئافرەتەکە هاتە هۆشی و هیچ ئازاری ڕانی نەمابوو.

ئافرەتەکە تەماشایی کرد قاچی نەبڕاوەتەوەو، پزیشکەکان پرسیاریان لە هاوسەرەکەی دەکرد، کە ئایا پێشتر هاوسەرەکەی لەم شوێنەدا نەشتەرگەری بۆ کراوە؟

ووتی: بەڵێ لەکارەساتی ئۆتۆمبێل دا ئەم شوێنەی زۆر خراپ بریندار بووە و نەشتەرگەری بۆ کراو.

پزیشکەکان هێشتا هەرسەرسام و حەپەسابوون و ووتیان: بەڕاستی ئەمە دەستی خوداییە و خودا ئاگای لێی بووە.

ئەو خۆشیەی ئەم ئافرەتە هەستی پێکرد دوایی ئەوەی هۆشی هاتەوە و قاچی نەبڕابووەوە وەسف ناکرێت، بە چاوی خۆی بینی خودا چۆن ڕزگاری کرد دوایی ئەوەی خەریك بوو قاچی بە تەواوی لە دەست دەدا، بەڵام خودا پاراستی و زیاتر سوپاسگوزاری خۆی بۆخودا دەردەبڕی و زیاتر هەستی دەکرد بە نزیکی و سۆزو ڕەحمەتی خودا بەسەریەوە چەند گەورەیە[1].

هەرکەسی لەکاتی خۆشی و هەبونی دا خودای لە یادبێت لەکاتی تەنگانەدا خودا ئەو لەیاد ناکات و دەرووی لێ دەکاتەوەو لە هەموو ناخۆشی و خراپەیەك دەیپارێزێت، ئەم ئافرەتە خێری دەکرد و دەیبەخشی و بەندەیی بە بەندەکانی خوادا دەهاتەوە، خوداش بەرەحمەتی خۆی داپۆشی و، ئەوانەی بەڕەحم و بەوەیین خودا بەزەینخودا بە زەیی پیایاندا دێتەوە، خودا لە یارمەتی ئەوانە دایە کە بە هانای بەندەکانیەوە دەچن.

---

(١) لە (زاد المتقين)، بە دەستکاریەکی کەمەوە.





## بەرهەمی خێرکردن

ئیمامی ئیبن ئەبی دنیا دەگێڕێتەوە کەوا: پیاوێك پێغەمبەر(صلی الله علیە و سلم) هاتە خەونی و پێی ووت: (بڕۆ بۆ بەغداد و بەو مەجوسیە ئاگر پەرستە بڵێ: نزاکە گیرابوو).

بۆ بەیانی بە خۆمم ووت: چۆن من بگەم بەو مەجوسیە؟! شەو نووستمەوە و هەمان خەوم بینیەوەو پاشان بۆ شەوی سێیەمیش، لە بەیانیدا خۆم کۆکردەوەو بەرەو بەغداد ڕۆیشتم و ئەو مەجوسیەم دۆزیەوە، بەڵام پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و لە خۆش گوزەرانیەکی بێ وێنەدابوو، چوومە لای و سڵاوم لێ کرد و دانیشتم.

ووتی: کارێکت هەیە؟

ووتم: بەڵێ.

ووتی: بیڵێ.

ووتم: کارەکەم بە تەنیا پێت دەڵێم، ئەویش خەڵکەکەی هەستاند و تەنها هاوەڵە نزیکەکانی مانەوە.

پێم ووت: ئەی ئەمانە، ئەوانیشی کردەدەرەوە و پاشان ووتی: بڵێ.

ووتم: من نێردراوی پێغەمبەری خودام (صلی الله علیە و سلم) بۆ لای تۆ وە ئەوپێت دەڵێت: نزاکەت گیرابوو.

ووتی: من دەناسی ووتم بەڵێ

ووتی من باوەڕم بە ئیسلام نییەو، باوەڕیشم بە پەیامی محمد (صلی الله علیە و سلم) نییە.

ووتم: هەر بەو شێوەیەی ووتم و ئەو ناردمی بۆلات.

ووتی: بەڕاستی تۆی نارد؟! ووتم بەڵێ.

ووتی: کەواتە شایەتی دەدەم کە لاالە الا اللە و محمد رسول اللە

پاشان هاوڕێکانی بانگ کرد و ووتی: من لەسەر لێشێواوی و گومڕاییدا بووم و ئێستا گەڕامەوە بۆ لای خودا و ڕەواوحەق، هەریەکێکتان موسڵمان دەبێت لەلام کاریکات، وە هەرکەسێکتان موسڵمان نابێت ئیتر لەلای من کارنابکات.



زۆربەیان موسڵمان بوون، پاشان کوڕەکەی بانگ کرد و پێی ووت من لە تاریکیدا بووم ئیتر ڕێگام دۆزیەوە و موسڵمان بووم تۆ چی دەکەیت؟
ووتی: موسڵمان دەبم، پاشان کچەکەی بانگ و بەهەمان شێوە و پێی ووت: ئەگەر موسڵمان ببیت من لە یەکتان جیا دەکەمەوە.
کچەکە ووتی: بە خودا باوکە من ئەو کارم زۆر پێ ناخۆش بوو هەر ڕازی نەبووم و موسڵمانیش دەبم. پاشان وڕووی کردە من و پێی ووتم: دەزانیت ئەو نزایەی گیرابوو چی بوو؟ ووتم نەخێر.
ووتی: کچەکەم مارەکرد لە کوڕەکەم و خواردنێکی زۆرم دروستکرد و خەڵکم بانگ کرد و، هەمووی ئامادە بوو چونکە لە دنیا دا زۆری پێ دابووم خودا، کاتێك خەڵك تێری خوارد من زۆر ماندووبوو بووم. بە خزمەت کارەکەم ووت: حەسیرم لە سەربان بۆ دابخات و هەندێك بخەوم، دراوسێیەکمان هەبوو، خانەدان و لە بنەماڵەی پێغەمبەر بوون، بەڵام زۆر هەژار کەوتبوون، گوێم لێ بوو کچێکی بچووك بە دایکی دەووت: دایکە بۆنی خواردنی ئەم مەجوسیە ئازاری داین.
ووتی: منیش چوومە خوارەوە و خواردن و پارەو جل و بەرگێکی زۆرم بۆ بردن بۆ هەموو ئەوانەی لە ماڵە کەدابوون، یەکێکی تر لە کچەکانیان ووتی: خودا لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ باپیرم حەشرت بکات.
هەموویان ووتیان: ئامین.
ئەو نزایە گیرابووە[1].

بڕوانە خێرکردن و چاکە بۆ دراوسێ ئەم مەجوسیەی لە تاریکی بێ باوەڕی ڕزگاری کرد بە نوری ئیمان دڵی ڕووناك کردەوە، لە کاتێکدا تەنها بەزەیی پیانداهاتەوە و خواردن و جل و پارەی بۆ بردن نەك لەبەر ئیمان و خودا پەرستی بێت، بەڵام خودا بە گەورەیی خۆی بەخششی ئیمانی پێ ڕەوابینی و، دوای ئەوەی سەر لێشێواو بوو ڕێنمایی کرد بۆ ئیسلام و، ئەگەر خودا بەخشندەیی کافرێك لەبەرچاوبگرێت، ئەبێ پاداشتی ئیماندارێك چۆن بێت کەواتە کەمتەرخەم مەبە لە خێرکردن ئەگەر کەمیش بێت لە لای خودا مەزنە و تەنها ئەوەت بۆ دەمێنێتەوە.

---

(١) لە (کتابی التوابین)

# بەشی حەوتەم: داوێن پاکی و خۆکرتنەوە

خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴾[1]

عفوا تعف نساؤكم في المحرام     وتجتبوا مالا يليق بمسلم
ياهاتكا سبل الرجال وقاطعا     سبل الموده عشت غير مكرم
لوكنت حرا من سلالة مابعد     ما كنت هتاكا مسلم
من يزن يزن به ولو بجداره     ان كنت ياهذا لبيبا فافهم
من يزن في بيت بألف درهم     في بيته يزنى بغير الدرهم.

داوێن پاك بن و ئافرەتەکانیشتان لە نامەحرەم خۆیان دەپارێزن و دوور بکەنەوە لەوەی شایستەی موسڵمان نییە.

ئەی ئەوەی ناموسی خەڵك دەشکێنی و ڕێکاکانی خۆشەویستی بە هەڵە بە کاردەهێنێ وەك کەسێکی نزم و کەم ڕێز بە سەردەبەیت.

ئەگەر کەسێکی ئازا و خاوەن بنەماڵەیەکی دیاربیت، کار ناکەیت بۆ ناموس برینی موسڵمان.

هەرکەسێك زینا بکات دێتەوە ڕێی ئەگەر لە نزیکیشدابێت   ئیتر ئەگەر ژیر و ئاقڵ تێ بکە.

هەرکە سێك زینا بکات لە نێو ماڵێکدا بە هەزار درهەم، لە ماڵکەی خۆیدا دەکرێتەوە بە خۆرایی.

یەکەم: خالیدی مسکی.

دووەم: بەرهەمی داوێن پاکی.

سێیەم: لە خودا ترساو قەرەبووی کردەوە.

---

(١) سورة الطلاق: أية ٥.

## خالیدی مسکی

خالیدی مسکی لاوێکی زۆر جوان و لە خوا ترس بوو، هەمیشە کارەکانی خۆی بە ئامانەت و دڵسۆزیەوە ئەنجام دەدا و خواردنی خۆی بەدەستی خۆی پەیدا دەکرد، فرۆشیارێکی گەڕۆك بوو، لە گەڕەکەکاندا و ڕێگاکاندا دەیگەڕاند، ئافرەتێك تەواو بە جوانیەکەی شەیدا بوو بوو، بانگی کرد تاوەکو شتی لێ بکرێت بە پیلان و فرو فێڵ بانگی کردە ژوورەوە بە بیانووی ئەوەی دەیکرێت، یەکسەر دەرگاکانی لێ داخست و پێی ووت: دەبێت ئەو کارەم لەگەڵدا بکەیت، وە ئەگەر وانەکەیت لە بەر دەم خەڵکی دا ئابڕووت دەبەم و تاوانبارت دەکەم بەوەی تۆ هەوڵت داوە پەلامارم بدەیت و دەست درێژیم بکەیتە سەر، خالید زۆر قسەی لەگەڵدا کردو باسی ترسی خودای بۆ کرد، بەڵام شەیتان زاڵ بوو بوو بە سەریدا و چاوەکانی کوێرکردبوو گوێیەکانی هیچیان نەدەبیست. کاتێك زانی هیچ سوودێکی نییە، وای دەرخست ئیتر ڕازیەو داوای لێ کرد ڕێگەی پێ بدات تا لە حەمامەکەیاندا خۆی ئامادە بکات بۆی، زۆر دڵخۆش بوو، لێرە دا زۆر بیری کردەوە سوودی نەبوو لە کۆتایی دا بیری کردەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە ئەم تاوانەوە و خودا لێی تووڕە نەبێت، هەموو گیانی خۆی بەپیسایی کردو لە دەم و چاویشی دا، بۆنێکی زۆر ناخۆش و دیمەنێکی تۆقێنەر و ناشرینی هەبوو، کاتێك بەم شێوەیەوە هاتە دەرەوە، ژنەکە زۆر قێزەوەن هاتە بەرچاوی و خێرا لە ماڵەکەی کردیە دەرەوە، خالید ڕزگاری بوو، بەڵام لە بری ئەو بۆ نە ناخۆشە خودا بۆ نێکی هەمیشەیی پێدا، کە دەهات خەڵك پێش ئەوەی چاویان لێی بێت بە بۆنەکەیدا دەیانناسیەوە و، بۆنە خۆشەکەیان دەکردو، لە نێو خەڵکدا بە خالیدی میسکی ناوبانگی دەرکرد.

ئەمە ئیمانداری ڕاستەقینە بوو، هە میشە و هەموو ساتێ دڵی لای خودا بوو، ئەگەر چی ژنەکە جوان و ڕێك بوو، بەڵام ئەم لە خودا ترسا و، لە خەڵك یان لە یاسا نە ترسا چونکە نەیاندەبینی، بەڵام تەنها خودا دەیبینین لە سزاکەی





ترسا و ئەو بیرۆکەی بۆ هات کە ناشرینکردنی ڕووکەشی ئەگەرچی ناخی پڕ بوو لە پاکی و ئیمان و ڕاستگۆیی، خودایش بۆنە خۆشە لە دنیا دا پاداشتی دایەوەو، لە دوا ڕۆژیشدا باشترین پاداشتی دەبێت.

مەخابن چەندەها کەس لەم ڕۆژگارە دەبینین جەستەیان نقوم کردووە لە بۆنی خۆش و دەرەوەیان دەڕازێننەوە بەڵام بۆنی کردەوە ناشیرین و قێزەوەنەکانیان هەر ڕۆژێك دێ ڕیسوایان دەکات ئەگەر چی دەیشارنەوە لە خەڵك، لە خودا نەترساون، بێ گومان سزا لە شێوەی کردەوەکە دێتەوە و چی بچێنی دروێنەی دەکەیت.



## بەرهەمی داوێن پاکی

خاوەنی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لە شاری صعید کەتانێکی زۆرم چاند و پاشان دروێنەو کردوو و پاکم کرد و خۆی پێنج سەد دینارم تێدا خەرج کرد بوو، بەڵام هەر ئەوەندەی دەکردەوە، بۆیە بردم بۆ قاهیرە بەڵام لە وە زیاتری نەکرد، ناچار بردم بۆ (عکا)و لەوێ هەندێکم فرۆشت بە قەرز و هەندێك لەلام مایەوە، دوکانێکم داناو تێکدا هێواش هێواش دەمفرۆشت، تا کاتی قەرز وەرگرتنەوەکەم تەواو دەکرد، کاتێك شتم دەفرۆشت ژنێکی ئیفرەنجی (فەرەنسی) بە وێدا رۆیشت و، ژنە فەرەنسیەکان بەبێ پێچەو عەبا دەڕۆیشتن، هاتە لای من و ویستی کەتانم لێ بکڕێت، کە بینم هێندە جوانە سەرسام بووم پێی و، پێم فرۆشت و خاترم گرت، پاش چەند ڕۆژێك هاتەوە بۆ لام و دەیزانی کە خۆشم دەوێ، پیرێژنێکی لە گەڵ دابوو پێم ووت: من زۆر شەیدای بووم و دەمەوێ تۆ هەرچۆنێك بووە بمگەینیتە ئەم ژنە، پیرەژنەکە پێی ووتبوو، لە سەر ئەوە ڕێك کەوتین پەنجا دینار بدەم و شەو بێن بۆ لام و پارەکەم دایە پیرەژنەکە.

شەو هەرچیەکم لە توانامدا لە خواردن و خواردنەوە، ئامادەم کردو شرینی ء مۆمم دانا، ژنە فەرەنسیەکە هاتء تاشەو درەنگ مایەوە، هەتا کۆتا کارمان مابوو، بە خۆمم ووت: تۆ شەرم لە خۆت ناکەی لە خودا ڕێبوارێکی و لەگەڵ ئەم ئافرەتە نەسرانیە دا بێ فەرمانی خودا دەکەیت، لە ترسی سزایی خودا و شەرمی خودا ئەو شەو خۆمم گرت و هیچم نەکرد، نوستم ژنە تووڕەبوو ڕۆیشت لە کۆتایی شەودا، بەیانی چوومە دوکانەکەمەوە و خۆی ژنەپیرەکە بە تووڕەییەوە بە وێدا ڕۆیشت، هەر بە وێنەی مانگ بوو، بەخۆمم ووت: تۆکێت پێ دەڵێن وا ئەم پەریە نازدارە لە دەست خۆت دەدەیت بە دوایدا ڕۆیشتم و ووتم بگەڕێوە، ووتی: نایەمەوە بە سەد دینار نەبێت، ووتم: ڕازیم و، بەڵام کە دەهاتەوە ئەوەی یەکەمجار بە بیرمدا دەهات و لە ترسی خودا نەمدەوێرا، پاشان هەرکەس بەلای کاری خۆیدا ڕۆیشت و ژنەکە ووتی: ناتوانی پێم بگەیت جارێکی تر بە پێنج سەد دیناریان دەبێت لە خەمدا بمریت، دیسان شەیدابووم و بڕیارم دا هەموو پارەی کەتانەکەمی بۆ دابنێم،





لە کاتێك دا لەم حاڵە دابووم بانگدەرێك بانگی دەدا و دەیووت: ئەی موسڵمانان ڕێکەوتنەکەی ئێمەو ئێوە تەواو بوو، تەنها یەك هەفتە دەتوانن لێرەبن.
لێم دابڕاو پارەی کەتانەکەی بە قەرز فرۆشتبووم وەرمگرتەوە، شتم لەعکا کڕی و گەڕامەوە، بەڵام دڵم پڕبوو لە پەرۆشی و شەیدایی ئەفرنجیەکە، ئەو شتانەی کڕیبووم بە نرخێکی چاك لە دیمەشق فرۆشتمەوە خودا قازانجێکی زۆری بەسەرم دا باراند، هەمیشە دەچووم تەماشای جاریەکانم دەکرد بەڵکو ئەو ئەفرنجیەی تێدا بێت و بیکڕم، پاشی سێ ساڵ شەری (حگین ڕووی دا و پاشا ناصر صلاح الدین هەموو ئەو وولاتەی ڕزگار کرد، پاشان پێ یان ڕاگەیاندم کەوا بچم کەنیزەکێك بۆ کۆشك بکرم و منیش بە سەد دینار کڕیم، کاتێك بردم نەوەد دیناریان پێدام بەڵام دە دینارم مابوو نە بوو لە قاسەکەدا، پاش راوێژ کردن ووتیان: بیبەن بۆ ناو ئەو ڕەشماڵەی ئافرەتە دیلەکانی تێدایە لە ئیفرنجیەکان یەکێکیان لە بری دەدینارەکە ببات. ژنەکەم ناسیەوەو ووتم ئەوەم دەوێ، بردم و بردمە نێو خێوەتەکەی خۆم و پاش ئەوەی لەگەڵی دانیشتم پێم ووت: دەمناسیەوە؟ ووتی. نەخێر. ووتم: من ئەو کابرای بازرگانە بووم کە تۆ پارەکەت بردم و ئەوانەی لە نێوانمان دابوو ڕووی دا، پێم ووت: تۆ هەرەشەت لێکردم کەوا ناتبینمەوە بە پێنج سەد دینار نەبێت و، ئەوامن بە دەدینار بووم بە خاوەنی تۆ، ووتی: دەستت بێنە من ئیتر موسڵمان دەبم و شایەتمانم هێناو، موسڵمان بوو زۆر بەرێك و پێکی پەیرەوی دەکرد و منیش مارەم کرد و ئەو شەو لەلام مایەوە سکی پڕبوو، پاشان سەربازەکان گوێزایانەوە و، هاتینەوە بۆ (دیمەشق).
پاش ماوەیەکی کەم پادشا ناصر نێردراوی نارد بە دوای دیل و گیراوەکان و ڕایگەیاند کەوا ڕێکەوتن نامەی مۆرکردووە و هەموو دیلەکان لە پیاو و ئافرەت بگەڕێنەوە، هەمووی گەڕاندیانەوە، تەنها من نەبێت، منیش بردم و چوومە خزمەت سەرکردە و نوێنەری فەرەنجیەکان لەوێ ئامادە بوو، ڕەنگم زۆر تێکچووبوو، مەلیك ناصر پێی ووت: دەگەڕێتەوە بۆلای شارو وولات و مێردەکەت، ئێمە کاری ئێوەمان تەواو کردووە و چیتر دیل نین.
ووتی: گەورەم من موسڵمان بووم و هەروەك دەبینن سکم هەیە، نوێنەری فەرەنجیەکان پێی ووت: کامیانت لەلا خۆشەویسترە ئەم موسڵمانە یان فەرەنجیەکەی مێردت؟ هەمان قسەی پێشووی کردەوە، نوێنەرەکە ووتی: ژنەکەت ببەرەوە و ڕۆیشتین،



پاشان نوێنەرەکە بانگی کردمەوە و ووتی: دایکی راسپاردەیەکی بۆ ناردووە و ووتویەتی: کچەکەم دیلە و حەز دەکەم جلەی پێ بگەیەنیٚ، پۆشاکەکەم هەڵگرت و هاتمەوە بۆماڵەوە کە کردمەوە ئەو پارچە قوماشەبوو بە دیاری پێمدابوو لەگەڵ دوو کیسە یەکێکیان بەنجا دینار و ئەوی تر سەد دینار ئاڵتونیەکەی تێدابوو بەهەمان پەڕۆی کە پێی بەستبووم و نە گۆڕابوو، باشترین ژیان لەگەڵیدا ژیام. ئەو شەرم و ترسەی کابرا لە خودا وای کرد کە بە حەڵاڵی ژنەکەی دەست بکەوێت، هەرکەسێك لە بەر خاتری خودا واز لە شتێك بێنێت خودا تۆڵەی بۆ دەکاتەوە.

## لە خواترساو بۆی قەرەبوو کردەوە

یحیی کوڕی عامری تەیمی ووتی: پیاوێك چوو بۆ حەج. لەڕێگەدا، ئافرەتێك قژی خۆی شانەکردبوو دانیشتبوو، ئەم پشتی تێکردوو تەماشای نەکرد ژنەکە ووتی: وەرە بۆچی پشتم تێ دەکەی؟
پیاوەکە ووتی: من لە خوای هەموو جیهان دەترسم.
پاشان ژنەکە خۆی پۆشتەکردەوە و ووتی: سوێند بە خودا هەیبەتت هەیە و سامت هەیە، ڕۆیشت، منیش دوور بە دوور شوێنی کەوتم، چووە نێو هەندێ دەواری عەرەبانەکانەوە، کاتێك ڕۆژ بوویەوە چوومە لای یەکێك لە پیاوانی هۆزەکە و پرسیارم دەربارەی لێ کرد و بۆم وەسف کرد چۆنە.
ووتی: سوێند بەخوا ئەو کچی منە.
ووتم: ئایا من دەکەیت بە کوڕی خۆت و کچەکەتم پێ دەدەیت.
ووتی: من بە خانەدان و هاوشانی خۆمی دەدەم، تۆ کێی؟
ووتم: پیاوێك لە (تەیم)ی خوداوە.
ووتی: ووتی هاوشانێکی چاکی، زۆری نەبرد مارەم کرد و گوێزامەوە و، پاشان ووتم خۆت ئامادەبکە لە حەج دەگەڕێمەوە، کاتێك گەڕامەوە بردمەوە بۆ کوفە، ئێستا چەند کچ و کوڕێکی لێی هەیە.
ئەم پیاوە لە ترسی خودا تاوانی نەکرد، تەنها ڕێگریشی ترسی خودا بوو لە و شوێنە چۆڵە دا،
خودا بۆی گۆری بە پاك داوێنی و خێر لە دنیا داو پاداشتێکی چاك لە ڕۆژی دواییدا.

## بەندی چوارەم

### بەشی یەکەم: (چـــاکە)

یەکەم: پاداشتی چاکە

دووەم: کێبڕکێ لە بەخشین دا

سێ یەم: یەك پەرداخ ئاو بە ملیونێك جونەیە

چوارەم: چیرۆکی (حصە)ی چاکەکار

پێنجەم: وەرع کردن





## پاداشتی چاکە

ئەم چیرۆکە واقیعی یە و لە ناوچەی (الطیبة)ی کوەیت ڕوویداوە، بەڵگەیە لە سەر چاکە خوازی خەڵکی ئێرە.

پیاوێکی زۆر چاك بوو، بە باشی و چاکە خوازیی و کردەوەی جوان ناسرا بوو، کاتێك لە فەزڵی خوداوە توانی هەندێك پارە کۆبکاتەوە ویستی خانوویەکی پێ بکڕێت، چووە لای نوسینگەکانی کڕین و فرۆشتن.

یەکێکیان پێ ووت: من خانوویەکم لایە بەلاتەوە خۆش دەبێت، ئایا پێش کڕین دەتەوێ بیبینی؟

کابرا ووتی: زۆر باشە، بەڵام کەی بچین بۆ بینینی؟

پیاوی دەلاڵەکە ووتی: سبەینی بە وویستی خودا.

بەیانی پێکەوە چوون سەیری خانووەکە بکەن، و چوونە ژوورەوە و پێکەوە دەسوڕانەوە، چاویان کەوت بە ژنێك و منداڵە ووردەکانی لە دەوری دانیشتبوو و نزای دەکرد و دەیوت:

« خودایە ئێمە تۆمان بەسە بەرانبەر ئەوانەی دەیانەوێ لەم حاڵە بە زۆر دەرمان بکەن، کابرا بە پەلە چوو دەرەوە و دەلاڵەکە بە دوایدا بە خێرایی ڕۆیشت و دەیووت:

خانووەکەت بە دڵە؟!

کابرا پێ ی ووت: واز لە خانووەکە بهێنە و باسی چیرۆکی ئەم ژن و منداڵانەم بۆ بکە؟

دەلاڵەکە ووتی: ئەم ژنە خاوەنی ئەم ماڵە بوو، هاوسەرەکەی مرد، لە ژنێکی تر منداڵی هەیە دەیانەوێت بیفرۆشن و بەشە میراتی خۆیان ببەن، ئەمیش تێداماوە ئەوەندەی پێ نابڕێت ماڵێکی تری پێ بکڕێت و سەری لێ شێواوە.

کابرا ووتی: بڵێ وایە، ئەوا من خانووەکەم لێ کڕیت و سبەینێ پارەکەی دەهێنمە خزمەتت. خانووەکەی کڕی و میراتگرەکان دابەشیان کرد پارەکەی و، ژن و منداڵە ووردەکانیش بەشی خۆیان وەرگرت، پاشان کابرا چوو بۆ ماڵەکە،



ژنه زۆر ترسا وای زانی دەریان دەكات، دەستی بە گریان كرد، بەڵام كابرا پێ ووت: مەترسە و دڵتەنگ مەبە، ئەوە تاپۆی خانووەكەیە و بە ناوی تۆوە تۆمارم كردووە و موڵكی خۆتە، ژنەكە لە خۆشیاندا زیاتر دای لە پرمەی گریان و سوپاسی دەكرد و نزای چاكی بۆ دەكرد و لە خودا دەپاڕایەوە كەوا سەركەوتووی بكات و چاكە بێنێتە ڕێ ی و ڕۆزی بێ شومار بەسەریدا بڕژێنێ. خوای گەورە خێر و داهاتێكی زۆر گەورەی تووشی ئەم پیاوە كرد و، بوو بە گەورەترین دەوڵەمەندەكانی ووڵات، هەروەها منداڵەكانی دوایی خۆی و تا ئێستاش لەو نیعمەتەی دەخۆن و، بەرهەمی چاكەی باوكیان دروێنە دەكەن، ئایا پاداشتی چاكە هەر چاكە نی یە.[1]

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[2]

لە علی كوڕی ئەبی طالیبەوە - ڕەزای خوای لێ بێ- لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه و سلم): (یا علی إن الله تعالی خلق المعروف، و خلق له أهلا فحبیه الیهم و حبب الیهم فعاله، ووجه الیهم طلاب، كما وجه الماء في الارض الجربة لتحیا به و یحیا به أهل. إن أهل المعروف في الدنیاهم أهل المعروف في الاخرة).

واتە: ( ئەی عەلی خودا چاكەی داناوە و، كەسانێكیشی بۆ داناوە و چاكە لەلا خۆشەویست كردوون و كردەوەكانی لەلایان شیرینە و، هەروەها داوا كانی بەرەو لایان دەبات، هەر چۆن ئاو لە زەوی یەكی ووشكانی و ڕەق دا دەڕوات تا بیبوژێنێتەوە و ئەو كەسانەی لە دەوریەتی. كەسانی چاكە كار لە دنیادا هەر كەسانی چاكە كاری ڕۆژی دوایین ).

---

(١) ئەم چیرۆكە بەرێز (محمد صقر الجاسر) بۆی گێرامەوە.

(٢) سورة المزمل: أية ٢٠.





## کێبرکێ لە بەخشندەیی دا

ڕۆژێکیان عبدالله ی کوڕی جعفری تەیار- ڕەزای خوای لێ بێ- چووە (چیعە) و لەوێ لەلای باخێکەوە دانیشت کە پڕ بوو لە دار خورما و غوڵامێکی ڕەشیان لەسەر دانابوو، غوڵامەکە هات و سێ پارچە نانی پێ بوو، سەگێك هات و لێ ی نزیك بویەوە غولامەکە پارچەیەکی پێ دا، پاشان پارچەی دووەم و سێ یەمی پێ دا و، عبدالله ی کوڕی جعفری تەیار هەر تەماشای دەکرد و لێ ی ڕاما بوو و پاشان بە غولامەکەی ووت:

تۆ ڕۆژانە خۆراکت چەندە؟

ووتی: ئەوە بوو کە بینیت.

عبدالله ووتی: ئەی خۆت ئیتر چی دەکەیت؟

ووتی: خۆم دەگرم و ئەمرۆ بەسەر دەبەم.

عبدالله لە دڵی خۆیدا ووتی: لۆمەی من دەکەن لەسەر سەخاوەتی؟ خۆ ئەمە زۆر لە من سەخی ترە، چوو باخاکەی بەهەموو دار خورماکانیەوە کڕی بە هەموو ئامێرەکانیەوە و لەگەڵ غوڵامەکەدا، پاشان غوڵامەکەی ئازاد کرد و هەموو شتەکانی پێدا.

غولامەکە ووتی ئەگەر ئەمانە هەموو بدەی بە من لە ڕێگەی خودا دا دەیبەخشم.

عبدالله ئەمەی زۆر بەلاوە مەزن بوو، ووتی ئەو بەخشندەیە و من ڕژدم!! [1]

کێبڕکێ لە کاری چاك و بەخشندەیی، ئەم غولامە کویلەیەك بوو، خودا بە هۆی سەخاوەتی ئازادی کرد و کردیە پێشەنگێکی چاك بۆ جگە لە خۆی، سەر باری ئەوەی عبدالله کوڕی جعفر زۆر بەخشندە و سەخی بوو، بەڵام لەو بەخشندە تری بینی، لە کاتێکدا ئەم غوڵامە بەشە خۆراکی خۆی دەداتە ئاژەڵێکی لاڵ بەو

---

(١) لە (المستطرف) ەوە.



ئومێدەی لەلای خودا لێ ی وەربگرێت، ئەمە نموونەی ئیماندارێکی ڕاستەقینە و بەتەقوا و پشتی بە خودای خۆی بەستووە، خودایش لە دنیا دا سامان و ئازادی بە قسمەت کرد و لە دوا ڕۆژ دا پاداشتەکەی لای خۆیەتی، ئەمەیش بۆ دەربرینی سوپاس و شوکرانەی خودا هەمووی بە خشی.

ئەمە بوارەکانی کێبڕکێ ی پاکە لە نێو موسڵمانان دا.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ [1]

پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت:

(مامن یوم یصبح العباد فیه إلاملکان ینزلان فیقول احدهما: اللهم اعط منفقا خلفا، و یقول الاخر: اللهم اعط ممسکا تلفا). [2]

واتە (( هەموو بەیانیەك ڕۆژ دەبێتەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە یەکێکیان دەڵێت خودایە ببەخشە بە کەسێك دەبەخشێت و پێان بدەرەوە، ئەوی تر دەڵێت: خودایە دەست بگرەوە لەو کەسە ڕژدەی خراپە دەکات.

---

(۱) سورة آل عمران: اية ۹۲.

(۲) متفق علیه.





## یەك پەرداخ ئاو بە ملیۆنیك جونەیە !!

نوسەری ناسراو (مصطفی أمین) یەکێك بوو لە وانەی لە کاتی حوکمڕانی جمال عبدالناصر دەستگیر کرا لە ساڵی (١٩٦٥)دا، باس لە چیرۆکی خۆی لە نێو زیندان دادەکات: (لە نێوان ئەو ئەشکەنجانەی کە پەنایان بۆ برد بوو، ئەوە بوو بڕیاریاندا بوو نەهێڵن خواردن و خواردنەوە بخۆم، بێ بەش کردن لە خواردن سەخت بوو بەڵام بەرگەم دەگرت، بەڵام تینویەتی ئەشکەنجەیەك بوو نەدەتوانرا بەرگەی بگرم، بە تایبەتی لە هاوین دا و پلەی گەرما زۆر بەرز بوومنیش نە خۆشی شەکرەم هەبوو، کە زۆر ئاو دەخورێتەوە، ڕۆژی یەکەم خۆم گرت و، ئاوی نێو مەسینەکانی بۆ توالیت دانرا بوو خواردمەوە، پاشتر لە تینواندا ئاوی پێسیشم دەخوارد کە میز و ئاوەڕۆ بوو تاوەکو لێوم پێ تەڕ دەکرد، سێیەم ڕۆژ ئەوەش نەبوو تەنانەت میزیش نەبوو بیخۆم.

ئەوەندە هەستی تینویەتیەکەم سەخت بوو، هەستم دەکرد لە هەموو گیانم دەدەن بە قامچی، وەك شێتم لێهاتبوو لە نێوان زیندانەکەدا و، زمانم ووشك و قورگم بە یەکەوە نوسا بوو، جار جار سەرم دەنا بە زەویەکەوە و دەملێستەوە تاوەکو هەستم بە شێ ی زەویەکە بکەم، لەوانەیە پاسەوانەکە لە کاتی شوشتنی زەویەکەدا قەترەیەك ئاوی لێ کەوتبێت!!

هەستم دەکر ئیتر تیا دەچم، لە کاتێکدا لەم تاریکیەدا بە دەوری خۆمدا دەسوڕامەوەو سەر لێشێواو بووم، بە هێواشی دەرگای زێندانەکە کرایەوە و دەستێك لەو تاریکیەدا پەرداخێك ئاوی ساردی بۆ هێنام، ڕاچڵەکیم و وام زانی شێت بووم، وام دەزانی تارمایی دەبینم، لەوانەیە ئەمە ئاو نەبێت.. و سەراب بێت. بەڵام دەستم برد و کوپەکەم گرت بە راستی سارد بوو، دەستەکانم دەلەرزین و، پاشان بە راستی کەسەکەم بینی و پەنجەی لەسەر دەم دانا بوو وەك ئەوەی بڵێت: قسە نەکەیت.

ئاوەکەم خوارد، بەڵام ئاوێکی ئاسایی نەبوو، نە پێشتر و نە ئێستا ئاوی وەهام نەخواردۆتەوە، سازگارترین ئاو بوو لە ژیانم دا لەو کاتەدا یەك ملیۆن جونەهم پێ بوایە دەمدا بەو کوپە ئاوە و دەمکردە چنگی ئەو پاسەوانە نە ناسراوەوە.



ئەو تاقە پەرداخە گیانی بۆ گەڕاندمەوە و، ئیتر پێویستی بۆ خواردن نەهێڵام، بەڵکو چیتر پێویستم بە ئازادی نەما، هەستم بە خۆش بەختیەك كرد بە درێژایی ژیانم تامم نەكردووە، هەمووی بۆ یەك پەرداخ ئاوی سارد.

پاسەوانە نەناسراوەكە چۆن لە ناكاو دەركەوت هەروا بە خێرای دەرگای زیندانەكەی داخست بە ئەسپای و شێوە و ڕوخساری پاسەوانە نادیارەكەم بینی گەنجێكی گەنم ڕەنگی كورتە باڵا بوو، بەڵام هەستم دەكرد فریشتەیە و، خودا وەك چاودێری و بۆ ئاگالێبونی من ڕای سپارد بوو.

ڕۆژگاری ئەشكەنجەكان تێپەڕیان كرد و بە بێ ئەوەی ئیتر ئەو گەنجە ببینمەوە، پاشان لەوێ گوێزرامەوە بۆ ژوورەكانی خوارەوە، هەموو ڕۆژێك پاسەوانەكانیان دەگۆڕی، ڕۆژێكیان هەمان گەنج بوو بە پاسەوانمان و هەر خۆمان بووین، بە چرپە پێم ووت: تۆ بۆ وات كرد؟! ئەگەر پێ یان بزانیتایە، لە كار دەریان دەكردیت.

بە زەردەخەنەوە ووتی: بەس دەریان دەكردم!! ئەوانە گوللە بارانیان دەكردم.

ووتم: كەواتە بۆ چی خۆت خستە ئەم گێژاوەوە؟!

ووتی: من تۆ دەناسم و تۆ من ناناسی. پێش نزیكەی نۆ ساڵ جوتیارێك لە جیزەوە نامەیەكی ئاراستە كردی كەوا جوتیارێكە لە یەكێك لە لادێكاندا و ئاواتی بوو مانگایەك بكڕێ، بە حەوت ساڵ خۆگرتنەوە لە مەسروف و فرۆشتنی زێرەكانی ژنەكەی توانی ئەم ئاواتە بەدی بهێنێت، زۆربەی خەڵكی لادێكە دەزانن ئەم جوتیارە زۆر لە خوا ترسە و نوێژ و ڕۆژووی بەردەوامە، بەڵام مخابن دوایی شەش مانگ ڕیسەكەی بویەوە بە خوری و مانگاكەی مردار بویەوە، دوایی چەند مانگێك لە شەوی قەدر دا لە دەرگا بچوكەكەی ئەم پیاوە جوتیارە درا و لەسەر نووسەر و بەڕێوەبەرێتی ڕۆژنامەكەی تۆوە (أخبار اليوم) ەوە هاتبوون و مانگایەكیان بۆ هێنابووین، ڕۆژنامەی (أخبار اليوم) كرد بویە پیشەی شەوانی قەدر سەدەها خەونی خوێنەرانی دەهێنایە دی.

پاسەوانەكە ساتێك بێ دەنگ بوو پاشان ووتی: ئەو پیاوەی پێش نۆ ساڵ مانگاكەت بۆ نارد باوكم بوو.. هەر خۆم زانیم دەستی پەروەردگارە و لە زیندان دا ئاگادارم بووە.!! (١)

---

(١) لە (سنة أولى سجن).

ئەمە پاداشتی کاری چاکە بوو دوایی نۆ ساڵ هاتەوە ڕێ ی، کە بە هۆیەوە ژیانی ئەم نوسەرە ڕزگاری بوو لە مردن، ئەم پەرداخە ئاوە لە کاتی تەنگانەدا لە هەموو دنیا بە نرختر و بە تامتر بوو، کەواتە باکارەکانمان دڵسۆزانە بۆ خودا بێت و، خوداش بە هانای ئەو بەندەوە کە بە هانای بەندەکانی ترەوە و یارمەتی و هاوکاری موسڵمانان دەکات، سامان کردنە خێر بەرهەمی شیرینی هەیە. ئەو بەرهەمە دروێنە دەکات کە کردوویەتی ئەگەر چی ماوەیەکی پێ بچێت و پاداشتی کارەکە چاکەکەی بە چەند بارە وەر دەگرێتەوە.

خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾[1]

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم):

(أنفق یا ابن ادم ینفق علیك)[2]

واتە: ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەدرێتەوە.

---

(١) سورة البقرة: اية ٢٧٢.

(٢) متفق علیه.



## چیرۆکی ( حصە )ی چاکەکار

سێ یەمین خوشك و بچووکترینیان بوو، لە خێزانێکی دەوڵەمەندبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەی زۆر بچووك بوو، لە هەموویان زیاتر حەزی لە کاری چاکە و خێر بوو، هاوکاری هەژارانی دەکرد و دەستی یارمەتی بۆ ڕادەکێشان، هەمیشە دەم بەخەندە و ڕوخسارێکی گەشی هەبوو، زۆر بە جوانی پەیڕەوی داب و نەریتەکانی ئیسلامی دەکرد، تەمەنی تەنها حەوت ساڵان بوو، لەلای باوکی زۆر نازدار و خۆشەویست بوو، هەمیشە لە خۆی نزیك دەکردەوەء هەستی بە ئاسودەیی دەکرد لە لای باوکیدا، بەڵام ئەم نازە بەردەوام نەبوو، باوکی مرد و گەڕایەوە بۆ لای خودا، ئەگەر چی زۆر بە ئازار بوو بۆی بەڵام ئارامی گرت و ئیمانی پێی زیاتر بوو، خێری دەکرد و لە ڕێگەی خوادا دەیبەخشی، دوایی چوار ساڵ جارێکی دی هەتیووکەوتەوە ، دایکی ئامێزیسۆز و خۆشەویستی کۆچی دوایی کرد، ئەگەر چی تاقیکردنەوەی ئەمجارەیش زۆر سەخت بوو بەڵام نە ڕووخا و لە کاری چاکە کەمتەرخەمی نەکرد.

حصە لە پاش تەواو کردنی ئامادەیی درا بە ئامۆزاکەی، لەبەر ئەوەی دڵەکەی زۆر باش و بێ گەرد بوو، وای زانی ئەو نازەی دایك و باوکی هەر زوو لێ ی دابڕابوو نەیانکێشا لێرە دەیدۆزێتەوە، بەڵام نەك خۆشەویستی و سۆز و ناز، بەڵکو ئامۆزاکەی ڕێویەك بوو لە شێوەی مرۆڤ دا، تەنها مەبەستی لەم ژن هێنانە دەسەڵات گرتن بوو بەسەر سامانەکەیدا و بۆ خۆی خەرجی بکات، بەبێ پرس خەرجی دەکردء، بە دەست بڵاوی تێ ی کەوتبوو خۆ ماڵی خۆی نە بوو، بەڵام هێشتا حصە هەر گوێبستی فەرمانەکانی بوو خزمەتی دەکرد و شەونخونی دەکرد بە دیاریەوە، گرنگی نەدەدا بەوەی مێردەکەی دەیکرد و، باوکی منداڵەکانی بەلاوە گرنگتر بوو، هەمیشە دەپاڕایەوە لە خودا ڕینمونی بکات بۆ کاری چاکە، مێردەکەی دەستی خستە هەموو میراتە کەیەوە، تەنها بینایەکی کۆن نەبێت لە کاتی دایك و باوکیان دا دابویان بە کرێ و بە پارەیەکی کەم، وویستی قەناعەت بە ژنە بکات و خەڵکەکەی ناوی دەربکات و بیفرۆشێت





و دەیووت کەوا تەپ و تۆزی ئەم بینایە دەکاتە ئاڵتون دوانی تری پێ دەکرێت، بەڵام حصە ڕەتی کردەوە نەك لەبەر نەماحی کرێ، بەڵام لەبەر خاتری ئەو کرێچیانە تێدا نیشتەجێ بوون، لەبەر خاتری ئیمان و ویژدانی ڕێگەی پێ نەدەدا ئەو خێزانە نەدارانە بڵاوە پێ بکات، بە تایبەت ئەوانە لە ڕۆژگاری باوکیە وە تییدا بوون، لەبەر ڕێز و حورمەتی باوکیشی و راگرتنی هەستی ئەگەر چی مرد بوویش وای پێ باش بوو، رەتی کردەوە، مێردەکەی چەندە ڕێگەی بەکار هێنا بۆ رازی کردنی بەڵام کاتێك مێردەکەی زانی ئیتر لە بەردەم چیایەکدایە هیچ چارەیەکی نەماوە لە بن دەستی دەربهێنێت، تەڵاقی داو چیتر نەگەڕایەوە بۆ لایان.

بەمە حصە ئازای زۆری لە ژیاندا چەشت بوو لەمە بە ئازار تر و بەرگەی گرتبوو، ڕازی بوو بە بەشی خۆی، بەو کرێ کەمەی لەو بینایە وەری دەگرت گوزەری دەکرد و بیری لە فرۆشتن و دەرکردنی خەڵکەکە نە کردەوە ئەگەر چی زۆر پێویستی پێ بوو، بەردەوام خەریکی کاری چاکە بوو، هیچ خراپەیەکی بەرانبەر کەس نەکرد نە خزم نەدراوسێ، بەو حاڵەی خۆیەوە یارمەتی هەژاران و کەم دەرامەتانی دەدا و پشتی ستەملێکراوانی دەگرت، بەڵام خۆی کەس نەبوو دەستگیرۆیی بکات و پشتی بگرێت، تەنها ئەوە نەبێت ئیمانە بە هێزەکەی بە خودا وای لێکردبوو دنیا سەرقاڵی نەکات و لەگەڵ ئەوەی هەموان پشت گوێیان خستبووە، تەنانەت خوشکەکانیشی سەر قاڵی سامان و سەرەوەت بوون و ئەمیان لە یاد کرد بوو، نە ڕووخا، هەموان ئەگەر چی زۆر ڕایانکرد بە دوایی دنیا و پەیدا کردنی سامان دا بەڵام تووشی چەندەها شەپۆلی دۆڕان بوون و زۆربەی سامانەکانیان لە دەست چوو، هەروەها مێردەکەی و ئامۆزاکەی لەم شەپۆلی زیانانەی بازاڕ ڕزگاری نەبوو، کوێرانە کاری دەکرد و تەنها تەماحی لەبە چاو دەگرت و لەگەڵ سامان کۆکردنەوە و ئارەزووبازی، وای لێهات هیچی بۆ نەمایەوە و لەلایەن ئەو کەسانەی پارەی خوارد بوون دەست بەسەر کراو گەشت و چوونەدەرەوەی لێ قەدەغە کرا.

پاشان گەردەلولە لوکە ستەمکارانەکەی عێراق دای بە سەر کومیتەء، دواتر بە چەند مانگێك خودا کومیتی ڕزگار کرد و لە چنگی دەرهێنان، کاتێك حصە گەڕایەوە سەیری کرد خەڵکی نێو بیناکە چۆڵیان کردووە بە ویستی خۆیان و



لە کومیت دەرچوون، دەپاڕانەوە کەوا خودا چاکە بەڕێ ی ئەم ژنە بەخشندەیە بهێنێت کەوا سەرباری پێویستی خۆی بۆ ئەو بینایە و دەیتوانی کرێ یان لەسەر زیاد بکات یان بیرو‌خێنێت بەڵام نەیکرد.

خودا وەڵامی نزاکانی دانەوە و پێ ی بە خشییەوە، پاداشتی ئەو هەموو ئارامگرتن و یارمەتیدانی هەژارانەی دایەوە. کرێیار هات و بەدە ئەوەندەی کە مێردەکەی پێشتر دەیویست بیفرۆشێت لێیان کڕی.[1]

کاری چاکە بە فیڕۆ نا چێت ئەگەر چی ماوەیەکیشی پێ بچێت، ئەگەر خەڵك چاکە یان لە یاد بچێت و ئەو کارە باشانەی بۆیان دەکرێت لەبەر چاویان نەبێت، خودا لە بیری ناکات، بە فەزڵ و گەوەرەیی خۆی چەند بارە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە، وەك چۆن بۆ (حصه)ی کرد.

هەموو کەس پاداشتی کارەکەی وەردەگرێت چ چاك و چ خراپ.

خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾[2]

پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(من أنظر معسرا أو وضع عنه أظله الله في ظله يوم لاظل إلا ظله)[3]

واتە: هەر کەسێك یارمەتی کەسێك بدات لە تەنگانەدا یان لەسەری لاببات خودا لە رۆژی دواییدا دەیخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە لە رۆژێکدا کە سێبەر نی یە سێبەرەکەی خۆی نەبێت.

---

(١) رۆژنامەی (الاولى) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة الزلزلة: ئایەتی ٧، ٨.

(٣) رواه مسلم.





## وەرع کردن

پیاوێکی پیشەگەری خەڵکی دیمەشق بوو، خودا بە هەژاری و دەست کورتی تاقی کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی چاکە کار و خودا پەرست بوو، هەموو کارەکانی بۆ ڕازی کردنی خودا دەکرد و، هەوڵی زۆری دەدا بۆ پەیدا کردنی ڕۆزی، بەڵام هەر ئەوە بوو نانی ئەو ڕۆژەی پەیدا دەکرد، لەلای کەس باسی هەژاری خۆی نە دەکرد و خەڵك وایاندەزانی دەوڵەمەندە.

بەیانیەك چوو بۆ نوێژ، نوێژەکەی کردو پاشان ئەوەندەی توانی قورئانی خوێند، پاشان لە نێو دەرسەکانی ناو مزگەوتەکە دا گەڕا و لەلای مامۆستایەکی بەویقار لە ئەهلی ڕاڤە و تەفسیر دانیشت کە ئەم ئایەتە ی تەفسیر دەکرد:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَـٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ﴾ [1].

لە نێوان ئەو وتانەی مامۆستا کە بە دانیشتوانەکەی دەوت: ڕۆڵەکانم بەندەخۆی بە تەنیا لاوازە و شەیتان و جنۆکەکان و دەیفرێنن بۆ خۆیان و لەکەلێن و قوژبنەکانەوە فرسەتی لێ وەردەگرن و خاڵە لاوازەکانی دەگرن بەڵام ئەگەر پەنا بە خودا بگرێت و واز لە دنیا بهێنێت لە پێناوی خوا دا و، ڕاستیەکانی خودا ڕوونی کردۆتەوە لەبەر چاوی گرت ئەوا دەبێت بە چرایەك دڵ و عەقڵی ڕۆشن دەکاتەوە و بە بەرچاو ڕوونیەوە بە نێوان خەڵکدا دەڕوات و خەڵك لە دەوروبەریدا شەهوەت و ئارەزوو کوێری کردون، لەو لایشەوە خودا خەڵات پاداشتی وای بۆ داناون نە بەخەیاڵی مرۆڤ دادێت و نە بە عەقڵ دادێت بە پێ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەرفەرمووێت:

(إنك لن تدع شيئا لله الا أبد لك به ماهو خير لك منه)

(تۆ واز لە هیچ شتێك بهێنێت لەبەر خاتری خودا بێ گومان خودا لەوە باشترت پێ دەداتەوە).

---

(١) سورة الاعراف: ئایەتی ٢٠١




پیاوەکە لە مزگەوت هاتە دەرەوە و دڵ و ڕۆحی تەواو تێر بوو بوو، واتای ئەم فەرموودەیە تەواو چوو بووە مێشکەوە، چوو بوو بە خاڵدا و لە ڕێگەیەکی ترەوە ڕۆیشت تا گەیشتە کۆلانێکی داخراو، دەرگاکەی کرا بوویەوە و حەوشەیەکی گەورە و خانوویەکی فراوان بوو، ئەمیش برسێتی زۆری بۆ هێنا بوو، بۆنی خواردنێکی زۆر خۆشی کرد و بە بێ پرس بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشت، خواردن دانرا بوو، تا سارد بێتەوە، لەبەر برسێتی بێ ئاگا بوو پارچەیەکی هەڵگرت بردێ بۆ دەمی بەڵام ووتەکانی بیرکەوتەوە و نەیخوارد، فەرموودەکەی (إنك لن تدع شيئا لله إلا ابدلك الله به ما هو خير منه).

دەستی کرد بە سەرکۆنەی خۆی و کە چۆن پاروی حەرام دەدزێ. خودایە لێم خۆشبە و ئارام دەگرم تا زۆر لەوە زیاترم لە حەڵاڵ پێ بدەیت.. ووتی-ووتی- تۆ پاك بوویت نە چاو و نە دەستت نابەیت بۆ ماڵی کەس.. دەستی کردە گریان و پارانەوە.

لە نێوان شەقامەکانی دیمەشق دا دەگەڕا خەریك بوو دڵی لە پەژارە دا دەتەقی، پەنای بۆ پاڕانەوە و داوای لێخۆشبون برد، زۆر گەڕا و خۆر بەرز بویەوە، پیاوێك چاوی پێکەوت و زۆر سەری لێ ی سوڕدەما.

لە ناکاو پیاوەکەی چاودێری دەکرد هاتە بەردەمی و دەستی کردە ملی و ئەم لا و لای ماچ کرد، پیاوەکە حەپەسا لەم کابرا نامۆیە، بەڵام کابرای نامۆ ئەمی ناسی و خۆیشی پێ ناساندەوە و پێ ی ووت: سوێند بە خوا تۆ قوتابی من بووی.. من فڵان هاوڕێتم، لە بەیانی زووەوە بۆت دەگەڕێم و ناتدۆزمەوە، ئەوا خودا بەیەکی شاد کردینەوە، پاشان ووتی: با زۆرکات نە کوژین کارێکم پێتە، پاشان لە پیاوەکەی پرسی: هاوسەرگیریت کردووە؟ یان ئەگەر ژنت نەهێناوە حەزی پێ دەکەیت؟

پیاوەکە ووتی: نایەم لەگەڵت هەتا نەزانم چیت دەوێت و چیرۆکی تۆ چی یە، بۆ زانیاریشت ژنم نەهێناوە.

کابرای نامۆ ووتی: زۆر باشە پشت بە خوا ببەستە و لەگەڵم وەرە.

بە نێو کۆڵانەکاندا ڕۆسشتن تاگەیشتنە ئەو شوێنەی بەیانی لە مزگەوتەوە بە هەڵە چوو بوو، بۆ هەمان خانوو، پاش مۆڵەت وەرگرتن چووینە ژوورەوە و لە هۆڵی میوان دا دانیشتن بە بێ ئەوەی ئەم پیاوە بزانێ مەسەلە چی یە؟

پیاوە نامۆکە ووتی: بەڕێزان ئەمە هاوڕێکەمە کە بۆم باس کردن و، ئێستا هاتووین فڵان کچتان خواز بێنی دەکەین، ئەوەندەی من بزانم پیاوێکی چاکە و... هتد.





پیاوەکەیش بە حەپەساویەوە لەگەڵ خۆی دەدوا من خوازبێنی کارم!! بەڵام نە سامان و نەماڵم نی یە؟!

پیاوە نامۆکە ووتی: مارەییەکەی لەسەر من و، ماڵیش ئەم خانووە فراوانە و بەشی چەند خێزانێك دەکات تێدا نیشتەجێ بێت، هەتا خانوویان دەست دەکەوێت و خودا دوایی هەموو تەنگانەیەك دەروو دەکاتەوە.

پاش قسە و باس و خواردنەوەی قاوە، هەمووی چوون بۆ نوێژی هەینی و دواتر مەلا شایەتیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو مارە بڕینیان تەواو کرد و پاشان خواردنیان پێش کەش بە میوانەکان کرد بە هۆی زاوای تازەیانەوە، کاتێك لە خواردنەکە نزیك کەوتەوە تەماشای کرد ئەوەی بە جێ ی هێشتبوو بەیانی چاوەڕێی دەکرد، هەڵیگرت و خواردی، بەڵام دەستی کرد بە گریان.

خاوەن ماڵ ووتی: چی دەتگرێنێ لە کاتێکدا ئێمە لە خۆشی داین؟!

بەڵام نەیتوانی وەڵام بداتەوە و باسی ئەوەی بەیانی رووی دا بکات لە ترسی ئەوەی نەوەك وەك دز تەماشای بکەن، بەڵام لەبەر خۆیەوە دەیووت: ( إنك لن تدع شيئا لله إلا أبدلك الله به ما هو خير لك منه)[1]

ئەم هاوڕێیەمان خواردنە حەرامەکەی بە جێ هێشت ئەگەر چی زۆر برسی بوو، لەبەر خاتری خودا و خۆپاراستنی خودا لە ماوەی رۆژێك کەمتر دا خواردن و ژنێکی چاکەکار و ماڵێکی فراوانی پێدا بە حەلاڵی و پیرۆزی، پاك و بێ گەردی بۆ خودا کە رزق و رۆزی هەموو کەسی جیا کردۆتەوە و دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ۝٣ ﴾[2]

وە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

( لايبلغ العبد ان يكون من المتقين حتى يدع مالا بأس به حذرا لما به بأس) [3]

(بەندە ناگاتە پلەی متقی و لە خوا ترس هەتاوەکو واز لەو شتانە نەهێنێت کە شوبهەی لەسەرە و جێگەی گومانە لەبەر ئەوەی تووشی ئەوانە نەبێت کە گوناهە).

---

(١) لە (صفحات مشرقة)وە

(٢) سورة طلاق: هەر دوو ئایەتی ٢ و ٣

(٣) ترمزی ریوایەتی کردووە و دەڵێت فەرمودەیەکی (حسن) ە

## بەشی دووەم: بەرهەمی خێرکردن

یەکەم: لە خۆگرتنەوە

دووەم: پارویەک بە پارویەک

سێ یەم: قومێک ئاوی سارد

چوارەم: بە خشین لە ڕێگەی خودا دا.

## لە خۆ گرتنەوە

شێخ و زانای فقە سلیم ئەلمسونی دیمەشقی یەکێکە لە ناودارەکانی دیمەشق، هەمیشەکاری خەڵکی دەخستە پێش خۆیەوە، زۆر پشتی بە خودا دەبەست لە کارەکانیدا و گرنگی نەدەدا بە خۆی.
لەو چیرۆکە سەیر و سەمەرانەی لێ ی دەگێڕنەوە: ڕۆژێکیان لە مزگەوت هەژارێك دێتە لای و زۆر نە بوون دەبێت پێ ی دەڵێت:
چەند ڕۆژێك دەبێت خۆی و خێزانەکەی تامی خواردنیان نە کردووە.
زۆر دڵی پێ ی سوتا و لەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆ ماڵ و، پێ ی ووت لەبەر دەرگا ڕاوەستە، پاشان سەیری ئەملا و لای کرد هیچ کەس لە ماڵ و منداڵ دیار نین خۆی کرد بە ژووردا، تەماشا دەکات مەحشی کولەکەیان کردووە و لەسەر سینەیەکی گەورە دایاننـاوە لە نێو چیمەنی ماڵەکەیاندا و لەسەر لێواری حەوزەکە تا کەمێك سارد بێتەوە، هەموو هەڵگرت بەبێ ئەوەی کەس بزانێ و پێ ی دا، پاشان تا درەنگ لە مزگەوت مایەوە و، تەواو دنیا تاریك بوو، خەیاڵی هەر لەلای ماڵەوە بوو دەبێ چیان کرد بێت.. پاشان بڕیاری دا بڕواتەوە، بەڵام کە خۆی کرد بە ماڵدا تەماشای کرد وا خوانێکی ڕازاوە بە جۆرەها خواردنی ناوازە ڕازێندراوەتەوە و، هەموان شادن و، سەری سوڕما.
ووتی: ئەم خواردنە چی یە؟ لە کوێ وە هاتووە. ووتیان: ئەمە هەمووی ( گەورەی شار) ناردوویەتی.
دواتر پرسیاری کرد سەبارەت بە چیرۆکی ئەو خواردنەو، بۆچی گەورەی شار ناردوویەتی بۆ ئەم؟ بۆی دەرکەوت گەورەی شار (پیاو ماقووڵی)ی داوەتی خواردن کردووە و، خۆی ماندوو کردووە بە ئامادەکردنی ئەم هەموو خواردنە، بەڵام ئێوارە نە هاتوون ئەویش تووڕە بووە و ناردوویەتی بۆ شێخ سلیم.
لە مامۆستا بەرێز و هەژارە لە دەمی خۆی و منداڵەکانی گرتەوە و بە خشی بەو هەژارە، بەو ئومیدەی خودا لەوانەی هەژمار بکات دەبەخشن و کاری چاکەن دەکەن و هەژارانیان خۆشدەوێت و بە بەزەیین بۆیان لەبەر خاتری خودا،

لەلایەکی ترەوە زۆر دڵنیایە خودا پاداشتی کاری چاکە نافەوتێنێ، خوداش هەر لە دنیا دا لەوە باشتری بۆ نارد و پاداشتەکەی دوا ڕۆژیشی بۆ مایەوە بە ویستی خودا. خوا دەفەرموێت:

﴿ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾[1].

لە عبدالله ی کوری عەمری کوری عاصی- ڕەزای خوایان لێ بێ- دەگێڕێتەوە کەوا کابرایەك لە پێغەمبەری (صلى الله عليه و سلم) پرسی: چی لە ئیسلامدا زۆر خێرە؟ فەرمووی:

(تطعم الطعام و تقرأ السلام على من عرفت و من لم تعرف)[2].

واتە: خواردن بدەیت بەخەڵك و سەلام لەهەموو کەسێك بکەی بیناسیت یان نەیناسیت.

---

(١) سورة الانسان اية (٨)

(٢) متفق عليه




## پـاروویەك بە پـاروویەك

ژنێك تەنها یەك كوڕی هەبوو، چووە سەفەرێك و زۆری پێچوو، ژنەكە بە تەواوی بێ ئومێد بوو بوو لە گەڕانەوەی تاقانەكەی، ڕۆژێكیان دانیشتبوو نان بخوات، هەر ئەوەندەی ویستی پاروەكە ببات بۆ دەمی لە دەرگا درا، داینایەوە و بەپەلە بەرەو دەرگا كە ڕۆیشت و سواڵكەرێك بوو، داوای خواردنی دەكرد، نانەكەی نە خوارد و هەموونان و خواردنەكەی برد و دای بە سواڵكەرەكە، شەو و رۆژێك دوای ئەمە بەبرسێتی مایەوە و هیچ نە بوو بیخوات، چەند رۆژێكی بە سەردا ڕۆیشتو، كوڕەكەی هاتەوە و، باسی لەو نەهامەتی و بەڵایانەی بۆ دایكی گێراویەوە لەم سەفەرەیدا تووشی هاتووە و ووتی:
بەڵام دایكە گەورەترین تەنگانە ئەوە بوو ڕێگاكەم لێ تێك چوو بوو چەند ڕۆژێك بوو بە ڕیگەیەكی هەڵە دا دەڕۆیشتم و كاروانەكەم نە دەدۆزیەوە، لە ناكاو تووشی شێرێك بووم و بەسەر گوێدرێژەكەمەوە بوو پەلاماری دام و گوێدرێژەكە ڕای كرد و كەوتمە نێو جەنگیەوە بەڵام چەند پاڵتۆ و شتە ئەستورەكانی سەرەوەم وای كرد چرنۆكەكانی نەگاتە گۆشتم و خەریك بوو تەواو پارچە پارچەم بكات، هەڵیگرتم و بردمی بۆ ئەشكەوتێك و بە تەمابوو بمخوات، تەواو خۆم بۆ مەرگ ئامادە كرد و هیچ دەروویەكم نەبوو، كابرایەكی نورانی هات وجلەكانی ودەم و چاویشی هەر سپی بوو، شێرەكەی گرت و لە تۆڕدا ڕایكێشا و پێ ی ووت: هەستە ئەی سەگ، پاروویەك بە پاروویەكە و پاشان شێرەكەی لەو لاتر بەرەڵا كرد و بە خێرایی ڕای كردو بورامەوە، كاتێك هاتمەوە هۆشی خۆم زۆر بە دوایی كابرا دا گەڕام نەمدۆزیەوە كاتێك بێ ئومێد بووم لەوەی بیبینمەوە، ڕۆیشتم و كاروانەكەم دۆزیەوە، زۆر سەریان سوڕما كەمنیان ببینمەوە و دڵنیا بوون لەوەی كە تیا چووم، بە سەرهاتەكەی خۆمم بۆ گێڕانەوە، بەڵام لەوە تێنەگەیشتم كە پیاوەكە ووتی: پاروویەك بە پاروویەك، ژنەكە سەیری كرد لەو كاتەدا كە ئەم پارووەكەی لە دەمی دەرهێناوەتەوە و كردوویەتی بە خێر



ڕزگار کردنی ڕۆڵەکەی لە هەمان سات دا بووە[1].

بە خشین و خێر تووڕەیی خودا دەکوژێنێتەوە و بە ویستی خودا ڕزگار کار و دەرووەلە بەڵا و تەنگانەوە، ناخۆشی و بەڵا دەگەڕێنێتەوە و، بەرەکەت دەخاتە تەمەنەوە، بە ویستی خودا خێر کردنی زۆر ناخۆشی دەگەڕێنێتەوە، نابی خێر کردن بە کەم بگرین ئەگەر چی کەمیش بێت، چونکە خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە دەنکە خورمایەکیش بووە، ئەم ژنە لە گەڕانەوەی ڕۆڵەکەی بێ ئومێد بوو بوو، بەڵام ئەو خێرەی کردی و لەو کاتەدا کە خۆی زۆر نەبونتر بوو لە سواڵکەرەکە، بەڵام دوو دڵ نەبوو خێرەکەی هەر کرد و بووە هۆی ڕزگار کردنی ڕۆڵەکەی و بەسەلامەتی پێ ی شاد بوویەوە، کەواتە باشترین شت کە دەمێنێتەوە و پاداشتی هەیە لەلای خودا هەر خێر کردنە، خودا دەفەرموێت:

﴿إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾﴾[2].

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

(صنائع المعروف تقي مصارع السوء و صدقه السر تطفيء غضب الرب، وصلة الرحم تزيد من العمر)[3].

واتە: کاری چاکە مرۆڤ دەپارێزێت لەشوێن کەوتنی خراپەو بەڵا،وەخیرکردنی بەنهێنی تورەیی خودا دەکوژێنێتەوە، هەروەها بەجێ گەیاندنی سیلەی رەحمم تەمەن درێژ دەکات.

---

(١) لە (نشوار المحاضرة) هوە

(٢) سورة البقرة: اية ٢٧١

(٣) رواه الطبراني و صححه الالباني.





## قومێك ئاوی سارد

لە ڕۆژی ٥شەمە و ٢ی أغسطس ی ساڵی ١٩٩٠ز ئەوەی بە بیری کەسدا نە دەهات ڕووی دا، هیچ موسڵمانێك لەو بڕوایەدا نەبوو و دراو سێکەی وای لێبکات، سوپای عێراقی بە فەرمانی ستەمکار و خوێن ڕێژ صدام حسین پەلاماری کومیتی دا و داگیری کرد، وەك وەفایەك بۆ ئەو هەموو ساڵەی کومیت پشتی وولاتەکەی گرتبوو، سنورەکانی کردەوە تاوەکو هەرچی خێر و ماڵ و سامانی کومیت هەیە بیبات و ئەمەش کاری کردە سەر باری هاووڵاتیان لە ڕووی ئابوریەوە و، هەروەك چۆن هێرشی هۆلاکۆی دڕندە بەسەر بەغداددا داهات، هەمان چیرۆکی مێژوویی بەیاد هێنایەنەوە، سوپای عێراقی هەموو شتێکی سەر شۆڕکەریان ئەنجامدا لە دزی و تاڵان و کوشتن و دەستدرێژی کردنە سەر ناموس لە کاتی نەفامی کۆن زۆر خراپتر.

زۆررێك لە خەڵکی کومیت هەوڵیان دا لەم دۆزەخی ڕق و کوشت و بڕە کوێرانەیە هەڵبێن، لە نێوان ئەمانە خێزانێك بوو بەیانی زوو سواری ئوتومبیلەکەیان بوون و بە دزی سوپای عێراقیەوە ڕێگەیان گرت، هەموان لە ترسان دا دەنگیان لە خۆیان بڕی بوو، دەترسان لە پڕ بکەونەوە بەر دەستیان، تەنها دا پیرەیەکی پیر نەبێت هەر دەمی پاراو بوو بە زیکر کردن و خوێندنی دوعا و نزا تاوەکو خودا بۆیان ئاسان بکات و بەسەلامەتی بگەن، ڕۆژەکەی زۆر گەرم بوو، ئۆتۆمبیلەکەیان بە نێو بیابانی کولاودا دەڕۆیشت، پاش ماوەیەکی زۆر کەلای ئەمان بە سەدەیەك بوو، لە ناکاو سەربازێکی عێراقیان لێ ڕاست بوویەوە و چەکەکەی لێ ڕاگرتن و تەماشای ناو ئۆتۆمبیلەکە و هەموانی دەکرد و، هەندێ پرسیاری گاڵتە جاڕانەی لێکردن و دەیترساندن هەموان تۆقیبون، بەڵام داپیرە لە دوعاکانی نەوەستا بوو، پاشان لێ ی پرسین: بۆ کوێ: ووتیان بۆ سعودیە دەچین، ووتی لەو ڕێگەیەوە بڕۆن زۆر بێ خەمە و هیچ نایەتە ڕێگەتان. ئۆتۆمبیلەکەیان وەك با لێکردوو بەرەو ئەو ڕێگەیە ڕۆیشتن، هەموان سوپاسی خوایان دەکرد لەم کێشەیە ڕزگاریان بوو بە ئاسانی و دەگەن بە سعودیە.



داپیره لە کوڕەکەی پرسی ئاو و خواردنت نەدا بەو سەربازە؟ کوڕەکەی ووتی: بۆچی بیدەمێ بۆ...؟ سوپاس بۆ خوا ڕزگارمان بوو لە شەڕی!!
داپیره ووتی: ئەو گوناهە، بێ گومان ئێستا پێویستی بە قومە ئاوێك و خواردن هەیە لەم گەرما و بیابانەدا.. بگەڕێرەوە با چی دەوێت بیدەینێ.
هەموان دژی ڕای پیرێژن بوون و قسەیان دەکرد و بۆڵەیان دەهات، بەڵام هەر سوور بوو لەسەر قسەکەی و فەرمانی کرد بە کوڕەکەی بگەڕێتەوە و کوڕەکەی ئەگەر چی ڕازی نەبوو بەڵام دڵی دایکی نەشکاند و هاتنەوە بۆ لای سەربازەکە، سەربازەکە زۆر سەری سوڕما و چەکەکەی بەرەو ڕوویان ڕاگرت و لێی پرسین بۆ گەڕانەوە.
کوڕەکە ووتی: گەڕاینەوە ئاو و خواردنت پێ بدەین.
سەربازەکە ووتی: چی ئاو و خواردن!! ماوەیەکی زۆرە خواردن و خواردنەوەم نە خواردووە کوڕەکە شوشەیەك ئاوء کیسەیەك خواردنی پێ دا، سەربازەکە زۆر بە پەلە دەستی کرد بە ئاو خواردنەوە، کاتێك سەربازەکە سەرقاڵی خواردنەوە بوو ئۆتۆمبیلە ڕۆیشت، بەڵام کە سەری هەڵبڕی بە دەنگی بەرز و بە پەلە هاواری لێ کردن: بگەڕێنەوە.. بگەڕێنەوە.
بە ترسەوە گەڕانەوە، کە گەیشتنەوە لای پێ ی ووتن: لەوێوە نەڕۆن، کوڕەکە ووتی: بۆ خۆتۆ ووتت ئەوێ بێ ترسە؟!
ووتی: وا بوو بەڵام ئەو ڕێگایە ترسناکە و پڕ مینە و خاڵی پشکنینی تێدایە، من دەمویست تووشی بەڵابێن، بەڵام کەنمەکی ئێوەم کرد بۆم دەرکەوت ئێوە زۆر بە بەزەیی ترن لەو کەسەی ئێمەی بە زۆر هێناوەتە ئەم بیابانە و بەبێ ئاوو خۆراك، ئەگەر ئێوە نە بوونایە منیش ماوەیەکی دی تیا دەچووم. لەم ڕێگەیەوە بڕۆن زۆر سەلامەتە و هیچتان تووش نایە. لێرەوە بە پەلە بڕۆن، هەموان سوپاسیان کرد و ڕۆیشتن و حەپەسابوون. داپیره ووتی: بزانن خودا بەو پاروە ئاساییە چۆن لەم بەڵا گەورەیە پاراستنی و، هەموان سوپاسی خوایان کرد و پەیمانیان دا چی تر واز لە خێر کردن نەهێنین.
داپیره ووتی: ڕۆڵەکانم چاکە وخێر کردن تەنانەت لەگەڵ دوژمنیشدا هەر لە خراپە و بەڵا دەمانپارێزێت.
بە فەزڵی خودا خێزانەکە بەسەلامەتی گەیشتنە سعودیە.





بەرهەم و ئەنجامەکانی خێر کردن زۆر شیرینە، ئەگەر وویستی خودا نەبوایە بەسەر ئەم پیرێژنەوە هەموان تیادەچون یان تووشی بەڵای زۆر دەهاتن، بەڵام قومێك ئاو لە گەرمایەکی هاوین دا ئاگری ڕق و کینەی ئەم سەربازەی کوژاندەوە و دڵی نەرم کرد تاوەکو ڕێگەی رزگار بوونیان نیشان بدات.. سوپاس بۆ خودا.

کە خودا دەفەرموێت:

﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ﴾[١].

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(صنائع المعروف تقي مصارع السوء والافات و الهلكات، و أهل المعروف في الدنيا هم أهل المعروف في الاخرة) [٢].

---

(١) سورة البقرة: اية ٢٧١.

(٢) رواه الطبراني و صححه الالباني.



## بەخشین لە ڕێگای خوادا

ئەم چیرۆکە یەکێك لە هاورێ نزیکەکانم بۆی گێرامەوەکە بەسەر خۆی دا هاتبوو، بەڵام لە ترسی ڕیا و ڕووپامایی نەیوویست ناوی بهێنم.
ووتی: ڕۆژێکیان زۆر پێویستم بە پارە بوو، بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر تەنها دە دینارم دۆزیەوە، مانگ هێشتا لە نیوە دایە و، موچە زۆری ماوە، بیرم دەکردەوە وەچۆن پارە بە دەست بێنم، بەڵام نەمتوانی، لە ناکاو بیرۆکەیەکم بۆهات کە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت: (أنفق يا ابن ادم ينفق عليك)، بە خۆمم ووت: تەنها ئەم ڕێگە چارەیەم هەیە و خێرا خۆم گەیاندە یەکێك لە لێژنە خێر خوازیەکان و ئەو دە دینارەی پێم بوو بە خشیم، زۆر دڵنیا بووم لەوەی خودا لەوە باشترم پێ دەداتەوە، ئیتر وازم لە بیرکردنەوە هێنا و مێشکم حەسایەوە و خەوێکی خۆشم کردو، بەیانی زوو چوومە سەر کار و سنگم زۆر فراوان و دڵم زۆر خۆش بوو، دەستم کرد بە ئەم دیو دیوکردنی وەرەقەکان تاوەکو کارەکانم تەواو بکەم، ماوەیەکی کەمی برد زەنگی تەلەفونەکە بوو هەڵمگرت (لێپرسراوی دارایی فەرمانگە) بوو ووتی:
- کاکە وەرە (مكافأ)ە کەت وەربگرە.
ووتم: (مكافأ)ەی چی ی ؟!
ووتی: ڕێزلێنانت لەسەر ئەوەی کارەکانت بە چاکی و خێرایی دەکەیت و کەمتەرخەمی ناکەیت.
تەلەفونەکەم دانایەوە و داوام لە خوا کرد چۆن لە دنیا دا پاشتی کردم لە دوا ڕۆژدا بێ بەشم نەکات و، سوپاسی خودام کرد.
کە وەرمگرت لە دوو سەد دینار زیاتر بوو!!
ئەمە بەرهەمی خێرکردن و پشت بەستنە بە خودا و داواکردن لە خۆی بە تەنها نەك دەست پان کردنەوە لە خەڵك و، هەروەها خێر کردن لەڕێگەی خودا جۆرەها ئەنجامی چاکی لە دنیا دا هەیە لە بەرەکەتی تەمەن و ڕزق و نەوەی باش و ڕزگار بوون لە بەڵا و تەنگانە.





جگە لە پاداشتی دوا ڕۆژ کە هەر ئەوە دەمێنێتەوە و هەموو شتێك کۆتایی دێت.
خودا دەفەرموێت:

﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾[١].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم)دەفەرمووێت:
(قال الله عز وجل: أنفق أنفق عليك) [٢].
واتە: خودا دەفەرموێت (ببەخشە پێت دەبەخشم).

---

(١) سورة سبأ اية ٣٩.
(٢) رواه احمد البخاري و مسلم

# بەشی سێ یەم: یاخی بوون لە دایک و باوک

یەکەم: پێش کار لە کارترازان

دووەم: تۆڵە کردنەوەیەکی دادپەروەرانە

سێ یەم: کوڕێکی خراپ





## پیش کار لە کارتزازان

چیرۆکێکی واقیعی یە، پاڵەوانی ئەم چیرۆکە خەریك بوو بە نرخترین شتی ژیانی لە دەست بدات، ئەویش دایکی بوو، هەر بەو هۆیەوە بە بەهاترین و بە نرخترینی دوا ڕۆژیشی دەدۆڕاند ئەویش بە هەشت بوو، بەڵام بە فەزڵی خودا لە وبێ ئاگاییە بە هۆشی هێنایەوە، لە دوایی بێ ئاگای و مت بونێکی زۆر پاداشت و بە های کارەکەی زانی.. ئەم چیرۆکە پەندێکە بۆ ئەوانەی نەفسیان بەرەو یاخی بوونیان دەبات لە دایك و باوکیان یان یەکێکیان. با پێکەوە چیرۆکی (ح.ح.م) بخوێنینەوە:

هەر بە منداڵی باوکم مرد و هەموو بارگرانیەك کەوتە سەر شانی دایکم، هەموو هەوڵێکی خۆی دا تا بە خێوم بکات و پێویستیەکانم پڕبکاتەوە، تەنانەت کارەکەری ماڵانی دەکرد تا پارەم بۆ پەیدا بکات، من تاقانەکەی بووم، بەو بێ هێز و لاوازیەوە وازی نەهێنا تاوەکو خوێندنی زانکۆی پێ تەواو کردم، زۆر باش بووم لەگەڵیدا، چی باش نەبم تا ئێستا هەر لە ژێر سێبەری خێری ئەو دا بووم، هەر چیەکی شك بردبوو بە ختی کرد بوو بۆم، پاشان نێردرامە دەرەوە بۆ خوێندن، دایکم چاو بە فرمێسك ماڵئاوایی لێکردم و لێم پاڕایەوە کەوا: ئاگام لە خۆم بێت و، هەواڵی خۆمی بۆ بنێرم و نامەی لێ نەبڕم تاوەکو دڵنیا بێت لە تەندروستیم. بەڵام دوایی تەواو کردنی خوێندنەکەم و ماوەیەکی زۆر گەڕامەوە، بەڵام کەسێکی دی بووم و، شارستانیەتی ڕۆژئاوا کاری تێ کرد بووم و ئاینم بە دواکەوتوو کۆنە پەرستی دەبینی!! تەنها بڕوام بە ژیانی ماددی هەبوو پەنا بە خودا.

پیشەیەکی زۆر بەرزم دەست کەوت و دواتر بە دوای هاوسەرێکدا دەگەڕام، دایکم کچێکی چاکی ئیمانداری بۆ دیاری کردم بەڵام ڕازی نە بووم و ئەو کچە جوانە دەوڵەمەندەم هێنا کە خۆم دیاریم کرد بوو، چونکە من خەونم بە ژیانی ئۆستۆکراتیەوە دەبینی!!!

دوای شەش مانگ لە هاوسەرگیریەکەم، ژنەکەم پیلانی بۆ دایکم دادەنا، تاوای



لێ کردم ڕقم لێی بێ، ڕۆژێکیان گەڕامەوە تەماشام کرد ژنەکەم دەگری و لێم پرسی چی بووە؟ ووتی یان من یان دایکت لە ماڵە دا، ئیتر ئارامم لەمە زیاتر نەماوە.

شێت و هار بووم و تووڕە بووم و دایکم لە ماڵ کردە دەرەوە، بەڵام ئەو بە گریانەوە ڕۆیشت و گوتی: ڕۆڵە خودا خۆشبە ختت بکات.

تەماشای دڵی دایك دایك چەند پڕ لە بەزەیی و سۆزە بۆ ڕۆڵەکانی، تاقانەکەی لە ماڵ دەیکاتە دەرەوە و ستەمی لێ دەکات نزای خۆشی و شادی بۆ دەکات.

خاوەنی چیرۆکەکە دەڵێت: دوایی چەند کاتژمێرێك ڕۆیشتم بە شوێنی دا و زۆر گەڕام بێ سوود بوو، گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و ژنە فێڵبازەکەم بە زمانی لووس و نەفامی خۆم توانی ئەو دایکە بە نرخ و بێ وێنەم لە بیر بەرێتەوە. ماوەیەکی زۆر دەنگ و باسی دایکم نەزانی، لەو ماوەیەدا تووشی شێرپەنجە بووم و، کەوتمە نەخۆشخانە دایکم بیستبووی نەخۆشم هاتبووە نە خۆشخانە، بەڵام پێش ئەوەی بگات بەمن ژنەکەم دەری کردبوو و، پێ ی ووتبوو: کوڕەکەت لێرە نی یە.. چیت دەوێ.. خێرا بڕۆ.

دایکەی دڵشکاوم لە کوێوە هاتبوو چوو بووە بۆ شوێنەکەی خۆی و، لە نەخۆشخانە دەرچووم پاش ماوەیەکی زۆر باری دەروونیم زۆر تێك چوو بوو، پیشەکەم لە دەست دا و سامانەکەم ڕۆیشت، قەرزێکی زۆرم لەسەر کەڵەکە بوو بوو، بە هۆی ئەو هەموو داواکاریانەی ژنەکەم دەیکرد و پشتی شکاند بووم پێ ی. لە کۆتاییدا ژنەکەم چاکەی دامەوە و پێ ی ووتم: مادەم تۆ پیشە و سامانت لە دەست داوە و ئیتر شوێنت لە نێو کۆمەڵگا دا نەماوە و بە ئاشکرا پێت دەڵێم: تۆم ناوێ.. ناوێ.. تەڵاقم بدە.

ئەم قسانەی ئەم پیاوە نەخۆشە گوێبستی بوو وەك هەورە گرمە وابوو دای لە سەری و، بەڕاستی تەڵاقی داو. ئیتر لە سوڕی مت بوون بە هۆش هاتەوەو زانی چ تاوانێکی کردووە دەستی کرد بە گەڕان بە دوایی دایکی دا.. لە کۆتاییدا دۆزییەوە.. بەڵام لە کوێ؟!

لە یەکێك لە شوێنە خێر خوازیەکاندا بوو کەوا ئەوانەی هیچ شوێنێك و کەسیان نی یە دەیگرنە خۆیان و بەخێر و بەخشینی خەڵك بەڕێوە دەچێت..

لەبەر گریان و خەفەت تەواودا کەوتبوو، هەر کە چاوم پێی کەوت خۆم دا بەسەر



قاچیدا و بە کوڵ گریام، ئەویش ئەسرینەکانی باراند بەسەرمدا و نزیکەی کاتژمێرێك پێکەوە گریاین و پاشان بردمەوە بۆ ماڵەوە و پەیمانم دا چیتر لە قسەی دەرنەچم و تا لە ژیاندا بم خزمەتی بکەم. [1]

بێ رێزی بەرانبەر دایك و باوك لە تاوانە گەورەکانە و کاریگەری زۆر دەکاتە سەر مرۆڤ، بە تایبەت دایك، هەر بۆیە ئەم کورە بەیاخی بوونی لەدایکی ژیانی تاڵ بوو، پڕ لە بەڵاو ناخۆشی، ئەگەر فەزڵی خودا نە بوایە و لە بێ ئاگاییە کەی بە هۆشی نەهێنایەتەوە و هەڵەکانی خۆی نەبینیایە و پاشان گەڕانەوەی بۆ لای ڕاستی، ئەگەر وا نەبوایە بە درێژایی ژیانی هەر بێ ئومێدی و نەهامەتی دەبوو بەڵام خودا بەزەیی پێدا هاتەوە و دواتر ژیانێکی خۆشی لەگەڵ دایکییدا بەسەر برد.

خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ١٤ ﴾[2].

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا باشترین کەس بۆی باش بم کێ یە؟ فەرمووی "دایکت" ووتی: کێ ی تر. فەرمووی: "دایکت". ووتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: "دایکت" ووتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: "باوکت" [3].

---

(١) رۆژنامەی (البلاد السعودیة).

(٢) سورة لقمان: ایة (١٤).

(٣) متفق علیه.



## تۆڵەکردنەوەیەکی دادپەروەرانە

وائل کۆتا پۆلی ئامادەیی دەرچوو، خۆشیەکە بۆ دایك و باوکی زیاتر بوو، چۆن وا نەبێ ئەمە تاقە منداڵێکە خودا پێ ی بە خشیوون وتاکە ئومێدی ژیانیانە، ئاواتی وائل تەواو کردنی پزیشکی مرۆیی بوو لە پاریس، دایك و باوکە بە پێشنیاری کوڕەکەیان ڕازی بوون و دڵیان نەشکاند، ڕۆیشت بۆ زانکۆی (سۆربۆن) لە پاریس بۆ خوێندنی پزیشکی، باوکی بازرگانێکی گەورە بوو، بەردەوام پارەی بۆ دەنارد و کوڕەکەی شوقەیەکی بچوکی نزیك زانکۆکە لە خێزانێکی فەرەنسی بەرکرێ گرت. کچی ماڵە فەرەنسیەکە زۆر جوان بوو، هاوڕێیەتی لە نێوان وائل و ئەم کچە دا دروست بوو، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پەیوەندیەکەیان پەرەی سەند و یەکتریان زۆر خۆش دەویست، کچە زۆر بە ئاسایی هەر کاتێك بیویستایە دەچووە نێو شوقەکەی وائل و، سێ یەمیان شەیتان دەبوو، هەرچی هەیە دەیانکر و، وائل دیاری و بەخشینی ڕژاندبوو بە سەر کچەدا، لەم لایشەوە باوکەی بێ ئاگا شەو ڕۆژ خستبووە سەریەك تا داواکاریەکانی کوڕەکەی جێ بەجێ بکات و پارەی بۆ کۆبکاتەوەو بینرێت، کوڕەکەشی لە بری خوێندن ڕای دەبواردو بە فیرۆی دەداء، ئەو کچە هەموو بیرکردنەوەیەکی داگیر کردبوو کاری کردە سەر خوێندنەکەی و پاشکەوت، خوێندنەکە ساڵانێکی برد و باوکە هەر پارەی دەنارد و، دایکی هەمیشە هانی دەدا و بە یادی دەهێنایەوە، کە ئەمە تاقە هیوا یانە و پشت گوێ ی نەخات، بێ ئاگا بوون لەوەی کوڕەکەیانی سەرقاڵ کردبوو. ڕۆژێکیان کچەکە خۆی کرد بە ژووردا و دەگریا و ئەمەش دڵی وائلی داچڵەکاند و دڵخۆشی دایەوە و دەستی لە ملی کرد و پاشان هێمن بویەوە لێ ی پرسی چی یە؟

ووتی: ئێمە کاتێك کچمان دەگاتە تەمەنی گەورە بوون دەری دەکەین، باوکم دەری کردم و دەبێت ئیتر پشت بە خۆم ببەستم و خۆم خەرجی خۆم پەیدا بکەم. وائل بە بێ دوولی داوای هاوسەر گیری فەرمی لێ کرد و کچەیش بەبێ





سێ و دوو بەڵێ ی کرد ئەوەك ئەم فرسەتەی لە دەست بچێت، ئیتر لە بری خوێندن وائل خەرجی ژن و ماڵ کەوتە سەر شانی و داوای دووقات مەسرەفی لە باوکی دەکرد و نەیدرکاند کەوا ژنی هێناوە، بەڵکو دەیووت نرخ زۆر گران بووە، باوکەش بە بێ دوو دڵی کەمتەرخەمی نەدەکرد لە ناردنی پارە و دایکەیش بەردەوام هانی دەدا ڕژدی بەرامبەر تاقە ڕۆڵەکەیان نەکات، هەتا هەرچی هەبوو ناردی و ئیتر سامان نەما، پاشان بیریان کردەوە چی بکەن، دایکە دەستی کرد بە فرۆشتنی ئەو ئاڵتونانەی لە منداڵیەوە بە دڵێکی خۆشەوە کڕیبوونی و پارەکەی بۆ نارد داهاتووی کوڕەکەی نەفەوتێ، بەڵام وائل هەر بێنەی دەزانی بیری لە بارودۆخی باوك و دایکی نە دەکردەوە کە چۆن پەیدا دەکەن، گرنگ ئەوەیە پارە بگاتە دەستی و خەرج بکات بۆ دڵدارە نازدارەکەی!!

بارودۆخی ئابووری باوکی زۆر خراپ بوو و سەرچاوەکانی دارایی شێوان و، خوێندنی وائل هەر نەبڕایەوە و، تاکە هیوایان ئەوە بوو وائل تەواوی بکات و کارێك بگرێتە دەست و ئەم ئازارانەی چەشتویانە لە بیریان بباتەوە و ژیان و گوزەرانێکی خۆشیان بۆ دابین بکات و، زوو زوو دایکەکەی ئەم ئاوات و داهاتووە خۆشەی دەهێنایە بەرچاوی باوکی و باسی ڕۆژە خۆشەکانی بۆ دەکرد کە وائل بە بڕوانامەوە دێتەوە و چاکە یان دەداتەوە، کوڕەیش هەر بێنەی بوو تا ناچاری کردن خانووەکەی کە دواشت بوو بۆی بفرۆشن و چوونە خانوویەکی بچکۆلانەی کرێ وە، وایاندەزانی کەمی ماوە دەگەڕێتەوە کۆشکیان بۆ دەکڕێت، بەڵام کوڕەکەیان سامانی بە دەست بڵاوی و بەبێ بیرکردنەوە و بایەخدان خەرج دەکرد، خۆ پشتی پێوە نەئێشا بوو، بارودۆخی پیرە پیاو و پیرێ ژن بەرە و ئەو پەڕی خراپی چوو، هیچ نەما بینێرن و ناچار باوکی نامەیەکی بۆ نارد باسی حاڵی خۆیانی بۆ کرد و کەوا پارە تەواو بووە و خانوو فرۆشراوە و تەنانەت خشڵەکانی دایکشت فرۆشراوە و ئیتر هیچیان نیە بۆت بنێرین.

لە بری بەخۆدا چوونەوە چاوی سوور بوو باوەڕی بە قسەکانی باوکی نەکردو گومانی خراپی پێ برد و شەیتان وای لێکرد دایك و باوکی داهاتووی دەفەوتێنن و، دڵی ڕەق بوو ئیتر پەیوەندی پچڕاند لەگەڵیاندا و دەستی کرد بە کار کردن تا خوێندنەکەی تەواو بکات، دوایی تەواو کردنی بەردەوام کاری دەکرد تاوەکو پارە کۆ بکاتەوە، پاشان خۆی کۆکردەوە و بگەڕێتەوە نیشتیمان، خۆی و



ژنە خۆشەویستەکەی هاتنەوە بەبێ ئەوەی کەس بزانێت، هەتا دایك و باوکیشی !!
وائل لەگەڵ ژنە فەرەنیسەکەیدا ژیا و سامانی زۆر بوو، بەڵام پەیوەندی نەکرد بە دایك و باوکیەوە و دوایی ئەو هەموو هەوڵەیان ڕقێکی گەورەی بەرانبەر یان هەبوو چونکە بوو بوونە هۆی ئەوەی ئەمرۆ پێ ی گەیشتبوو، بەڵام خودا ماوە دەدات بەڵام بێ ئاگانی یە لەو کاری بەندەکانی، خودا وای کرد یەکێك لە هاوڕێکانی باوکی ڕێگەی لەو نۆرینگەیەکەوت و، ئەو وائلی ناسی، بەڵام وائل ئەوی نە دەناسی، هەر کە هاتە دەرەوە خێرا خۆی گەیاندە هاوڕێکەی و پێ ی ووت کوڕەکەت هاتۆتەوە و لێرە نۆرینگەی داناوە و بە چاوی خۆم بینیومە، باوکە کە باوەڕی نەکرد، هەتا کابرا ووتی با پێکەوە بچین و نیشانت بدەم، باوکە بە ستەزمان دوایی پچڕانی هەواڵی کوڕەکەی خەم و پەژارە میوانی بوو، نەیدەزانی چی بەسەر هاتووە، بە بێ دوو دڵی ڕۆیشتن.
باوکە ڕۆیشت بەڵام حەپەسا بوو، باوەڕی نە دەکرد، گەیشت و بە چاوەکانی خۆی ناوەکەی هەڵواسرابوو خوێندەوە و هەستی بە بۆنی تاقانەکەی کرد، پڕچاوی بوو لە فرمێسك،فرمێسکی خۆشی و شادی بوون، بە قادرمەکاندا سەرکەوت و هێشتا هەر دڵی بڕوای نەکرد بوو، دوایی ئەو چەندەها ساڵە چاوی کەوتە سەر کورەکەی و وویستی باوەشی پێدا بکات و لە ئامێزی بگرێت و، ئەو دڵەی ساڵانە چاوەڕێ دەکات دایبمرکێنێتەوە، بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە لای کوڕەکەی زۆر بە بێ ڕێزیەوە قیڕاندی: لە شوێنی خۆت ڕاوەستە و لەمن نزیك نەکەویتەوە، با ژنە بیانیەکەم نەزانێت تۆ باوکمی و لەبەر چاوی سووك ببم!! باوکە لە شوێنی خۆی ڕەش دا گەڕا، پاشان کوڕەکەی ووتی: شتێك پارەت نەدەمێ بەڵام دەبێت لە نۆرینگەکە دوور بکەویتەوە و قەت چاوم پێت نەکەوێتەوە!!
لێرەدا باوکە تووشی نا ئومێدی بوو، هەستی کرد هەموو پێش بینیەکانی بە پێچەوانە دەر چوون و لە ناخەوە هەستی بە تاڵاوی دەروونی دەکرد، بەڵام خۆی گرت و وەڵامێکی پڕ بە پێستی بە کوڕەکەی ووت: " نەفرەتی خوا و هەموو خەڵکت لێ بێ و تورەیی خوا لەسەرت بێ تا ڕۆژی دوایی و هەتا هەتایە هەر لە بەد بەختی دابیت ".
پاشای چەند تفێکی کردە دەم و چاوی کوڕەکەی تا دڵە گڕگرتووەکەی خۆی پێ دامرکاندەوە و ڕۆیشت، ئینجا ئاوڕی دایەوە پێ ووت: ئێمە خودامان بەسە





پێمان ببەخشێت.

گەڕایەوە بۆماڵەوە، دڵشکاو و پەژارە و غەم باڵیان بە سەردا کێشا بوو، داخ و حەسرەت خەریك بوو جەرگیان دەڕراند و هەمان هەواڵی دا بە دایکە دڵسۆز و ئەویش زۆر بۆ ساویلکەیی و بە سۆزی خۆی فرمێسکی هەڵوەراند، دوایی ئەم نزایە لە دڵێکی بریندار و شکاوەوە هەر دەبێت کۆتاییەکی هەبێ.

قسەکانی باوکەکەی کاری نەکردەسەر دەروون و دڵی ئەو کوڕە یاخییە، چونکە وەك بەرد یان ڕەقتربوو لە بەرد و ڕەشتر بوو لە شەو.

ڕۆژێکی پشوو وائل و ژنەکەی چوون بۆ گەشت و حەوانەوە دوایی کاری بەردەوام لە یەکێك لە سوڕانەوەکاندا ئۆتۆمبیلەکەیان خلیسکا و کەوتە نێو دۆڵێکی قووڵ و دەستبەجێ وائل و ژنەکەی گیانیان سپارد، هەواڵ درایە دایك و باوکی و هەرچی میراتیان هەیە گەڕایەوە بۆ دایك و باوکەکەی تەنانەت نۆرینگەکەیش [1].

خودای گەورە ماوە دەدات بە ستەمکار تاچی لە دەست دێ بیکات بەڵام هەمیشە لە بۆسە دایە بۆی و کە گرتی رزگاری نابێ. ئەم چیرۆکە پەندی بۆ دایك و باوك و منداڵەکان تێدایە و، پێویستە منداڵەکان ئاگاداری دایك و باوکیان بن و خزمەتیان بکەن و، هەر چۆن پێویستە دایك و باوك سووربن لەسەر ئەوەی منداڵەکانیان پەروەردەیەکی ئاینی جوان و ڕاستیان هەبێت تاوەکو لە بەڵاکانی ژیان و پیلانەکانی شەیتان پارێزراوبن بە تایبەت لەم سەردەمەدا.

خودا دەفەرموێت:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَـٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾[2].

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(رضى الرب في رضى الوالدين و سخط الرب في سخط الوالدين)[3].

---

(١) لە (وقائع أغرب من الخيال).

(٢) سورة عنكبوت اية ٨.

(٣) رواه الحاكم.



# کوڕێکی خراپ

تاقانەی دایك و باوکی بوو، نازێکی زۆری پێ درا بوو، بەڵام لە بری سوپاسی خودا بکات بە پێچەوانەوە زۆر زمان درێژ و جنێو فرۆش بوو، جنێوو قسە ناشرینیەکانی بە دایك و باوکی دەوت بە بێ ئەوەی ڕەچاوی ئاین و ڕێزی دایك و باوك و گوێرایەڵییان بکات، زۆر خراپ بوو بۆ دایك و باوکی، باوکی مرد و ڕزگاری بوو لە دەستی و، دواتر ڕقی ئەویشی بە دایکە بەستە زمانەکە دەردەکرد، هەمیشە دایکی ئامۆژگاری دەکرد لە هاوڕێ ی خراپ بە دوور بێت، چونکە ئەوان وایان لێ کرد بوو لە ئاین و ڕەوشتی جوان دووریان خستبوویەوە، تەنانەت خوێندنیشی پێ تەواو نەکرا بوو و، بوو بووە کەسێکی لادەر، شەقاوە یەك بوو گوێ لە قسەکانی نە دەگرت و ناشرین ترین قسەی بە دایکی دەوت و دڵڕەق بوو لەگەڵیدا،دایکە ئارامی نەما و هەڕەشەی لێکرد بەخاڵەکانی بڵێت تا بیگەڕێننەوە سەر ڕێگە و لێ ی بدەن، ئەم کوڕە لەو پەڕی خراپیدا بوو جنێو بە ئەوانیش دا و بەرامبەر هەمووی ڕاوەستا، خۆی بە گەورەتر دەزانی لە هەموویان و پێ ی وا بوو توانای هەیە بەرگری لە خۆی بکات، دواتر هەتا توانی قسەی نا شرینی بە دایکی ووت ووشەی سارد و سڕ نەما بەکاری نەهێنێت، بە مەوە نەوەستا زیاتر شێت و هار بوو بە تەواوی شەیتان جڵەوی گرتبوو، تاکێك پێڵاوی هەڵگرت و دای بە پشتی دایکیدا و بە بێ پەشیمانی لەم کارە قێزەوەنە ماڵی جێهێلا، دایکەی بەستەزمان هیچی بۆ نەمایەوە تەنها خەفەت و گریان و سەرکۆنەی بەختی خۆی دەکرد کە چەند ڕەشە، لە غەم و پەژارەی خۆیدا دوعای لێ کرد، شەو دوایی ئەوەی زۆر بەی شەوەکەی لەگەڵ هاوڕێ خراپەکانیدا بەسەر برد، هاتەوە و لەسەر جێگاکەی بێ هۆش کەوت.

بەیانی کاتێك لە خەو هەستا سەیر لەوەدا بوو نەیدەتوانی دەستی ڕاستی بجوڵێنێت ئەو دەستی پێڵاوەکەی پێ گرتە دایکی.. نا بزوێت! ئیفلیج بووە، دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست دەستی کرد بەگریان و هەستی دەکرد چەند خراپەی بەرانبەر دایك و باوکی کردووە، دایکی زۆر بەزەیی پیداهاتەوە و دەستی کرد بەنزا و پاڕانەوە بۆی کە خودا شیفای بدات، هەرچی بێت خۆ ئەوە ڕۆڵەیەتی و ئەمیش دایکە.





چۆن ڕێگەی بە خۆی دا پێڵاوی تێ بگرێت!! خۆ مرۆڤی ڕێك و ژیر لە ترسی خوا دڵی نایە بیگرێتە ئاژەڵیش و بەزەیی پیاندادێتەوە.
خوای باڵا دەست ئاگاداری کردوینەتەوە پییان نەڵێین (ئۆف) و، لەبەردەمیان دا هیچ قسەیەك نەکەین تەنها قسەی جوان نەبێت، ئیتر چۆن دەبێت بۆ کەسێك پێڵاوەکانی بگرێتە دایکی! ئەبێ لە ڕەوشت و ئاین چی بۆ ما بێتەوە؟!
ئەم چەند دێرە شیعرە بخوێنەوە تاوەکو بزانیت دڵی دایك چەند گەورەیە و، هەرچەندە دڵ ڕەقیء پشت گوێ خستنی بەرانبەر کرابێت، بە نرخترین شت لە بوون لەلای و خۆشەویسترنیان بۆ دڵی تەنها ڕۆڵەکانیەتی.

أغري إمرؤ يوما غلاما جاهلا
بنقوده حتى ينال به الوطر
قال ائتني بفؤاد أمك يا فتى
ولك الجواهر والدراهم والدرر
فمضى واغرز خنجرا في صدرها
والقلب اخرجه و عاد على الاثر
لكنه من فرط سرعته هوى
فتد حرج القلب المعفر إذ عثر
ناداه قلب الام وهو معفر
ولدى حبيي هل اصابك من ضرر
فكأن هذا الصوت رغم حنوه
غضب السماء على الوليد قد إنهمر
فدري فظيع خيانه لم يأتها
ولد سواه مند تاريخ البشر
وارتد نحو القلب يغسله بما
فاضت به عيناه من سيل العبر
ويقول يا قلب انتقم مني ولا
تغفر فإن جريمتي لاتغتفر
واستل خنجره ليطعن صدره
حنقا ويبقى عبره لمن اعتبر



ناداه قلب الام قف ولدي ولا

تطعن فوأدي مدتين على الاثر

واتە:(ڕۆژێکیان کەسێك کوڕێکی هەرزەکاری نەفامی فریودا - بە سامان و پارەکانی بۆ ئەوەی مەبەست و مەرامی بەدی بهێنێت- پێ ی ووت دڵی دایکتم بۆ بێنە و - منیش خشڵ و پارەت پێ دەدەم- ڕۆیشت و خەنجەرێکی هێنا و دای لەسەر سینگی و- دڵی دەرهێنا و هاتەوە - بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بە پەلە ڕۆیشت - هەڵکەوت و دڵەکەی خەڵتانی خوێن بوو کەوت و لە خۆڵدا گەوزا- دڵە تەپ و تۆزاویەکەی دایکی بانگی لێکرد - کوڕە نازدارەکەم ئایا زیانت پێ گەیشت- ئەم دەنگە لەگەڵ ئەوەی لە بەسۆزیشەوە بوو - بەڵام تورەیی و قینی ئاسمان بوو دەباریە سەر ئەم منداڵە بۆی ئاشکرا بوو ئەم تاوانان و خیانەتەی ئەم کردوویەتی- بە درێژایی مێژوو لە مرۆڤایەتیدا هیچ کوڕێك وای نەکردووە- ئاوڕی دایەوە و دڵەکەی بە فرمێسکەکانی چاوی و پەند وەرگرتنی شوشت - پاشان بە زمانی حاڵ پێ ی ووت دڵەکە لێم خۆش مەبە و تۆڵەم لێ بکەرەوە تاوانەکەم مایە لێخۆشبوونی یە- دووبارە خەنجەرەکەی دەرهێنایەوە و ویستی بیدات لەسەر دڵی خۆی لە ڕقاندا و ببێت بە پەند بۆ کەسانی تر- بەڵام دڵی دایکەکە هاواری لێ هەستاو ووتی: نەکەی بوەستە ڕۆڵەکە و- دوو جار جەرگم مەبڕە و دڵم مەشکێنەرەوە - خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾﴾[١].

پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(من الكبائر شتم الرجل والديه)[٢].

واتە: (لە گوناهە گەورەکان ئەوەیە کەسێك جنێو بە دایك و باوکی بدات).

---

(١) سورة الاحقاف: (اية ١٥).

(٢) متفق عليه.

## بەشی چوارەم: (هەڵەکان)

یەکەم: زللەی بە ئاگاهێن

دووەم: چی پێ بڵێم؟!

سێ یەم: تەڵە و داو

چوارەم: کەمژەیی

پێنجەم: تەمەنی بە فیڕۆ دان

شەشەم: هەنگاوەکانی شەیتان

حەوتەم: هاوار و ناڵەکانی پەشیمانی

## زللەی بە ناگاهێن

کوڕێکی جوان و باڵا بەرز و هەڵکەوتوو بوو، زۆر بە خۆی دەنازی، چۆن وانەکات لە کاتێکدا منداڵی بچوك بوو، هەموو داواکاریەکانی ڕەت نەدەکرایەوە و، هاتن و چوونی بێ لێپرسینەوە بوو، کەس نەیدە پێچایەوە لە کوێ بووی؟ بۆ کوێ دەچیت؟

هەموو ئەم هوکارانە کوڕێکی هەڵەشەی لێ دروست کرد بوو گوێی بەکەس نەدەدا و گرنگ نە بوو بەلایەوە چی ڕوودەدات، ڕێگەی بە کچی خەڵك دەگرت و بێزاری دەکردن، کاتێك کەس و کاریان دەهاتن و سکاڵایان لە لای دایکی دەکرد پەیمانی پێ دەدان کەوا سزای دەدەن لەسەر ئەو کارە ناشرینەی بەڵام دواتر جێ بە جێ ی نەدەکرد، تەنانەت ئەگەر هەواڵ و سکاڵا بگەیشتایە بە باوکیشی دایکی قەناعەتی پێ دەکرد هێشتا هەرزەیە و جارێکی دی دووبارەی ناکاتەوە، بەم شێوەیە ژیانی لە زۆرێك لە خەڵك تاڵ کرد بوو، ڕۆژ لە دوایی ڕۆژ خراپتر دەبوو، هەتا گەیشتە هەژدە ساڵان باوکی ئۆتۆمبیلێکی بۆ کڕی و زیاتر ڕێگە خۆشکەر بوو تا خراپەی زیاتر ئەنجام بدات و تەڵە وپیلان دابنێ بۆ کچانی بێ ڕەوشت و دەکەوتە شوێنیان بۆ نێو بازاڕ و مارکێت و شوێنی ڕابواردنەکان و بە مانەوە نەوەستا دەکەوتە شوێن پاسی قوتابخانەکانی کچانی هاتوو چۆ پێ دەکرد، شێوازە شەیتانیەکانی خۆی بەکار دەهێنا بۆ خەڵە تاندنیان و، چەندەها کچی پاك داوێنی پیس کرد و چەندەها بێ ئاگا و ساویلکەی بێزار کرد، بەم شێوە ژیانی بە درۆ و خەڵەتاندنی کچانی بەد ڕەوشت بەسەر برد و بەبێ ترس لە خودا یان شەرم کردن، ڕۆژێك لە ڕۆژان گوێ ی نەدایە فرمێسکی ئەو کچانەی بە زمانی لوس فریوی دەدان، چونکە تاکە ئاواتی تێر کردنی ئارەزووەکانی خۆی و شوێن کەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان بوو.. ژیانێکی بێ هودە و بێ مانای هەبوو.

بەڵام هەموو دەستپێکێك کۆتایشی هەیە، ڕۆژێکیان لەگەڵ هاورێیەکی لە خۆی خراپتری بە ئۆتۆمبیلەکەی ئەم دەرچوون و بە دوایی نێچیردا دەگەڕان،

لەو کاتەدا پاسێکی قوتابخانەی کچان تێپەڕی و، خێرا کەوتنە شوێنیان و، لەگەڵ یەکێك لە کچەکانی نێو پاسەکەدا کەوتنە ئاماژەکردن و لە دواوەی پاسەکە دانیشتبوو، کەوتنە گۆڕینەوەی ژمارەی تەلەفونەکانیان و، لەناکاو پاسەکە رایگرت و ئۆتۆمبیلەکە کەوتە ژێر پاسەکەوە و، یەکسەر هاوڕێکەی بە تەواوی پان بوویەوە و هەر لەوێ دا تیا چوو، ئەمیش لە هۆش خۆی چوو و کاتێکی زانی لە نەخۆشخانەیە و لەبەردەم پزیشکەکاندایە و.. دوایی دوومانگ هاتەوە سەر خۆی و هەواڵی هاوڕێکەی پرسی و ووتیان مردووە، بە بیستنی ئەو هەواڵە تووشی تێکچوونی دەروونی بوو، بوو بە گرێ یەکی دەرونی و خۆی بە تاوانبار دەزانی لە هۆکاری مردنی هاوڕێکەیدا.. ڕۆژگارێکی تاڵی بەڕێکرد و مانی گرت لە خواردن و خواردنەوە و باری تەندروستی بەرەو خراپی ڕۆیشت، ئەم ڕووداوە وەك زللەیەکی بەهێز بوو بە ئاگای هێنایەوە و ئیتر دوای ئەمە هەستی بە حەسرەت و پەشیمانی دەکرد لەو کار وتاوانانەی کرد بووی، ئەگەر خودا بوویستایە ئێستا ئەمیش لە ژێر خاکدا بوو، لەوانەیە خودا نە یبردبێتەوە تاوەکو تۆبە بکات و بگەڕێتەوە.[1]

پێویستە لەسەر لێپرسراوان و بە خێوکەران چاودێری منداڵەکانیان بکەن و سووربن لەسەر پەروەردەکردنیان بە شێوەیەکی ڕاست و چاندنی خۆشەویستی خودا و پێغەمبەرەکەی و ترساندنیان لە سزای خودا و باسکردنی ڕەحمەت و بەزەیی و پاداشتەکانی خودا و بەهەشت بۆیان، لەسەر خو و ڕەوشتێکی جوان پێیان بگەیەنین هەتا ئەگەر گەورە بوون تاکێکی چاك و بە سوودبن بۆ کۆمەڵگا.

خودا دەفەرموێت:

﴿ لَّا تَجْعَلُوا دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾[2]

---

(١) لە ڕۆژنامەی (الرأي العام) بەرەستکاریەوە.

(٢) سورة النور: اية ٦٣.



پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:
(بئس العبد تخيل واختال و نسي الكبير المتعال، بئس العبد تجبر واعتدى ونسي الجبار الاعلى، بئس العبد عبد سها و لها و شي المقابر و البلى)[1]

واتە: خراپترین بەندە کە کەسێکە خۆی بەگەورە دەزانێ و شانازی دەکات و خودای باڵا دەستی لەیاد دەچێت، خراپترین کەس یەکێکە ستەم دەکات و دەست درێژی دەکات و خوای باڵا دەست و جباری لەیادچووە، خراپترین بەندەکە هەڵە دەکات ورادەبوێرێت و مردن و گۆڕو بەڵاکان لەیاد دەکات.

---

(١) راوه الطبراني و الترمزي

# چی پێ بڵێم

هەر سێکیان هەڵەشەیی و ڕابواردن و کاری بێ کەڵك و پوچ کۆی کردبوونەوە، بەڵکو چوار بوون و.. شەیتان هەمیشە چوارەمیان بوو، کاریان خەڵەتاندنی کچانی ساویلکەو بەرەڵا بوو بە گفتی شیرین و هەنگوین ئاسا و پاشان تەڵەیان بۆ دادەنان و بەفێڵ و قسەی خۆش دەیانخستنە داوەکە و کێشیان دەکرد بۆ کێڵگە دوورەکانی دەوری شار، لەوێ قسەی خۆش نەدەما و گورگ ئاسا دەکەوتنە گیانیان، پاڕانەوە نەیدەخوارد لایان، چونکە ئەم بە دڕەوشتانە دڵیان مرد بوو، هەست و ناموس و جوامێری و شکۆمەندیان لە دەست دا بوو، ناڵەی ئەو کیژۆڵە خەڵەتێنراوانە یان نە دەبیست و دڵیان نەرم نەدەبوو بەو ئەسرینانەی دەیانباراند، گرنگ ئەوە بوو نێچیر ڕاو بکەن و چێژی لێ وەبگرن، بەم شێوەیە شەو رۆژ یان دەکردەوە لە کێڵگە و چادرگەکان و هەندێ جار لە نێو ئۆتۆمبیلەکاندا لە ڕۆخی دەریا دا، ئەمانە وەك ئاژەڵ بوون بەڵکو گوڕاتر. وەك هەمیشە هەریەکێکیان نێچیرێکی ڕاوکردبوو، لەو پەڕی تامە زۆرییدا بوون، هەموو شتێك لە کێڵگەکە ئامادەبوو، لەسەر و هەموویانەوە دایکی هەموو گوناهەکان (مەی) بەڵام مەزە و خواردنی ئێوارەیان لە خۆشیاندا لە بیر کرد بوو، یەکێکیان هەستا و ئۆتۆمبێلەکەی کرد بە ڕەشە با، تا بە زووترین کات بگەڕێتەوە و، کاتژمێر شەشی ئێوارە بوو، هاورێکانی چاوەڕوانیان دەکرد و، چاوەڕوانیەکە یان چەند کاتژمێرێکی خایاند، کەوتنە دڵەراوکێ و بۆ دیار نەما؟ چی ڕوویداوە؟ یەکێکیان بڕیاری دا بە دواییدا بڕوات، لە ڕێگەدا چاوی بە دوکەڵ و بڵێسەی ئاگر کەوت لە دوورەوە، بە خێرایی بەرەو لای ڕووداوەکە چوو، تەماشای کرد ئۆتۆمبیلی هاورێکەیەتی و وەرگەراوە و ئاگر لە هەموو لایەکەوە دەیسوتێنێ، خۆی کرد بەناو ئاگرەکەداو بە بێ گوێدانە خۆی هەوڵی ڕزگار کردنی هاورێکەی دا و، بەڵام هاورێکەی تازە نیوەی جەستەی ببووە خەڵوز و، هەر چەندە هێشتا لە ژیاندا ما بوو، دوای ماندوو بونێکی زۆر ڕایکێشا و خستیە سەر زەویەکە، پاش کەمێك چاوی کردەوە و لەبەر خۆیەوە ورێنەی دەکرد

و دەیووت: ئاگر.. ئاگر...، هاوڕێکەی دای بە کۆڵیدا بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکەی خۆی ببات و بیگەیەنێتە نەخۆشخانە، بەڵام بە ناڵە ناڵێکی پڕ گریانەوە ووتی: پێ سوودە ناگەمە نەخۆشخانە و، هاوڕێکەی دەستی کرد بە گریان، دیمەنی هاوڕێکەی دەبینی و لەبەر چاویدا دەمرێ و هیچ دەسەڵاتێکی نی یە کارێکی بۆ بکات؟، ئەوەندەی تر لە ناخەوە دەیسوتاند، لە ناکاو بە دەنگێکی زۆر بەرز کە پڕ بوو لە پەشیمانی و ئازار و حەسرەت: ووتی: چی پێ بڵێم؟.. چی پێ بڵێم؟ هاوڕێکەی حەپەسا لەو قسەیە و لێ ی پرسی: ئەوە کێیە؟
بەکزیەکەوە ووتی: دەنگێکە لە دوورەوە دێت و دەڵێت: الله.. هاوڕێکەی هەستی بە ترس و تۆقین کرد و موچرك بە جەستەیدا دەهات و دەلەرزی، لە پڕ هاوارێکی کرد و کۆتایی بوو، هەناسەی لێ بڕا.[1]
خودایە داوای لەش ساغی و کۆتاییەکی باشت لێ دەکەین، چ کۆتاییەکی خەمناك بوو بۆ ئەم گەنجە نەگبەتە، بەڵام ئەم چیرۆکە پەند و ئامۆژگاری تێدایە بۆ ئەوانەی نقومی گوناە و بەزاندنی سنورەکانی خودا بوون و بە سامان و گەنجی و لەش ساغیان بایی بوون و خۆیان پێ گەورەیە و وا دەزانن نەبراوەی، بەڵام وەك شاعیر دەڵێت:
لعمری قد ضاعت عليهم حياتهم وقد ضيعوا أيامهم في مصائب
(ئای تازە تەمەنیان ڕۆیشت و بەفیرۆ چوو- ئەوان ڕۆژگارەکانیان و لەگرفتاری و کارەسات لە دەست دا.
خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾[2]
پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) دەفەرمووی:
(رأيت الليله رجلين اتياني فأخرجاني فانطلقت معها فإذا بيت مبني مثل بناء التنور اعلاه ضيق أسفله واسع يوقد تحته نار فيه رجال ونساء عراة، فإذا أوقدت النار ارتفعو حتى يكادوا أن يخرجوا فإذا خمدت رجعوا فيها فقلت: من هؤلاء؟!

---

(١) لە (للشباب فقط)
(٢) سورة الاسراء: اية ٣٢





قال هم الزناة).[١]

واتە: ئەمشەو لەخەومدا دوو پیاو هاتن و منیان لەگەڵ خۆیان برد ڕۆشتم لەگەڵیاندا تاگەیشتمە ماڵێك وەك تەنور دروستکرابوو لەسەرەوە تەسك و لە خوارەوە فراوان بوو، ئاگری دەدرایە ژێر و ئافرەت و پیاوی ڕووتی تێدابوو، ئاگرە کە بڵێسەی دەسەند بەرز دەبوونەوە هەتا خەریك بوو دەردەپەڕینە دەرەوە، کاتێك ئاگرەکە کپ دەبوو یەوە دەچوونەوە ناوی ووتم: ئەمانە کێن؟ ووتی: ئەمانە زیناکارانن.

---

(١) رواه البخاري



## تەڵە و داو

هەموو ئاوات و خەمێکی خەڵەتاندنی کچان و دەستدرێژی کردنە سەریان بوو، سەرەتا بە گوفتاری هەنگوینی و پەیمانی درۆ سەرنجی ڕادەکێشان و، دواتر دەگەیشت بە وویست و ئارەزووەکانی هەر نەیدە ناسین و وێڵی یەکێکی دی دەبوو، ئەمە خوو نەریتی بوو، نە ئایین و نە شەرم نە بووتا بیگەڕێننەوە، وەك دڕەندیەکی برسی لە بیا بانێکدا بۆ نێچیر بگەڕێتە برسێتی پێ دا بمرکێنێتەوە بوو.

لە جارێکیان دا کچێکی وەك خۆی کەوتە نێو داوەکەیەوە و، ژمارەکەی خۆی هەڵدا و کچەکەیش پەیوەندی پێوەکرد، وەك نەریتی هەمیشە قسەی خۆشی بۆ دەکرد لە جیهانی خۆشەویستی و سۆز و دڵداری، بە فێڵەکانی توانی کچەکە والیێ بکات خووی پێوە بگرێت و عاشقی بێت، ئیتر ئەم بێ ڕەوشتە هەستی کرد پێگەیوە و کاتی لێکردنەوەی هاتووە تا بیخوات و وەك ئەوانی پێشووتر، بەڵام کچەکە تێ نەکەوت و پێ ی ووت: ئەمەی نێوانمان خۆشەویستی پاکە و تەنها دەبێت بە هاوسەر گیری شەرعی بگەین بەیەك، زۆر ئەملا و ئەولای کرد و وویستی لە خشتەی ببات بەڵام ئەو هەر خۆ ڕاگر بوو. هەستی کرد ئەمجارەیان شکستی خواردووە، ویستی تۆڵەی ئەو لوت بەرزیەی لێ بکاتەوە و وانەیەکی وای بدات قەت لە یادی نەکات، تەلەفونی بۆ کرد دەستی کرد بە باس کردنی عەشقی خۆی بۆی و کەوا بێ ئەو ناژی و شێت بووە بۆی و لەبەر ئەوە بڕیاری داوە بچێتە خوازبێنی، گوایە ئەو وەك هەوا وایە بۆی ئەگەر لێ ی ببڕێت دەمرێت!! کچەکە چونکە ساویلکە و چاو بەست کراو، باوەڕی کرد و پەیوەندی نە پچڕی و قسەی خۆش و دڵداریەکانیان بەردەوام بوو، ئەم درۆزنی بێ ڕەوشتە ئەوەندە تەلەفونی بۆ کرد تا تەواو ئامەزرۆی کرد و پەیمانی پێ دا کەوا ئامادەیە بێتە پێشەوە بۆ مارەکردنی، بەڵام چەند شتێك هەیە پەیوەستە بە ژیانی هاوسەریانەوە و لە تەلەفون دا ناوترێ دەبێت چاوی پێ بکەوێت،





بەڵام هەر ڕەتی دەکردەوە و ئەم بەدکارە توانی قەناعەتی پێ بکات، هەر خۆی شوێنێکی بۆ دیاری کرد، شوێنەکە دەکەوتە کەناری دەریا و کاتەکە سبەینێ بوو، ڕێککەوتن.
بەدکار شادومان بوو، خێرا تەلەفۆنی کرد بۆ هەندێ هاوڕێی وەکو خۆی و پێی ووتن: سبەینێ کچێك دێت بۆ (شالیە) پرسیاری من دەکات، ئەمە وێ لەوێ بن و هەر چیەکتان دەوێ لێ ی بکەن، سبەینێ لەسەر کاتی دیاریکراو کۆ بوونەوە و لە نێو شوێنەکەدا چاوەڕێی نێچیرەکە بوون و وەك سەگ لیك بە دەمیاندا دەهاتە خوارەوە، نێچیر بە پێی خۆی هات و بۆ ڕاوچی دەگەڕا و هاتە نێو شالیە پرسیاری ئەوی کرد، لە ناکاو هەموویان پڕیان دایە، وەك دڕندەی برسی یەکە یەکە کاری خۆیان دەکرد تاوەکو تێر بوون و دامرکانەوە و ئاگری ئارە زوو شەهووەتیان کوژاندەوە، پاشان لە بارێکدا جێیان هێشت سەرە خۆشی دەویست، فڕیان دا و بەرەو ئۆتۆمبیلەکەیان ڕۆیشتن، بەدکاری فێڵباز بەرە و ڕوویان هات و، کە چاویان پێ کەوت بەرزەردە خەنەوە پێیان ووت: چۆن وویستت کارەکەمان تەواو کرد.
زۆر دڵی خۆش بوو، لەگەڵ خۆیدا بردنیەوە بۆ سەیری ئەو کچەی بە قسەی نەدەکر و خۆی نە دەدا بە دەستیەوە، تا ڕق و کینەی بڕەوێتەوە و دڵی بە بینینی ئاو بخواتەوە، بەڵام چاوی بە چی کەوت خەریك بوو گیانی لە داخاندا دەربچێت و بە هەموو دەنگی هاواری کرد: ئەی نەگبەتانە چیتان کردووە.. ئەی لە ناوچن هەی بێ ڕەوشتینە.. ئەوە خوشکەکەمە.. خو.. شکم.. هاوار بۆ من و ئێوە.. خوشکەکەم.
بەڵام بۆ وا؟ چی ڕوویدا بوو؟ خودا وویستی ئەم بەدکارە بە نزیکترین کەسی خۆی تەمبێ بکات و بە هەمان پیلان کە خۆی بۆ خەڵکی دادەنێت، ئەو کچەی دیداری لەگەڵ دا نابوو نەیتوانیبوو بێت و ئەم خوشکە بێ ئاگایە کارێکی بە براکەی دەبێت و نایدۆزێتەوە و تەلەفۆنی داخراوە، بەڵام دەزانێ زۆربەی کاتەکانی لە (شالیە) دایە، لە هەمان کاتدا دەچێتە ئەوێ، بەم شێوەیە ئەو چاڵەی بۆ کچی خەڵکی هەڵکەند خوشکەکەی تێ کەوت و، تاوانبار هەر دەبێ کۆتایی پێ بێت ئەگەر چی ماوەی زۆر بەسەردا بڕوات و، هەر دەبێت بکەوێت و لە هەمان کاسەی دەخواردی کەسانی تری داوە بخواتەوە. چی



بچێنێ دروێنەی دەکات. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ (٩٩) ﴾[١]

پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(المكرو الخديعة و الخيانة في النار)[٢].

واتە:(فێڵ و تەڵەكە و هەڵخەڵەتاندن و خیانەت كار لە ئاگر دایە).

(١) سورة الاعراف: اية٩٩

(٢) رواه ابو داود





## گەمژەیی

کاتێك پێی نایە نێو ئۆتۆمبیلەکەی لووت بەرزی و لە خۆبایی بوون و خۆ بە گەورە زانینی لێ دەباری، بە بێهودە و بێ گرینگیدانە کەس هەرزەکارانە دەسوڕایەوە.

ئەم گەنجە هەموو هۆکارەکانی خراپەکاری و لەناو چوونی تێدا کۆبوویەوە، ئیتر ئەو تازە پێ دەگات و ئۆتۆمبیل و، پارە و، کاتی بە تاڵی هەیە، نازانێ لە چیدا بەسەری ببات، هیچ خەمێکی نی یە تەنها خولانەوە و پۆز لێدان نەبێت بە نێو شەقامەکاندا و بەبێ ئامانج، تەنها کاتەکەی بەسەر دەبات و خۆشی لێ دەبینێ هەروەك شاعیر ڕاست دەڵێ:

أن السباب و الفراغ والجدة مفسدة للمرء اي مفسدة

- "گەنجێتی و بێ کاری و هەبوونی پێکەوە لە ناو بەری مرۆڤە و خراپە دێنە ڕێی.

ئەو هاوڕێیەم بۆی گێرامەوە ووتی: ئەم گەنجە لە خۆ ڕازییە کەوتە پێشمەوە و بە گەورەی لە دوایی ئۆتۆمبیلەکەی نوسیبووی: "أتحدی الموت" بە گژ مردن دادەچم" !!

پاشان ئەم لاوە ئەو پەری خێرایی بە کارهێنا و ڕۆیشت، ئۆتۆمبیلەکەی لە ناوەڕاستی شەقامەکە دا وەرگەڕا و نەیتوانی ڕزگاری بێت و، لە چاوتروکانێکدا کۆتایی بە ژیانی ئەم گەنجە هات کە گاڵتەی بە هەموو شتێك دەهات و[1] بووە هەواڵێکی ڕابردوو، ئیتر چۆن بەرەنگار دەبێتەوە ؟!

بێ گومان ئەم لاوە بەستەزمانە گەنجێتی و دنیا سەریان لێ شێواند و لە خۆی دەرچوو بوو، ئەگینا چۆن مرۆڤێکی لاواز کە هیچ دەسەڵاتێکی نییە بەرانبەر خودا بەرەنگاری مردن دەبێتەوە؟! لای هەموان ڕوونە ڕاکردن لە مردن مەحاڵە،

---

(١) (شێخ خالد حەربی)ی هاورێم ئەم چیرۆکەی بۆ گێرامەوە



چونکە لە هەرچی هەڵبییت دەکەوێتە دوات تۆ لەپێشەوە ڕادەکەیت، جگە لە مردن لە پێشتەوەیە و ڕزگار بوون لیێ ی نیێ یە!! خوای گەورە، دەفەرموێت:

﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٨ ﴾[1]

ئیتر ڕاکردنی چی لە شتێك کە حەتمی یە.خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ۝١٨ ﴾[2]

پێغەمبەری نازداریشمان(صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(ألا أخبركم بأهل النار؟ كل عتل جواظ مستكبر)[3]

واتە: " ئایا پێیتان بڵێم کە خەڵکی نێو ئاگر کێن؟ هەموو کەسێکی خۆ بە گەورە زان و لە خۆبایی کە بەسەر زەوی دامنەت دەکات".

---

(١) سورة الجمعة: اية (٨).

(٢) سورة لقمان: اية ١٨.

(٣) متفق عليه

## تەمەن بە فیڕۆ دان

لاوێکی چالاك و چووست بوو، بە هاری تەمەنی بوو، کاری دەکرد و دڵسۆز بوو بۆ کارەکەی و وای لێکرد بوو کەس و کاری و هاوڕێیانی و خەڵك خۆشیان دەویست، بەڵام هەمیشە لەتەلەفزیۆندا تەماشای فلیمی ڕووت و ئەو زنجیرانەی دەکرد کە مەبەستیانە خەڵك لڕەوشت لابدەن و عەقڵی گەنجەکان ببەن،کاتێك تەماشای دەکرد هونەرمەندان نێرگەلە دەخۆنەوە بەلایەوە دیمەنێکی جوان بوو، بەڵام تاقی نە دەکردەوە تەنانەت جگەرەشی نە دەکێشا، بەڵام ئەوەندەی لە تەلەفزیۆندا بینی تامەزرۆی بوو و حەزی دەکرد خۆی تاقی بکاتەوە، هێشتا هەر سەر قاڵی کاری ڕۆژانەی بوو هەوڵی بۆ نەدا، تا ڕۆژێکیان لەگەڵ هەندێ هاوڕێیدا چوونە نێو قاوەخانەیەکە دانیشت، گار سۆنەکە هات و سینیەك چای بۆ هێنان و پاشان جارێکی دی هاتەوە و نێرگەلەی بۆ هێنان، هاوڕێکانی دەیا نخواردەوە، ئەم تەنها لێ ی دەڕوانین، ئەوان دەرفەتیان لەبێ دەنگەیەکەی وەرگرت و پیان ووت: دەبینین تەماشامان دەکەیت، ئەی بۆ تاقی ناکەیتەوە؟ زۆر خۆشە.. سەرەتا دوو دڵ بوو بەڵام وازیان لێ نەهێنا و.. تاقی کردەوەو ئەمە سەرەتا بوو بۆی، بوو بە یەکێك ئەندامانی ئەم قاوەخانە ژەهر فرۆشەو ئالودەی نێرگەلە بوو، دوای ماوەیەك دەنگی گرو نوسا، یەکێك لە هاوڕێکانی ئامۆژگاری کرد هەندێ ئاوی گژ و گیایی بخواتەوە، بەڵام بێ سود بوو، دواتر چووە لای پزیشك و دەرمانی وەرگرت بێ سوود بوو، دوایی شیکردنەوە و پشکنینی وورد دەرکەوت تووشی شێر پەنجەی قوڕگ بووە و، دەستی کرد بە وەرگرتنی چارەسەر، کاتێك هاوڕێکانی بەنەخۆشیەکەیان زانی چوونە لای پزیشکی سەرپەرشتیاری نەخۆشیەکەی و هەواڵیان پرسی، پێ ووتن: هاوڕێکەتان بە هۆی کێشانی نێرگەلە و جگەرەوە تووشی بووە، هاوڕێکەی بە پزیشکی ووتی: بەڵام ئەو ناکێشێت!! پزیشکەکە لەوەڵامدا ووتی: ئەم نەخۆشیە بەبێ ئەو هۆکارە تووشی نابێت بە تایبەتی ئەم بەشەی تووی بووە.

ئیتر هاوڕێکانی زانیان چی دەکێشا و، دوای ماوەیەك چووەدەرەوەی وڵات بۆ

چارەسەر، بەڵام بێ سوود بوو نەخۆشیەکە بەسەریدا زاڵ بوو بوو هەر ماوەیەکی کەمی پێچوو لە هەرەتی لاویدا گیانی لە دەست دا[(١)].

خودایە داوای لەش ساغی و سەلامەتیت لێ دەکەین، ئەمە سەرەنجامی ئەو ڕابواردنە ژەهراویە بوو بووبە کۆتا هێنان بە ژیانی ئەم گەنجەی هێشتا سەرەتای ژیانی بوو، گوناهی بە ملی ئەوانەی ئەم جۆرە ژەهرانە لەبەر چاوی خەڵك دەڕازێننەوە و لە تەلەفزیون و ڕۆژنامەکاندا پڕ و پاگەندەی بۆ دەکەن، بۆتە هۆی ئەوەی زۆر کەس ئالودەی ببن و بۆتە نەریتێکی خراپ لە قاوەخانەکاندا بەر بڵاوە و ئەم ژەهرانە دەفرۆشن و، گەورەو بچوك سەریان تێکردووە و تەمەن و تەندروستی و کات ئیمانیان لێ دەفەوتێنێ و سامانیان لە ڕێگەی نەفامیدا خەرج دەکەن و! بۆ چی دەوڵەت++++ ئەم شوێنی پەتا و نەخۆشیانە داناخات؟ چونکە ئەو لێپرسراوی یەکەمە لە بەهەدەر چوونی تەمەنی ئەم تازە نەمامانەدا و بێ گومان لە کۆتاییدا لە ڕۆژی دواییدا بەرپرسیارن .

لە لایەکی دیکەوە پێویستە دایك و باوك و بەخێوکار ووریا یانە هەڵس و کەوت بکات و ئاگاداری ڕۆڵەکانیان بن و نەهێڵن نێچیرێکی ساویلکە بکەونە نێو داوی ئەوانەی بەم خووانە منداڵەکانیان تیا دەبەن لە خشتەیان دەبەن. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾[(٢)].

(١) هاوڕێ بەڕێزم محمد صقر الجاهر ئەم چیرۆکەیان بۆ گێرامەوە.

(٢) سورة یونس: اية ٢٧

## هەنگاوەکانی شەیتان

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:
(لاتصیب عبدا نکبه فما فوقها أودونها إلابذنب، وما یعفو الله عنه کثیرا) و پاشان لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت:
﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠ ﴾[1][2]
واتە: "هەر نەگبە تی و بەلایەك بەسەر مرۆڤدا دێت بە هۆی تاوانەوەیەکە خۆی دەیکات و، لە زەر تاوانیش خۆش دەبێت".
ئەنوەر زانکۆی تەواو کرد بوو بە ئەندازیار، باوکی نوسینگەیەکی زۆر مەزن و ناوازەی بۆ دانا و ئۆتۆمبیلێکی بە دیاری بۆ کڕی و، بەڵێنی پێ دا ڤێلایەکی زۆر گەورەی بۆ کاتی هاوسەرگیری کردنی بە دیاری پێ بدات، باوکی ئەنوەر بەڵێندەر بوو، لە یەکێك لە پرۆژەکاندا دروست کردنی بینایەکی حکومی بۆ دەرچوو ئەندازیارێکی کچ بە ناوی (س. و) ئەندازیاری سەرپەرشتیاری ئەم پرۆژەیە بوو، زۆر جوان و بێ وێنە بوو، باوکی ئەنوەرەی سەرسام کرد بوو. لەگەڵ ڕۆژگار دا زیاتر پەیوەندیان پەرەی سەند و بەرژەوەندی کەسێتیان تێکەڵ کرد بە ئارەزووی ئاژەڵانە و سۆزداری، ئەگەر چی جیاوازی تەمەن زۆر بوو لە نێوانیاندا، بەڵام باوکی ئەنوەر بە پارە و دیاری چاوی کچەی ئەندازیاری کوێر کرد بوو، شەیتان سێ یەمیان بوو پیرۆزبایی خۆی پێش کەش کردن و بە بێ ترس و شەرم کەوتنە داوێن پیسیەوە و چەند جارێك ئەمە دووبارە بویەوە، تا سەر ئەنجام کچە ئەندازیار سکی لە بەڵێندەر پڕ بوو، ئەم هەواڵەی گەیاندە عاشقەکەی و پێ ی ڕاگەیاند سکی دوو مانگە و لەگەڵ ئەوەی

---

(١) سورة الشوری: اية ٣٠
(٢) لە (مصابیح السنة)



بەڵێندەر تەمەنی زۆر لەو گەورە تر بەڵام ئەم ڕازی یە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، بەڵێندەری پیر ئەگەر چی تەمەنێکی بەڕێ کرد بوو بەڵام چێژی لە حەرام دەبینی و کەوتە نێو لیتە و قوڕاوەوە و پێشنیارێکی شەیتانی پیسی بۆ کرد، ئەویش ئەوەیە منداڵە کە لە بارببات و دەیکاتە بووکی خۆی ء دەیدات بە(ئەندازیار ئەنوەر)،وکچەی ئەندازیار لە هەمان پێڕی بەڵێندەر بوو، ئەڵقە لە گوێی شەیتان بوو لە هیچ شتێك نە دەگەڕایەوە لە پێناوی ئارەزووەکانی دا، ڕازی بوو منداڵەکەی لەبار برد و، بەڵێندەر بە هەموو هۆکار و هەوڵێك کەوتە ڕازی کردنی کوڕەکەی، بەڵام کوڕەکەی ملی نەدەدا و بە باوکی دەووت: ئەو کچە دەناسم و ڕەوشتی لە زانکۆ هەر باش نەبوو، هەمیشە پەیوەندی نا بەجێ ی لەگەڵ هاوەڵە کوڕەکانیدا هەبوو، بەڵام باوکی تووڕە بوو هەڕەشەی لێکرد کەوا لە هەموو شتێك بێ بەشی دەکات لە ڤێلا و ئۆتۆمبیل و نوسینگە و ناهێڵێت هیچ پرۆژەیەکی پێ بدەن چونکە پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسان باش بوو دەستی دەڕۆیشت.

ئەنوەر ناچار ملی کەچ کرد بۆ داواکەی باوکی و کچە ئەندازیاری (س. و)ی مارەکرد و گواستیەوە، چەند ڕۆژێك تێپەڕی و پەیوەندی نێوان کچە ئەندازیار و خەزووری دەستی پێ کردەوە و، (س.و) سکی پڕ بوو، بەڵام دڵنیا نەبوو ئایا لە جەنابی ئەندازیارە یان لە باوکی!! دوانەیەکی بوو.

باوکە بەمەوە نەوەستا بەڵکو بە ئەنقەست کوڕەکەی دەنارد سەرپەشتی پرۆژە دوورەکان بکات و دەینارد سەر و کاری بەڵگەنامە و بەڵێنەکانی لەو شوێنە دوورانە بۆ بکات، تاوەکو تەواو لەگەڵ بووکەکەیدا نقوم ببێت لە خراپەکاری دا. ئەمجارەیش (س.و) سکی پڕ بوو، بەڵام دڵنیا بوو لە خەزووریەتی، چونکە کاتی سکپڕیەکەی هاوسەرەکەی لە ماڵ نەبوو لەسەر کار بوو.

دووبارە دوانەیەکی تری بوو، کوڕێك و کچێك!!

(س.و) پەیوەندیەکەی بەردەوام بوو لەگەڵ بەڵێندەرو جەنابی خەزوور بە حەرامی، لەبەرامبەر دا باوکەکە نقومی پارە و سامانی کرد بوون و بە خێوی دەکردن.

ڕۆژێکیان کوڕەی بێ ئاگا و فریودرا و لە کارێك زووتر لە وادەی خۆی گەڕایەوە، تەماشای کرد ئۆتۆمبیلەکەی باوکی لە نێو گەراجەکەیانە و بە ئەسپایی بە قادرمەکاندا سەرکەوت بۆ سەرەوە تا ژووری نووستن و لەوێدا باوکی





و ژنەکەی پێکەوە بوون، وا دەردەکەوت پەیوەندیەکی ئاسایی نییە وادیار بوو کاری حەرام پێشتر ئەنجام درا بێت، کاتێك هەستیان پیێ کرد و خۆیان ئاسایی کردەوە و گوایە هیچ نەبووە، ئەندازیار داما و تێگەیشت پەیوەندیەکی حەرام باوکی و ژنەکەی کۆکردۆتەوە و بەڵام خۆی گرت و دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە ژنەکەی دوایی ئەوەی باوکی ڕۆیشت و، تووڕەییەکەی خۆی کپ کردەوە، بەڵام دوایی دڵنیابوون سبەینیێ سەر لە نویێ کێشەکە هاتەوە ئاراوە و ووتوێژکرا و تاوانباری کرد کەوا ئەم منداڵانە هی ئەم نین و. زۆڵن، ژنەکەی نکۆڵی لیێ کرد و تفێکی کردە نێو چەوانی و بە ناپیاوی تاوانباری کرد و ئەنوەر ماڵی بە جێهێشت و ئاگر لە چاوەکانی دەردەپەڕین، بەرەو لای باوکی ڕۆیشت و شتەکانی زانیبووی دایەوە چاوی دا و هیچ لە نێوانیاندا نەما و بڕاندیەوە.

بەڵام ژنەی بەدکار و گرفتار لە ترساندا جۆرێك لە هستریای گرت و نیمچە تێکچوونێکی مێشکی بەسەر داهات و لەو باڵەخانە بەرزەوە یەکە یەکە جگەر سۆزەکانی هەڵدایە خوارەوە بەبیێ سۆزو بەزەیی و خەڵکێکی زۆر لە خوارەوە بوون و تکایان لیێ دەکرد وا نەکات، بەڵام بیێ سود بوو.[1]

بڕوانە ئارەزوویەکی شەیتانی هۆکاری هەموو ئەم تاوانە دڕندە و قێزەونانە بوو، ناچێتە عەقڵەوە شتی وا ڕوودات بەڵام چێژی حەرام و شوێن کەوتنی شەیتان وای لێکردن، خودای باڵا دەست لە قورئان دا بە ڕوونی باس لە تەونەکانی شەیتان و فێڵەکانی دەکات و ئاشکرای کردووە بۆمان تاکە خەمی ئەوەیە نەوەی ئادەم بخاتە نێو داوەکانی و بۆ لای خۆی ڕایانبکێشێت، خودا دەفەرموێت:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾[2]

پێغەمبەری پێشەوامان (صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی:

---

(١) لە (جريدة الانباء)ەوە.

(٢) سورة النور: آية ٢١.



(أن ابليس يضع عرشه على الماء ثم يبعث سراياه فأدناهم منه منزلة أعظمهم فتنة. يجيء احدهم فيقول ماتركت حتى فرقت بينه و بين امرأته.. فيلزمه و يقول: نعم انت! ) [1]

واتە: "شەیتان تەختی خۆی لەسەر ئاو دا ئەنێ و سریە و نێردەکان بڵاوە پێ دەکات، کامیان لە هەمووی پلەی نزمترە لە هەمووی زیاتر داوی زیاترە و گۆبەند دەنێتەوە.. یەکێکیان دیتە وە بۆلای و دەڵێت وازم لێ نەهێنا تا خۆی و ژنەکەیم جیانەکردەوە.. لەلای خۆی دادەنێت و دەڵێن: تۆ زۆر باشیت!"

---

(١) رواه مسلم.





## هاوار و ناڵەکانی پەشیمانی

ئەمەیان چیرۆك نی یە، بەڵکو پرسیار و وەڵامی یەکێك لە ڕۆژنامە نووسەکانە کە ئاراستەی کۆمەڵێك نە خۆشی (ئایدز)ی کردووە، وەڵامەکانیان ئەو پەڕی پەشیمانی و داخی لێ دەچۆڕێ، کە گەیاندنی بەم ڕۆژگارە و ئاگادار کردنەوەیەك بێت بۆ جگە لە خۆیانە تاوەکو لە حەرام بە دووربن و لە دنیا و دوا ڕۆژدا خۆیان لەناو نەبەن.

ڕۆژنامەنوسەکە دەگێڕێتەوە کەوا: بەبێ ئاگاداری لێپرساوانا چوومە بەشی ئەو نەخۆشانەی بە هۆی (ئایدز) جیا کرا بوونەوە و کەس هەستی پێ نەکردم، تاوەکو باس لە باری خراپیان و ناخۆشیەکانیانم بو بکەن و بە چیەوە دەناڵێنن لە یەکێك لە ژوورەکاندا کوڕێکی لێ بوو لە بیستەکانی تەمەنی دا بوو، بەبێ توانا لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکێشا بوو، تەنها ئێسکە پەیکەرەکەی مابویەوە، پیرێژنێك لە تەنیشتی دانیشتبوو، لە ڕوخساریدا پەژارەو خەفەت و ئاخ دەخوێندرایەوە و، خواردنی بۆ هێنا بوو، بەڵام بۆی نە دەخورا، دایکەی بەستەزمان نەیدەزانی نەخۆشی کوڕەکەی ئایدزە و بەردەوام دەهاتە سەردانی، دوایی ڕۆیشتنی دایکی لێم پرسی: چی ئەمەی بە سەردا هێنایت و پەکی خستیت؟

ووتی: براکەم قەناعەتی پێ هێنام پێکەوە سەفەربکەین و لەوێ شەیتان کارە خراپەکانی لەبەر چاو ڕازاندینەوە و کەوتینە نێو تاوانی زیناوە، پاش ئەوە بۆم دەرکەوت تووشی ئایدز بووم و ئارامم لێ برِا و نەم دەزانی چی بکەم، لە پەشیمانی و حەسرەتی ئەوەی لە فەرمانی خودا دەرچووم زۆر گریام، کەس بە نەخۆشیەکەم نازانێ جگە لە براکەم، ئێستا تاکە شتێك چاوەڕێ ی بکەم لە هەموو ساتەکانمدا مردنە.

ووتی: هیچ پەیامێکت نی یە بیگەیەنم بە لاوان؟

ووتم: ئەڵێم زۆر ئاگاداری سەرپێچی کردن بن، چونکە تەنها نەخۆشی و ڕیسوایی و سەر شۆڕی بە دوایی خۆیدا دەهێنێت و پەشیمانیش دادت نادات.

پاشان ڕۆژنامە نوسەکە دەڵێت: چاوم کەوت لە نێو ڕاڕەوی نەخۆشخانەکەدا بە ژنێك کچە بچووکەکەی لە باوەش گرتبوو!! لێم پرسی: لەگەڵ ئەم کچە بچوکەدا لێرەی چی دەکەی؟!



- لە وەڵامدا ووتی هاوسەرەکەی تووشی ئایدز بوو بوو، ئەم منداڵە بەستەزمانە باجی هەڵەیەك دەدات هیچ دەستێکی تێدا نەبووە.
ووتم: ئەی چۆن زانیت تووش بووە؟
ووتی: هاوسەرەکەم زۆر نەخۆش بوو، لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانەوە ناردیان بۆ نەخۆشخانەی نەخۆشیە گوازراوەکان، لەوێ دۆزیانەوە ئەم نەخۆشیەیەتی.
ووتم: هاوسەرەکەت و تۆ ئەم هەواڵەتان بەلاوە چۆن بوو؟!
ووتی: نازانم بارێکی هیستریا بەسەرمدا زاڵ بوو، هاوارم دەکرد و هەر چیەکم بەرچاو دەکەوت دەمشکاند و وەك شێتم لێ هاتبوو، بەڵام هاوسەرەکەم ڕۆژانە و چەند بارە هەست بە ئازاری و یژدان و پەشیمانی دەکات، چونکە تەنها ژیانی خۆی لەناو نەبردووە بەڵکو هاوسەر کچە کەیشی تیا برد.
ووتم: ووتەیەکی کۆتاییت هەیە بیڵێیت؟
- بەڵکو هاوارو ناڵەیەکە لە ناخمەوە دێت بۆ هەموو پیاو و گەنجێك کەوا بۆ چێژێکی کەم و بەسەر چوو ملکەچ نەبن کەوا بە درێژایی تەمەنیان پەنجەی پەشیمانی بۆ بگەزن و بەخێرایی خۆیان تیا ببەن، ئەوە تا من ئازار دەچێژم و هەست دەکەم ڕۆژانە چەند جارێك دەمرم بە هۆی ئازاری ئەم کچەم کە هیچ دەستەڵاتێکی لەم تاوانەدا نەبووە و ئەم ئازارە بە خۆڕایی دەچێژێ. [1]
ئەمە وێنەیەك بوو لە گرفتاری ئەم نەخۆشانەی، تەنها چەند ساتێکی کەم و ڕابواردنێکی حەرام و ئارەزوویەکی ئاژەڵانە و فریودانی شەیتانی هۆکاربووە بەرە و کۆتاییەکی پڕ حەسرەت و پەشیمانی و دەرونی تێك شکاویان بکات. ئەوەتا یە خودا گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴾ [2]

پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:
(أذا ظهر الزنا و الربا في قرية فقد أحلوا بأنفسهم عذاب الله) [3]
واتە: (ئەگەر لە شوێنێك زینا و سوو خواردن بڵاوەی کرد و دەرکەوت ئەوا سزای خودایان بۆ سەرخۆیان بەرەوا بینیوە و دایدەبارێنن).

---

(١) لە (جريدة الرأی العام ) ژمارە ١٠٩٩٠.
(٢) سورة الاسراء: أية ٣٢.
(٣) رواه الحاكم.

# بەشی پێنجەم: سزای تاوانەکان

یەکەم: سزای خۆ ڕووت کردنەوە

دووەم: کڕین و فرۆشتنێکی زیانبەخش

سێ یەم: دەروونە ئاوازەکان

چوارەم: ئاگادارکردنەوە

پێنجەم: سەرەنجامی خۆ بەزل زانین

شەشەم: فێڵباز

# سزای خۆ ڕووت کردنەوە

لە حارپی کوڕی ئەسەدی محاسبی و ئەصبنع و خەلەفی کوڕی قاسم و کۆمەڵێکەوە گێڕاویاتەوە لە سعیدی کوڕی سەلەمە ووتی: ژنێك لەلای عائیشە بوو- ڕەزای خودای لێ بێ و لەویش ڕازی بێ دەیووت: من بەڵێنم داوە بە پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) کەوا هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکەم و دزی نەکەم و زینانەکەم و منداڵ لەسکمدا نەکوژم و بوختان هەڵنەبەستم و لە کاری چاکەدا سەرپێچی نەکەم، من ئەم بەڵێنەی خۆمم جێ بەجێ کردووە و خوداش ئیتر سزام نادات. شەو لەخەوی دا فریشتەیەك هاتە خەوی و پێ ی ووت: نەخێر تۆ جل و بەرگی دا پۆشراو لەبەر ناکەیت و جوانیت دەردەخەیت و دەستت لە خێر کردن دا ڕژدە و ئازاری دراوسێت دەدەیت و گوێڕایەڵی مێر دەکەت نیت، پاشان هەر پێنج پەنجەکەی دا بەدەم و چاوی دا و پێی ووت: پێنج بە پێنج ئەگەر زیاتری بکەیت بۆت زیاد دەکەین، سبەینێ هەستا و شوێنی پەنجەکانی لەسەر دەم و چاوی مابوو [١].

زۆربەی ئافرەتی ئەم سەردەمە نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و ڕۆژوو دەگرن و حەج و عمرە دەکەن، بەڵام خۆیان دا ناپۆشن، کە ئەمەش ئیمانەکەیان کەم و کورت دەکات حوکمی خودا و پێغەمبەرەکەی دەشکێنن، با ئاگادار و ووریا بن مردن لە ناکاوە و ژیان زۆر کورتە و گوڕ زۆر تەنگ و تارە و ڕۆژی دوایی ڕۆژێکی زۆر تەنگانە و قورسە.. با ووریا و ووریا بن...

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [٢].

---

(١) رواه الحاكم.

(٢) سورة النور: أية ٣٠.





پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

(مامن امرأة تخلع ثيابها في غير بيتها ألاهتكت سترما بينها و بين الله) [1].

المناوی لە (فیض القدير) دادەلێت: (أيما إمراءة تخلع ثيابها في غير بيتها) بەڵگەیە لەسەر دەرخستنی بۆ کەسانی نامەحرەم و خۆ دانەپۆشیێ لێان، پەردەی نێوان خۆی و خودا ناهێلێت و، ئەو بەرگەی خودا ناردوویەتی و بەرگی تەقوایە لێ دادەماڵرێت و، کەواتە ئیتر خۆی پێ ناپارێزرێت و خیانەت لە هاوسەری دەکات و خوداش پەردە لەسەر کارەکانی لادەبات.

(٢) رواه ابو داود و ترمذي و صححه الالباني.



## کڕین و فرۆشتنێکی زیان بەخش

(ص- م) لەگەڵ هاوڕێیەکی ڕێك کەوتن مەی بێنن و بازرگانی پێوەبکەن و پیلانێکیان بۆ ئەم کارەدانا، (ص- م) ڕێگەپێدانی هێنانی (خەڵوز) لەم کۆمپانیایە وەربگرێت و دابەشی سەر کۆمەڵە هەرەوەزیەکان و لە بری دا خاوەنی کۆمپانیاکە ڕێژەی لە سێ ٣٪ ی نرخی هاوردەکان بۆ خۆی ببات، خاوەنی کۆمپانیاکە ڕێگە پێدانەکەی پێ بەخشی و ڕێکەوتنیان ئیمزا کرد، بەڵام نیازی (ص- م)ی نە دەزانی، دەستی کرد بە هێنانی خەڵوز و لە نێو حاویە دا دایاننا کە پێشتر شوێنێکی نهێنیان لە نێویدا دروست کرد بوو بە لەحیم گرتبوویان و پڕیان کردبوو لە کارتۆنە شووشەی مەی و بیرە.
لەم لاوە هاوڕێکەی تری کۆگایەکی بە کرێ گرت لە دوایی ڕزگار بوونی لە سنور لەوێ دایبنێن حاویەکە گەیشتە سنور و پاش تەواو بوونی ڕێگە و بەڵگەنامەکان فەرمانی کرد بە شوفێرەکە بیبات بۆ ئەو کۆگایەی کە هاوڕێکەی دیاری کردبوو، دوایی پشکنین و گومرگ بەرەو کۆگا کە ڕۆیشت، لێرەدا (ص- م) بە شوفێرەکەی ووت بڕوات و ئەمان خۆیان بە تاڵی دەکەن، خۆی و هاوڕێکەی دەستیان کرد بە هەڵپچراینی شوێنە نهێنی یەکە و ناچار بوون ئامێری لەحیم کردن بۆ کردنەوەی بەکاربهێنن، بەڵام لە کاتی هەڵپچڕینەکەدا ئاگرێکی گەورە لەشت و مەك و کۆگاکە بەربوو، دانیشتوانی شوێنەکە هەواڵی پۆلیسیان دا و دوایی کوژاندنەوەی ئاگرەکە لێکۆڵینەوە یان لە هۆکارەکەی کرد ئاشکرابوو هۆکارەکە (مەی)ەکانی نێو حاویەکە بووە و ڕاپۆرتی بەڵگەو لێکۆڵینەوەکان دەریخست شوێنێکی نهێنی لە نێو حاویەکەدا بووە و (١٦٦٢) شوشەی مەی و هەروەها (٩٣٥) قوتوی بیرەی تێدا بووە.
دادگا حوکمی چوار ساڵ زیندانی بەسەر (ص-م) وهاورێکەیدا سەپاندو لەگەڵ کارکردنی قورس جێبەجێ کردنی فەرمانەکە و هەروەها دە هەزار دینار غەرامەی لێ سەندن[1].

---

(١) لە (جريدة الانباء )ەوە.





ئەمە کۆتایی ئەم کارە خراپە بوو، ئەوانە بە تەمایی قازانجی خێرا بوون و، ئیتر گرنگ نەبوو لایان بەرێگەی حەرامە یان نا، گرنگ دەستکەوتنی سامانە و بەهەر هۆکارێك بێت، زیان بە خەڵك بگەیەنێت بازرگانیەکەیان و خراپە بڵاو بکاتەوە بایەخی نی یە، چونکە ئەم خۆپەرستانە تەنها لە بیری خۆیاندا و تێر کردنی وویستەکانیاندا بوون، بەڵام سەر ئەنجامیان لە دەستی خۆیان دەر چوو وەك خودا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾[1].

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(لعن الله الخمر و شاربها و ساقيها و مبتاعها و بائعها و عاصرها و معتصرها و حاملها و المحمولة اليه).

واتە: "نەفرەتی خودا لەمەی و ئەوەی دەیخواتەوە و ئەوەی دەیهێنێت و دەیفرۆشێت و دەیکڕێت و ئەوەی دەیگوشێت و ئەوەی پێ ی دەگوشرێت و ئەوەی هەڵیدەگرێت و بەوەیش کە هەڵی دەگرن".

---

(١) سورة النور: أية ١٩.



## دەروونە لاوازەکان

جادووگەرێك و یەکێکی دی کە پێ یان دەوت یاریدەدەری جادووگەر گەیشتنە کوەیت ساڵی ١٩٩٦ز، هەرکە گەیشتە لە نێو خەڵکدا پڕوپاگەندە بڵاوکرایەوە کەوا دەتوانن نەخۆش چاك بکەنەوە و ڕوحەکانی لە دڵە ڕاوکێدان و لایەنی دەروونیان شیفا بدان، خەڵکێکی زۆر باوەڕی بەم درۆ و دەلەسە و پڕوپاگەندانە کرد و ڕژانە لای جادووگەر و سامان و پارەی خۆیان بە فیرۆ دەدا، تاوەکو چاك ببنەوە.

دوایی ئەوەی ئەم جادووگەرە بینی ئەم خەڵکە چەند گەمژە و ساویلکەن ویستی زیاتر یاری بە عەقڵیان بکات و بە فێڵ و درۆ پارە و سامانیان لێ بفڕێنێ، پاشان لە دانیشتنێکدا کە لێپرسراوی بانقێك و بازرگانێکی لێ بوو ڕایگەیاند کە دەتوانێ پارە لە ئاسمانەوە ببارێنێ!! ئەم ساویلکانەی هەڵخەڵەتاند کە دەیانویست بە هەر هۆکارێك بووە بگەنە ڕیزی دەوڵەمەندە ملیونەرەکان، بەم شێوەیە ئەم دووجادووبازە ڕێکەوتن کەوا بچنە ناوچەیەکی دوور ئەم کردارە جادوویە ئەنجام بدەن، لەوێ یەکێکیان چووەژوورێکەوە بەتەنیا و، پاش ماوەیەك هاتە دەرەوە و ڕایگەیاند کەوا پارەی لە ئاسمانەوە بۆ باریوە وئەو سندوقەی پێشتر ئامادەیان کردبوو پڕبووە و، زۆرێك لە خەڵك لەوێ بوون و بینیبوویان و دەستیان لێ دابوو، بەڵام جادووگەرەکە داوای لێ کردبوون لە سەندوقەدا بێت و ناتوانن خەرجی بکەن تاوەکو تێکەڵ بە پارەی تر نەکرێت.

لێرەدا لێپرسراوی بانقەکە و ژنەکەی و بازرگانەکە تەماح کوێری کردن و خێرا نزیکەی سێ سەد هەزار دیناریان کۆکردەوە و دایانە دەستی جادووبازە تاوەکو تێکەڵ بە پارەی سندوقەکەی بکات، جا دووگەر بەڵێنی پێ دان تێکەڵی بکات و ئاوی (دمدم) بپرژێنێ بەسەریدا کە بەقسەی خۆی لە یەکێك لە دەوڵەتە ئەفریقیەکاندا هەیە و زۆر گرانە، ئەم گێژ و ساویلکانە باوەڕیان بەم درۆ زەقانە و خەیاڵاتانە کرد، چونکە تەماحی بینایی برد بوون و باوەڕیان بە فێڵەکانی کرد، جادووباز هەر کە پارە گەیشتە دەستی دووبارە نە بینرایەوە و، دواتر دەرکەوت





هیچ نەخۆشیەکی چاك نەکردبویەوە و تەنها درۆی لەگەڵ کردبووت گوایە پەیوەندی بە هێزی زۆر گەورەوە هەیە لە چارەسەری نەخۆشیەکانیدا[1].
ئەمانە پارەو ڕەوشت و پێش هەموو شتێك ئاینەکەیان لە دەست چوو ئەگەر نەگەڕێنەوە وتۆبە نەکەن.
بەبێ بیرکردنەوە و عەقڵ کەوتنە شوێن جادووگەرێك و باوەڕیان پێ کرد، دەبوایە بیانزانیایە کەوا جادوو لە ڕاستیەوە دوورە و، ئەگەر ئەم کابرایە بیتوانیایە پارە ببارێنێت ئەوا خۆی دەکردە ملیونەر !! سوودی بەخۆی دەگەیاند، بەڵام سوودی لە کزی ئیمانیان بینیوە وفێڵ و پیلانەکانی بەکارهێنا و سوودی لە چاو برسێتی ئەمانە بینی و نزیکەی نیو ملیۆنی لێ کێشانەوە و بۆی دەرچوون، هەندێ جار خۆشەویستی دنیاو ڕۆچوون تێیدا و کۆکردنەوەی سامان بەبێ گوێدانە سەرچاوەکەی حەڵاڵە یان حەرام و بەبێ ترس لە خودا و مرۆڤ بەرەو خەسارەت و دۆڕانێکی گەورەیان دەبات لە دنیا دا و خودا دەزانێ لە دوا ڕۆژدا چییان بەسەر دێت.
خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾﴾[2].

پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:
(ثلاثة لايدخلون الجنة: مدمن الخمر ومصدق بالسحر، وقاطع رحم).
واتە: (سێ جۆر لە خەڵك ناچنە بەهەشت: کەسێك ئالودە بووەو هەمیشە مەی دەخواتەوە و، کەسێك باوەڕ بە جادوو دەکات و، کەسێك پەیوەندی کەس وکار دەپچڕێنێت).

---

(١) لە (جريدة الابناء ) بە دەستکاریەوە.
(٢) سورة طه: أية ٦٩.



# ئاگادار کردنەوە

خانوویەکم کڕی و خاوەن خانووەکە ووتی: من دیاریەکت پێ دەدەمەوە بە هۆی کڕینی خانووەکەم، دیاریەکەی ئەوە بوو سەتەلایتەکەی نەبرد و بۆی جێهێشتم، لە دڵی خۆمدا ووتم: خودا بیبڕێت بۆ چ دیاریەکی پێی دام، شکاندم و پەیوەندیم کرد بە یەکێك لە کۆمپانیاکانی لێکردنەوەی ئامێرەکە و فڕیدانی، ئەو کرێکارانەی هاتن بۆ لێکردنەوەی ئامۆژگاریم کردن کەوا ئەم کارەیان حەرامە و کارێ‌ی دی بکەن تا خودا فەڕو بەرەکەت بخاتە کاریانەوە و پەیمانیان پێ دام و پرسیاری ناوی بەڕێوەبەری کۆمپانیاکەم لێکردن، کە ناویان پێ ووتم دەمناسی چووم بۆلای و پێشوازیەکی گەرمی لێکردم و منیش ئامۆژگاریم کرد و ڕوونم کردەوە کە ئەم کارەی حەرامە و خراپە بڵاو دەکاتەوە و کارێکی دی بکات تاخودا خێر و خۆشی بەسەر منداڵەکانیدا ببارێنێ.

ووتی: کەواتە تۆ بووی قسەت بۆ کرێکارەکانم کردووە و بەهۆی ئامۆژگاریەکانتەوە کاریان بەجێ هێڵاوە.

ووتم: بەڵێ، هیوادارم تۆیش بەهەمان شێوە ئامۆژگاریەکانم لە گوێ بگرە و ئەم کارە خراپە واز لێ بێنە.

ووتی: گوێبگرە براکەم، بەم کارە پارەیەکی زۆرم چنگ دەکەوێت و، بازاڕی زۆر باشە و خەڵك زۆر دەیکڕێت چۆن وازی لێ دەهێنم.

ووتم: ئەوەی لای خودایە باشترە، ئەگەر ئەم کارە لەبەر خودا وازی لێ بێنیت، خودا بە حەڵاڵی ڕۆزی خۆی بەسەرتا دەڕژێنێ و بەرەکەتی تێدەخات.

ووتی: دوایی ئەوەی ئەو هەموو قازانجەم لێ کردووە هەرگیز وازی لێ ناهێنم.

پێم ووت: من ئامۆژگاریم کردی و داواکارم ڕێنموونیت بکات بۆ ڕێگەی چاك و ڕەزامەندی خۆی.

بە تێپەڕبوونی کات سامانێکی زۆر بەسەر ئەم پیاوەدا ڕژا، هەرچەند پارەی زیاتر دەبوو تینووتر دەبوو، ڕۆژێك بە خێرای ئۆتۆمبیلی لێ دەخوڕی و تووشی کارەساتێکی هاتووچۆ هات و کەوتە نێو نەخۆشخانە و زۆر مایەوە، زۆری

چارەسەر وەرگرت و ناچار بوو بۆ چارەسەر بچێتە دەرەوەی وڵات، ئەو پارانەی کۆی کردبویەوە زۆربەی لە ڕێگەی چاك بوونەوەدا خەرج کرد، دوایی هەموو ئەمانە هاتەوە بەڵام هێشتا دەستی ڕاستی ناتوانێ بەباشی بجولێنی و بەردەوام خەریکی چارەسەری سروشتی یە.

دیسان هاورێکەی سەردانی کرد و ئامۆژگاریەکانی بۆ دووپات کردەوە و پێ ی ووت لەوانەیە ئەمە ئاگادار کردنەوە بوو بێت و تۆ بە بکە، بەڵام بێ سوود بوو سوور بوو لەسەر کارەکەی. دوایی ماوەیەکی کەم ئاگادارکردنەوەی دووەم هاتە بەردەمی و کوڕێکی تووشی نەخۆشی دەروونی بوو، باوکی سەرقاڵی چارەسەر کردنی بوو، کارەکانی کەوتە دەست کرێکار و فەرمانبەرەکانی سەرمایە یان لێ دزی و ڕایانکردە دەرەوەی وڵات و زیانێکی بێ شوماری پێ گەیشت، هەر وازی نەهێنا.

ڕۆژانی تێپەڕاند و ژنەکەی هەندێ لە جەستەی لە کار کەوت و ناچار وەرگرتنی چارەسەری سروشتی .

هاوڕێکەی دیسان هاتە سەردانیان و بە شێوەی پێشووتر ئاگاداری دەکردەوە و پێ ی دەوت: تاکەی لە گومڕایی دادەبیت؟ بۆ ئەوەندە کەللە ڕەقی؟ ئەمانە هەموو ئاگادارکردنەوە خودا دەیەوێت بگەڕێیتەوە.

بەڵام ئەمانەی نەدەبیست و پارە کوێری کرد بوو هیچی نەدەبینی و هەر سوور بوو لەسەر کارەکەی، بێ ئاگا لەوەی هەموو دەسپێکێك کۆتاییەکی هەیە و هەمووشتەکان لەناو دەچن تەنها خودا دەمێنێ[1].

پەیدا کردنی سامان بە حەڵاڵی باکەمیش بێت خودا فەڕ و بەرەکەتی تێ دەکات و، لەوانەیە پەیدا کردنی حەرام سامانێکی زۆر لە کاتێکی کەمدا پەیدا بکەیت و دەرونە لاوازەکانی پێ گومڕا ببێ، بەڵام بەبێ فەڕ و بەرەکەت چەند خۆی ماندوو دەکات و شەو ڕۆژ دەخاتە سەریەك و ئۆقرە لەخۆی دەبڕێ و بەدوایی پارەدا ڕا دەکات هەست بە خۆشی و قەناعەت ناکات.

بەڵام ئەوەی لە ڕێگەی حەڵاڵەوە کاسبی دەکەن لە ڕێژەیەکی کەم هەست بە بەرەکەتێکی زۆر دەکەن و قەناعەت و ڕازی بوون بەبەشی خۆیان دڵشادیان

---

(١) ئەم چیرۆکە بەرێز (سالم الخشان) بۆی گێرامەوە.



دەکات و ژیانێکی ئاسوودە و دوور لە کێشەی ماددی و کێبڕکی پڕ ڕق و کینەی دنیا دەبن، خودا دەفەرموێت:

﴿ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾[1].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێ:

(ليأتين على الناس زمان لايبالي المرء أبحلال أخذ المال أم بحرام)[2].

واتە: "ڕۆژێك دادێ بەسەر خەڵکدا کەس گوێ بەوە نادات ئایا ئەو سامانەی پەیدای کردووە بەڕێگەی حەڵاڵ یان حەرامە".

---

(١) سورة المائدة: أية ٦٢.

(٢) رواه البخاري.





## سەرئەنجامی خۆ بەزل زانین

ڕێگەم کەوتە شارێك و لێم قەوما و بێ پارە و پوول مامەوە، بەڵام برسێتی واز لێ نەهێنام و دەگەڕام تا پارووپەکم دەست بکەوێت، لە برساندا ڕیخۆڵە خەریك بوو دەبڕا، ناچار بیرم لە سواڵکردن کردنەوە و چوومە نێو بازاڕ، گەیشتمە پیاوێك لە ڕووخساری دا خوش گوزەرانی و نیعمەت بەدی دەکرا خێرا لەبەردەمیدا هەڵتۆقیم و ووتم: من خەڵکی ئەم شارەنیم و زۆرم برسی یە ئەگەر یەك درهەمم پێ بدەیت کولێرەیەکی پێ بکڕم چاکەت لە بیر ناکەم.

بەڕق و سوکایەتیەوە لێی ڕوانیم و قیڕاندی بەسەرمدا: لاچۆ لەبەر چاوم من زۆر ڕقم لە تۆ و هاوشێوەکانی تۆیە لە هەژاران و سواڵکەران، چۆن پارەی خۆم بدەم بە تۆ لەکاتێدا ئارەقم ڕشتووە لە پەیدا کردنیدا؟ خێرا بڕۆ هەتا نەمداوە بە ناو دەمتدا.

زۆر بە زەییم بە خۆمدا هاتەوە و خەمم خوارد، سەرم هەڵبڕی و دەستم کرد بە پاڕانەوە لە خودا و لێ پاڕامەوە و وازم لە دەست پان کردنەوە هێنا و بڕیارم دا ئەگەر لە برساندا بمرم بیر لە سواڵ نەکەمەوە و تەنها پشت بە خودا ببەستم.

ڕۆژ ئاوا بوو شەو داهات، بە دوایی شوێنێکدا گەڕام شەوی تێدا ڕۆژبکەمەوە، تا گەیشتمە خانوویەك وەك کەلاوە وا بوو تەواو نەکرا بوو و چۆڵ بوو، چوومە قوژبنێکەوە و توند سکی خۆمم گرت، نەمویست خەوم لێ بکەوێت، بەڵام برسی چۆن دەتوانێت بخەوێت، لە کۆتاییدا چونکە زۆر ماندوو بووم خەو بەسەرمدا زاڵ بوو نوستم، لە ناکاو لە دەنگێکی گەورە بە ئاگا هاتم ڕای وەشاندم و دەیووت: هەستە.. هەستە وەرە لەگەڵم!!

ڕاچڵەکیم و زۆر ترسام و ووتم: کێ.. ئەی تۆ کێ ی.. چیت دەوێ؟!

ووتی: بێ دەنگ بە و زۆر مەڵێ.. تۆ ناتەوێ خواردنی خۆش بخۆیت و لە ناو نوێنی نەرم دا بنووی؟

ووتم: کابرا تۆ ڕادەبوێری.. ئەمانەی ووتت چۆن دێنەدی و بەچی؟!

ووتی: وەرە بە چاوی خۆت دەیبینی.



ماوەیەکی کەم ڕۆیشتم پاشان گەیشتینە کۆشکێك لە هەموو لایەکەوە درەختی جوان و باخچەی ڕازاوەی بەدەور دابوو، کاتێك چووینە نێو کۆشکەکەوە هەمان پیاوی لە بازاڕ بە گژمدا چوو بینیمەوە و دەمناسیەوە، بەڵام ئەو لەبەر لووت بەرزی خۆی دیقەتی منی نەدا بوو نەیدەناسیمەوە و، پێ ی ووتن: لە کوێ هێناوتانە؟

ووتیان: بێ دەرەتانە و لە کەلاوە یەکی ئەم نزیکانەدا دۆزیمانەوە.

ووتی: خێراکەن بیبەنە حەمام و جل و بەرگی پێ بدەن و بیهێننەوە.

دواتر لە حەمام هاتمە دەرەوە و جلە جوانەکانم لەبەر کرد هاتمەوە بەردەمی و پێ ی ووتم: چاك گوێبگرە، من هەڵەم کرد و ژنەکەم سێ بە سێ تەڵاقداوە پێم حەڵاڵ نابێتەوە تاوەکو شوویەکی تر نەکات و تۆ ئەم مارە بە جاشەم بۆ دەکەیت و ئەمشەو لێت مارە دەکەم و سبەینێ تەڵاقی دەدەیت و خەڵاتێکی گەورەت لەسەر ئەمە پێ دەدەم.

بێ دوو دڵی و لە ناخەوە ووتم: بەسەر چاو چۆنت بوێ وا دەبێت، خۆ من هەموو خەیاڵم لای خواردن بوو، خەریك بوو لە برساندا بانگم هەڵدەدا هەر چیەکی بووتایە ئامادە بووم. مارەیان کرد لێم و چوومە نێو ژوورێکی فراوانی ڕازاوە و سیسەمێکی لە ناوەراست دابوو، لەم لاوە مێزێکی لێ بوو سینیەکی لەسەر دانرابوو، داپۆشرا بوو، بەپەلە پەردەکەم هەڵدایەوە، ئای ئەمە ڕاستی یە یان خەونە مریشك و برنج و میوە، سەرباری ئەو هەموو برسێتی یە خۆمم گرت و ناوی خودام هێنا ئینجا کەوتمە سەر خواردنەکە، دوایی ئەوەی تێر بووم زۆر سوپاسی خودام کرد و بەدەست خۆم نەبوو فرمێسکەکانم نەوەستان و بیرم لە ڕەحمەتی خودا دەکردەوە کەوا پێش کەمێك من لە برساندا دەمردم و ئێستا خودا تێری کردم و هەر سوپاسی و ستایشی خودام دەکرد.. پاشان دەستم کرد بە یادکردنەوەی خودا و سبحان الله و استغفر الله م دەکرد، تەوا کزۆڵ دەردەکەوتم: لەناکاو دەرگا کە کرایەوە و ژنێکی وێنەی مانگ نازدار و جوان دەرکەوت، ترسام ووتم: تۆ کێ ی؟!

ووتی: من ئەو ژنەتم کە پێش کەمێك مارەکرام لێت.

خۆم کۆکردەوە و زۆر شەرمم دەکرد، دەترسام چاوی لێم بوو بێت چۆن تامە زۆری خواردنەکە بووم و پەلامارم داوە، پاشان کەوتە گفتوگۆ و قسەکردن و





ووتی داوایەکم لێت هەیە ئەمەوێ بۆم جێ بە جێ بکەیت.
ووتم: بڵێ من ئامادەم چاکەتان بە هەرچیەك بێت بدەمەوە.
ووتی: سبەینێ تۆ تەڵاقم مەدە و سوور بە لەسەر ئەوەی بە هاوسەرم بمێنیتەوە، من نامەوێ جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆلای هاوسەری یەکەمم، ئەو کەسێکی خراپە و مامەڵەی هاوسەرگیری ڕەچاو ناکات و لە خودا ناترسێ، ئەمە چەندین جارە تەڵاقم دەدات و پاشان کەسێکی داما و ڕووتەڵ دێنێت و مارەم دەکات لێ ی و بۆ سبەینێ پێ تەڵاق دەداتەوە، بەم شێوەیە یاری بە شەرعی خودا دەکات.
ووتم: بەڵام من کەسێکی هەژار و نەدارم، تەنانەت جلەکانیشم هی خۆم نی یە، ئیتر چی لە من دەکەی و چۆن لەگەڵم دەژی؟
ووتی: بێ خەم بە، من خۆم خاوەنی هەموو ئەم کۆشك و سامانەم و هیچی هی ئەو پیاوە نی یە، ئەگەر تۆ خۆ ڕاگر بیت و ڕازی ببیت، هەموو بۆ تۆ دەبێت و پێکەوە دەژین، بۆیە ئەم قسانە بۆتۆ دەکەم چونکە چاودێریم کردی کەسێکی باش دیاریت و بێ تەماحیت، ئەگینا ئەم بیرۆکەیەم لە هیچ لەوانەی تر دەهاتن نەبوو، بەڵام متمانەم بە تۆ هەیە.
ئەو شەوەمان وەك دوو هاوسەری خۆشبەخت بەسەر برد و، بەیانی زوو هاوسەری پێشوو هاتە بەردەم ژوورەکە و نەڕاندنی: خێرا تەڵاقی دەو بڕۆ.
لە بەردەمیدا وەستام و ووتم: هاوسەری خۆمە و تەڵاقی نادەم، تۆ چ کارەی لێرە خێرا بڕۆ.
ووتی: کابرا شێت بووی.. ئەوە چی دەڵێ ی؟
ووتم: بڕۆ ئەگینا فەرمان دەکەم خزمەتکارەکان وەك سەگ فڕێت بدەنە دەرەوە.
دوایی ئەوەی زانی هەموو شتێکی لە دەست چوو تەنانەت کەرامەت و ڕێزشی، سەری شۆڕ کرد وحەسرەت و پەشیمانی هەموو جەستەی داگیر کرد بوو ملی ڕێگەی گرت بۆ دەرەوە، پێش ئەوەی بە تەواوی لە دەرگا بچێتە دەرەوە ووتم: من دەناسیەوە؟!
ووتی: نەخێر تۆ کێ ی؟!
ووتم: من ئەو سواڵکەرەم دوێنێ پێش ئێوارە داوای خێرم لێکردی، بەڵام تۆ دەرت کردم و دڵت شکاندم، بەو کارە نەشیاو و ناشرینەت و ڕژدیەکەت خودا بە فەزڵی خۆی و بەخشندەیی منی کردە خاوەنی ئەم هەموو شتە.



پاشان بەرق و داخەوە هەندێك لێ ی ڕوانیم و بەرەو دەرەوە ڕۆیشت. بڕوانە ئەم نەبوونە ڕەش و ڕووتە بە وویستی خودا چۆن بوو بە دەوڵەمەندێکی ساماندار و ئەم ڕژد و بەخیلە بەدکارە چۆن پاداشتی ڕژدی و لە خۆبایی بوونەکەی بەسەر خەڵکەوە وەرگرت و کارەکەی چۆن تیای برد، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾﴾ [١].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(خصلتان لاتجتمعان في مؤمن: البخل و سوء الخلق) [٢].

واتە: دوو سیفەت لە ئیماندار دا کۆنابێتەوە: ڕژدی و ڕەزیلی لەگەڵ ڕەوشتی ناشرین.

---

(١) سورة محمد: أية ٣٨.

(٢) رواه أحمد.





# فــێـڵـبــاز

زۆر بە هەژاری گەورە بوو، نەگبەتی زۆری چەشتبوو، بۆیە هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوو بارودۆخی باشبێت، بەڵام هەروەکو خۆی بوو هەتا ڕۆژێکیان میوانێکیان هات و، پێشنیاری بۆ کرد بچێت لە کارگەکەی ئەودا کار بکات. ڕازیبوو سێ ساڵ لەوێ کاری کرد، بەڵام تەماح و ئاواتەکانی زیاتر بوون و حەزی دەکرد ببێت بەسەرمایەداوو، دەستی کرد بە کۆ کردنەوەی پارە و هیچی لێ خەرج نەدەکرد تەنانەت بۆ خۆیشی، وای لێ هاتبوو ناوبانگی بە (ڕەزیل) دەرکرد بوو، بەڵام بایەخی بە قسەی کەس نەدەدا چونکە تاکە ئاواتی و ئامانجی و هیوای تەنها کۆکردنەوەی سامان بوو، دوایی ماوەیەك پارەیەکی باشی کۆکردبویەوە و کارگەیەکی خشتی دانا لەگەڵ هاوبەشێکی تردا، پاشان دەوڵەمەند بوو، بەڵام دەروونە نەخۆشەکەی بە مەتێر نەدەبوو، هەستا بیری کردەوە فێڵ بکات و لمی زیاتر دەکردە نێو خشت و بلۆکەکان زیاتر لە چیمەنتۆ و ئەمەش قازانجێکی باشی بۆ دەگەڕاندەوە و شەیتان زیاتر هانی دەدا کەوا زیاتر پەرەی پێ بدات، کارگەیەکی تری کاشی دانا و، ئیتر هیچ شتێك نەما لای گرنگ بێت تەنها پارە نەبێت و تاقەکەس بوو لەگەڵیدا بژی، هیچی بۆ ماڵ و منداڵەکانی خەرج نەدەکرد و بووبوو بەباربەسەریانەوە هەژارترین کەس لەوان باشتر دەژیا، چونکە کاری ئەم پیاوە تەنها کۆکردنەوە و لەسەر یەك دانان بوو بۆ خەرج کردن نەبوو وەك شاعیر دەڵێت:

من طلب الحوائج من بخيل　　كمن طلب العظم من الكلاب

واتە: ئەوکەسەی شت لە ڕەزیل داوابکات. وەك ئەوکەسە وایە داوای ئێسقان لە سەگ بکات.

پەیوەندیە کۆمەڵاتیەکانی بەرەو خراپی چوون و خۆمایەتی نەهێڵاو پچڕاندی و وای دەزانی هەموو کەسێ ئەوی بۆ پارە دەوێت و خۆشیان ناوێت و لە هەموو کەس بە گومان بوو، وازی لێ هینان و ئەوانیش پشت گوییان خست. بەڵام لە ڕووی ئابووریەوە لە هەموو لایەکەوە بەسەریدا ڕژابوو وای لێ هات کارگەی



سێ یەمیشی بکاتەوە:
بەڵام رۆژێکیان کڕیارێك هات و هەندێك بلۆکی لێ کری بۆ دروست کردنی خانوویەك، بەجوانی دروستی کرد، بەڵام بەهۆی فێڵ لە بلۆکە کاندا ڕووخا کەلەم بازرگانە ڕەزیلەی کڕیبوو. کابراداوای لەسەر خاوەنی کارگەکە بەرز کردەوە و دادگا بەزیندانی چوار ساڵ یان غەرامەی پەنجا هەزار دینار لێ وەر بگیرێت، بەڵام ئەم دەرون نەخۆشە و بەهۆی ڕەزیلەکەوە چوار ساڵ کە چووە زیندان و غەرامەکەی نەدا، بەڵام ئایا هەر بەمەوە تەواو بوو، نا، ئەم فێڵبازە هەموو کارگەکانی لە هێرشی عێراق بۆ سەر کوەیت دا سووتا و هیچی بۆ نەمایەوە، لە خەفەتدا تووشی ئیفلیجی لایەك هات. [1]
ئەمەی ئەم پیاوەی تێ کەوت هۆکاری فێڵ و تەماح و کۆکردنەوەی سامان بوو بەهەر جۆرێك بێت، خودایش تۆڵەی توندی لێ کردەوە و، ئەمە زللەیەکی میهرەبانی توند و وانەیەکی بە ئازار بوو بۆی وای لێ کرد هەست بە هەڵەکانی بکات و لە بێ ئاگاییەکەی هاتەوە هۆش و تۆ بەیەکی تەواوەتی کرد و دەستی کرد بە کاری چاکە و مزگەوتێکی دروست کرد و بەڵێنی دا بە خودا ئیتر تەنها لە ڕێگەی کاسبی حەلاڵە وە پارە پەیدا بکات و پارە بکاتە خزمەتی کاری چاکەوە نەك خۆی بکاتە خزمەتکاری پارە، خودا یارمەتی دەرمان بێت بۆ کاری چاکە و گوێڕایەڵی خودای گەورە.
خودا دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٤﴾ ﴾ [2].

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:
(من غشنا فليس منا).
واتە: "هەرکەس گزی و فێڵ دەکات لە ئێمە نی یە"
لە فەرموودەیەکی قودسی دا هاتووە:

---

(١) لە (جريدة الرأي العام)ەوە.
(٢) سورة الحديد: أية ٢٤.





إن من عبادي من لو أغنيتة لفسد حاله.
وإن من عبادي من لو أفقرتة لفسد حاله.
وإن من عبادي من لو أصحتة لفسد حاله.
وإن من عبادي من لو أمرضته لفسد حاله.
وإن من عبادي من لو يطلب بابا من أبواب الدنيا فأكفه عنه حتى لايصيبه العجب، إني أدبر أمر عبادي بعلمي بهم، أني بهم عليم خبير.

واتە: هەندێك لە بەندەكانم ئەگەر دەوڵەمەندی بكەم خراپە بۆی.
وە هەندێكیان ئەگەر هەژار بێت بارودۆخی خراپ دەبێت و هەندێكیان بە لەش ساغی لە خۆیی بایی و هەندێكیان بە نەخۆشی هەیانە داوای دەرگاو دەروازەیەكی دنیا لە خودا دەكات بەڵام پێی نادەم بۆ ئەوەی تووشی لە خۆبایی بون نەبێت، خۆم كاروباری بەندەكانم بە زانینی خۆم بۆیان بەڕێوە دەبەم چونكە خۆم زانا و دانام پێیان.

# بەشی شەشەم: ستەم

یەکەم: کەشتیوانی بکوژ

دووەم: سزای جنێودان بە هاوەڵان.

سێیەم: سزا و تۆڵە

چوارەم: غەدرکردن

پێنجەم: ئایەتێکی سەرسوڕهێنەر.





# کەشـتیوانی بکوژ

کاری سەربڕینی ئاژەڵ بوو، پێش بانگی بەیانی مەڕەکانی سەربڕی و لەگەڵ بانگی بەیانی دا بەرەو ماڵ ڕێگەی گرتەبەر، ماڵەکەی دەکەوتە لایەکی ڕێگە تەسك و خوار و خێچەکەی لەو سەرەوە دا خرابوو، لە دوایی ئەوەی ماوەیەکی کەم ڕۆیشت گوێبستی نرکە و ناڵە ناڵێك بوو، بە خێرای بەرەو ڕووی دەنگەکە ڕۆیشت و، بینی کەوا پیاوێك خەڵتانی خوێن کراوە و ئەمیش باوەشی پێدا کرد !! ڕزگاری بکات دەستی بە خوێنی سوور بوو و چەقۆکەی لێ کەوتە نێو خوێنەکەیەوە، بەڵام هەوڵیدا ڕزگاری بکات و بێ سوود بوو مرد و لەو کاتە دا پاسەوانی شەوانە دایان بەسەر شوێنەکە دا و کابرایان بینی فەرمانیان پێ کرد دەستەکانی بەرز بکاتەوە، بە تەواوەتی تۆقی و، هەندێ خەڵك کۆبوونەوە بزانن چی یە و، قەساب برایە بنکە و، هەموو پاسەوانەکان شایەت بوون لەسەری و ئەو خەڵکەی هاتبوونە سەری شایەتیان دا، دادگا چەسپاندی کەوا قەساب بکوژی ڕاستەقینەیە و حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرکرد!! کەس گوێ ی لە نکۆڵیەکانی نەگرت کە ئەو نەیکوشتووە و، کەس بڕوای بەچیرۆکە ڕاستەقینەکە نەکرد کە بەم شێوە بوو، قسەکانی هەموی بەبا چوون، دوایی ئەوەی حوکمی کۆتایی دەرچوو بە دەنگێکی بەرز بە قازیەکانی کێشەکەیان گرتبووە ئەستۆیان ووت: "قسەکانی من ڕاستن و قسەی شایەتەکان درۆ بوو بەڵام ئەم حوکمەی بەسەرمدا بڕاوە شایستەمە چونکە من دایك و منداڵێکی ساوام کوشتووە پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر لە کاتێکدا منداڵەکە شیرەخۆرە بوو شیری دەخوارد، ئێوە بگەڕێن بە دوایی بکوژی ڕاستەقینەی ئەم ڕووداوە دا و بۆ ئەوەم نی یە ڕزگارم کەن لەم سزایە"، لە سێدارە درا، بەڵام کاریگەریەکی زۆری لەسەر کۆمەڵگا بە جێهێشت کە تا ئەمڕۆ دەوترێتەوە، نهێنی یەکەی ئەوەبوو لەم کوشتنەدا بێ تاوان بوو کە بە هۆیەوە لە سێدارە درا، بەڵام لەلایەکی ترەوە ستەملێکراو نەبوو لەو سزایە چونکە تاوانبار بوو بە کوشتنی ساوایەك و دایکەکەی، کە لەو کاتەدا هیچ کەس نەیتوانی بوو سەرە داوێك لە بکوژی ئەو دوانە بدۆزێتەوە بەڵام خودا تۆڵە سێنە و بەسەریدا



تێناپەڕێنێت چیرۆکی ئەم کەشتی وانە بکوژە بەم جۆرە بوو:
لە خێزانێکی زۆر هەژار دا چاوی بە دنیا هەڵهێنا بەزەحمەت نانی ڕۆژانەیان دەست دەکەوت دوایی ئەوەی گەیشتە تەمەنی شازدە ساڵی لە بەلەمێکدا کاری دەکرد و خەڵکی لەمبەرەوە بۆ ئەو بەر دەپەڕاندەوە و چەند ساڵێك بوو ئەم کارەی دەکرد، بەڵام هێشتا نەیدەتوانی خەرجی ئەم خێزانە قەرەباڵەغە پڕبکاتەوە کە پیرە باوکێك و دایکی و پێنج برا وشەش خوشك بوون، کە ئەم نۆبەرە بوو، بە یانیەکی زوو چاوەڕێ گەشتیاری دەکرد کچێك و دایکی لەو بەری ڕووبارەکەوە هاتن دەیانوویست بپەڕنەوە، دڵی بۆ کچەکە دەبزوا و لە ژێرەوە سەیری دەکرد، کاتێك دا بەزین کچەکە تەماشایەکی کرد و زەردەخە لەسەر لێوەکانی بوو دەدرەوشایەوە، زیاتر دڵی کەمەندەکێش کرد و خۆشی وویست.
دوایی تێپەربوونی کات بۆی ڕوون بوویەوە کەوا هەموو پێنج شەمەیەك دێن و سەردانی خوشکی دایکیان دەکەن، بە پەرۆشەوە چاوەڕێ ی ئەو ڕۆژەی دەکرد و دەیپەڕاندنەوە و چاوەڕێ ی گەڕاندنەوەی دەکردن و دەیگەڕاندنەوە، بەم شێوەیە یەکترناسین لەنێوانیان دروست بوو، چەند گفتوگۆیەکی کەم لە نێوانیان دروست دە بوو، وەك هەواڵ پرسین و سڵاو تاگەیشتە ئەوەی جارێکیان چرپاندی بە گوێی کچەکەدا و ووتی: "حەزدەکەم تۆ بخوازم" کچەکەیش ووتی: لە دەرگای باوکم بدە و وەڵام دەبیستی مانای وەرە.
ئەم ووشەیە لە مێشکیدا دەنگی دەدایەوە و، بیری لە شێوازی داخوازیەکە دەکردەوە و، چۆن بە دایك و باوکی بڵێ، چەند هەفتەیەك تێپەڕین و کچەکە بە تەماشا و سەرنجەکانی چاوەڕوان بوو، پاشان سەر لە بەیانیەك چرپاندی بە گوێ دا و ووتی: "جگە لە تۆ لە دەرگای باوکمی دا"، ئەم ڕستەیە وەك ئاگر بەربووەگیانی، ناچار چیرۆکی خۆی گەیاندە لای دایکی و داوای لێ کرد بە باوکی بڵێ، دایکی پەیمانی پێیدا بەڵام ووتی:
لە کوێ لەگەڵیدا دەژیت و؟ لە کوێ دادەنیشن، خانووەکەمان تەسك و بچوکە و خۆت دەزانی ژمارەی خێزانەکەمان چەند زۆرە و؟ پاشان پارەی مەسرەف و خەرجی لە کوێ دەهێنیت؟ بەم شێوازە دایکە دڵی کوڕەکەی کرد بە بەرد و خۆی دەستی کرد بە گریان بۆ بەختی کوڕەکەی، بەم شێوە کوڕەی هەژار بەردێکی لەسەر ئەو بابەتە دانا و نە بە نەخێر و نەبەڵێ وەڵامی نەبوو بۆ کچەکە و ناڕەزایی بۆ





شووکردنەکەی دەرنەبڕی.
کچەی بەستەزمان زۆر لە چاوەڕوانیدا بوو، بەبێ ئەوەی هیچ هەواڵێك لە کوڕە وە بێت و بێتە پێشەوە، پاش ئەوەی بێ ئومێد بوو، کچە شووی کرد و دڵی داناو ئەم ڕۆژانەی لە یاد کرد، بەڵام کوڕە دڵی پێ چار نەکرا و لە یادی نەکرد، کاتێك زانی کچەکە شووی کردووە خەم و پەژارە باری بەسەریدا و لەگەڵ ڕۆژگاردا ئەم خەم و پەژارەیەی گۆڕا بە ڕق و کینە، دوایی دووساڵ هەمیشە کوڕە کچەکەی لەبەر چاو لانەدەچوو، بیری دەکردەوە چۆن ئەو بارە ئابووریە زۆرە بێ بەشی کرد لەو خۆشەویستەی و چاوی نەکەوتبووەوە پێیان.
ڕۆژێکیان منداڵیکی شیرە خۆرە و دایکێك هاتنە نێو بەلەمەکەیەوە و تەم و مژێکی زۆر بوو، کەش وهەوا هەور و هەڵا بوو، کاتێك گەیشتنە ناوەڕاستی ڕووبارەکە جوان لێ ی ڕوانی دیتی ئەو کچەیە کە خۆشی دەویست و ئەم منداڵە هی ئەو مێردەیەتی کە خۆشەویستەکەی بردووە، بەڵام کچە بێ ئاگا بوو خەریکی منداڵەکەی بوو، کەوتە قسەکردن و ئەو ڕۆژانەی بە یاد هێنایەوە و بەڵام کچەکە خۆی نەکردە نەناس و پێ ووت: من ئەمڕۆ هی تۆ نیم و هی پیاوێکی ترم و ئەمەش منداڵی خۆمە. بەڵام کەشتیەوان شەیتان فریوی دا و لە نێو ڕق و کینەی خۆیدا نقوم بوو، وای بە مێشك داهات پەلاماری بدات، بەڵام ئەو مل کەچی نەبوو، هەڕەشەی لێکرد منداڵەکەی دەخاتە نێو ڕووبارەکەوە، ئەوەش ملکەچی نەکرد و چۆکی پێ دانەدا و خۆی نەدا بە دەستەوە، بەبێ بەزەییانە منداڵەکەی فڕێ دایە ناو ڕووبارەکەوە، بەڵام هەر ڕازی نەبوو دەست درێژی بکاتە سەری، بەخەنجەرەکەی هێرشی کردە سەری و زۆر بەبە هێزی لێ ی دا و چەند جارێك لێ ی دایەوە و هێشتا هەر بەرگری دەکرد و، کوڕەکە دەیوست بە برینداری لە ئامێزی بگرێت بەڵام هەر نەیهێشت و بەم شێوەیە گیانی سپارد و تا دوا ساتی ژیانی بەرگری لە ناموس و شەرەفی خۆی کرد، کاتێك جەستەی خەڵتانی خوێن بوو بوو سارد بویەوە ناچار فڕێی دایە نێو ڕووبارەکە و خۆی گەیاندە کەناراوەکە و بەلەمەکەی شوشت و شوێنەواری تاوانەکەی نەهێڵا، لێرەدا دوایی دۆزینەوەی تەرمەکان تاوانەکە تاوانبارەکەی بە نادیاری تۆمارکرا!!!
بەڵام تاوانبار کەوتە ململانێ لەگەڵ دەروونی خۆیدا و هەر دەگەیشتە شوێنی ڕووداوەکە گریانی منداڵەکە و دەنگی دایکە کە لەمێشکیدا دەزرنگایەوە و هەرە

شەیان لێ دەکرد و دەیانترساند، لەبەر ئەمە بڕیاری دا بۆ ئەوەی شێت نەبێت وازی لە کاری کەشتیوانی هێنا و دەستی دایە سەر بڕینی ئاژەڵان و ئەم کارەساتەی ڕووی دا بەسەریداهات.

لە کۆتا شەوی ژیانیدا ئەم گرێ یەی دڵی بۆ دایك و باوك و برا و خوشکەکانی کردەوە و چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە و کۆتا قسەی ژیانی بوون و کاتی لە سێدارەدانی نزیك بوویەوە و لە کاتی لە سێدارە دانەکەدا بە هەموو دەنگی خۆی هاواری کرد من بۆ کوشتنی ئەو دایك و منداڵە سزا دەچێژم ئێوە بۆ بکوژی ئەو پیاوە بگەڕێن، حوکمەکەتان بەرانبەر دادگەرانە نەبوو لەلایەن مرۆڤەوە بەڵکو لەلایەن پەروەردگاری مرۆڤەوە بوو [1].

بەم شێوەیە چیرۆکەکەمان پێویستی بەهیچ قسەو شیکردنەوەیەك نی یە.

شاعیر دەڵێت:

ألا ان خير العفو معجل      وشر عقاب مايجازى به القدر

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾ [2].

پێغەمبەریشمان (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(لو أن السماء والارض اشتركوا في دم مؤمن لكبهم الله عزوجل في النار) [3].

واتە: " ئەگەر ئاسمان و زەوی لە ڕشتنی خوێنی ئیمانداریێدا کە بەشداربن خوای گەورە لە ئاگردا دەیانهێڵێتەوە ".

---

(١) لە (تدابير القدر).

(٢) سورة النساء: اية ٩٣.

(٣) رواه الترمذي و صححه الالباني.



## سزای جنێودان بە هاوەڵان

قیروانی دەڵێت: لە (فضل)ەوە یەکێك لە مامۆستاکانی گێڕایانەوە: لە ئەبو حسنی مگلبی پێشنوێژی مزگەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ووتی لە مەدینە شتێکی سەیرمان بینی، پیاوێك جنێوی بە أبوبکر و عومەر (رضي الله عنها) دەدا دوایی چەند ڕۆژێك بینیمانەوە چاوەکانی دەر پەڕیبوونە دەرەوە و لێمان پرسی ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟!

ووتی: دوێنێ شەو پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) و علی هاتنە خەونم و ئەبو بکر و عومەر لای دانیشتبوون، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە ئازارمان دەدات و جنێومان پێ دەدات. فەرمووی: (کێ فەرمانی پێ کردویت ئەی ئەبا قیس وا بکەی)؟ ووتم: عەلیء ئاماژەم بۆ کرد.

عەلیء لە خەوەکەمدا بەرەوڕووم هات و دەستی بۆ هەر دووچاوم هێنا و، ووتی ئەگەر درۆ دەکەی خودا هەر دوو چاوت بێنتە دەرەوە و دەستی برد چاوم دەربکات بە ئاگا هاتم بەڵام ئاوام بەسەر هاتبوو. ئیتر هەر دەگریا و تۆبەی کرد و باسەکەی بۆ خەڵك دەگێڕایەوە تاوەکو پەندی لێ وەربگرن.

هەروەها لە ئەبی حاتەمی ڕازی لە محمدی کوڕی علی ووتی: کاتێك لە مزگەوتی مەککە دانیشتبووین پیاوێك هات و لایەکی دەم و چاوی ڕەش دا گەڕا بوو لاکەی تری ئاسایی سپی بوو، ووتی: ئەی خەڵکینە لە من بڕوانن و پەند وەربگرن، پێشتر قسەم بەو دووکەسە بەرێزە دەگوت (ئەبو بکر و عومەر) و جنێوم پێ دەدان، بەڵام شەوێکیان لە خەودا بووم، کەسێك هات خەونم و ووتی ئەی دوژمنی خودا لە ڕێگەی پێغەمبەر لات داوە و ئەوە تۆ جنێو بە ابوبکر و عومەر دەدەیت و زللەیەکی لێدام، سبەینی خەبەرم بویەوە شوێنی زللەکەی ڕەش بوو بوو.

هەروەها ناودارێکی قورەیشی گێڕایەوە ووتی: پیاوێکم لەشام بینی لایەکی دەم و چاوی ڕەش بوو لاکەی تری ئاسایی بوو هەمیشە دەیشاردەوە، پرسیارم لێکرد ووتی: بڕیارم بە خودا داوە هەر کەس پرسیارم لەو بارەیەوە لێبکات وەڵامی



دەدەمەوە. زۆر ڕقم لە عەلی کوڕی ابی تالب بوو قسەم پێ دەوت و عەیبم لێ دەگرت، تا شەوێکیان کەسێك هاتە خەونم و پێ ی ووتم: تۆ خاوەن جنێوەکانی و دای بەم لایەمدا و وەك دەبینی ڕەش بووە [1].

محمد کوڕی سیرین ڕەحمەتی خودای لێ بێ ووتی: لە دەوری کعبە دەسوڕامەوە، پیاوێك دەیووت: خودایە لێم خۆش ببە بەڵام وا گومان نابەم لێم ببوریت!!

پێم ووت: بەندەی خودا کە ئەم قسەی تۆ کردت لە کەسم نەبیستووە! ووتی: سوێندم خوارد بوو ئەگەر بۆم هەڵبکەوێت لە بنا گوێ ی عوسمانی کوڕی عەفان بدەم، کاتێك پێکرا بوو گیانی سپارد بوو، دانرابوو تا خەڵك نوێژی لەسەر بکات، وەك نوێژکەر چوومە ژوورەوە و کەکەس دیار نەبوو سەریم هەڵدایەوە و زللەیەکم لێ دا، لەو کاتەوە خوا ئەم دەستی ڕاستەمی وەك تەختە وشك کردووە، ئیبن سیرین ووتی: خۆم سەیری دەستەکەیم کرد ووشك بوو بوو، ئەو خەلیفەی سێ یەمەی خاوەنی دوو نورەکەیە و ستەمی لێ کراو و کاری خۆی حەواڵە کرد بۆ خودا و خودا لەو ستەم لێکردنەیدا تۆڵەی بۆ کردەوە و کەس لەوانەی ستەمیان لێکرد نەما سزای خۆی وەرنەگرێت [2].

لە عامری کوڕی سعدەوە - ڕەزای خودای لێ بێ - دەڵێت: کاتێك سعد بەلای پیاوێکدا ڕۆیشت جنێوی بە علی و تەلحە و زوبیر دەوت، سعد پێ ووت: ئەوە جنێو بە کەسانێك دەدەی خوای گەورە ئەو هەموو فەزڵەی پێ داون، واز لەو جنێودانە دەهێنیت یان دوعات لێ دەکەم و لەخوا دەپاڕێمەوە سزات بدات.

ووتی: دەڵێ خۆت بە پێغەمبەر دەزانی وا هەڕەشەم لێ دەکەی.

سعد ووتی: خودایە جنێو بەکەسانێك دەدات خۆت دەزانی چ پێشینەیەکیان هەبوو لای خۆت و خودایە پێی بنوێنە.

وەك مێ یەی حوشتری لێهاتبوو خەڵك ئالیکیان پێ دەدا، پاشان خەڵك چاویان بە سعد کەوتەوە، ووتیان نزاکەت گیرا بوو ئەی ئەبا (اسحاق) [3].

لە قەیس ەوە ووتی: پیاوێك جنێوی بە علی دەدا و سعد ووتی: خودایە ئەمە

---

(١) لە کتێبی (المنامانت) ابن ابي دنیا.

(٢) البدایة و النهایة.

(٣) رواه طبراني.





جنێو بە وەلیەکی تۆ دەدات، ئەم خەڵکەی کۆبۆتەوە بڵاوەنەکات تۆ قودرەتی خۆتیان پێ نیشان بدە.
سوێند بە خودا هێشتا بڵاوەمان نەکرد بوو ئەو ئاژەڵەی سواری بوو بووهار بوو هەڵی دایە خوارەوە و دای بەسەر چەند بەردێکدا و مێشکی تەقی و مرد [1]..
جنێودان بە هاوەڵان لە تاوانە گەورەکانە، هیچ کەسێك ناتوانێ جور ئەتی ئەوە بە خۆی بدات مەگەر ئەوکەسە نەبێت دڵ پڕ لە رق و کینە و ئاینی تێدا نەماوە، وەك تابیعی بەرێز ابو زرعە- رەحمەتی خودای لێ بێ دەڵێت: "هەر کەسێکت بینی رەخنە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەگرێت و عەیبیان بۆ دروست دەکات بزانە ئەوە (زەندیقە)- هەڵگەڕاوەیە."
چونکە بەو جنێودانە لە رەحمی خۆی وە دەری دەنێت و لە بە هەشت بێ بەشی دەکات و لە دنیا دا ڕیسواو سەر شۆڕی دەکات، چۆن دەکرێ قسە بە کەسانێك بوو ترێ قورئان و ئینجیل و تەورات وەسفی کردوون؟!
خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾﴾ [2].

پێغەمبەریش(صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:
(من سب أصحابي فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين)
واتە: هەر کەسێك جنێو بە هاوەڵانی من بدات، نە فرەتی خودا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر دەبێ.



# ســـزا و تۆڵـــە

ڕۆژنامەی (انصاري إكسبرس)ی هەفتانەی هندی بڵاوی کردەوە کەوا کۆمەڵێك هندوسی توندڕەو ماوەیەکی زۆرە خەریکی مەشق بوو، هێرشێکی گەورەیان کردۆتە سەر مزگەوتی (بابری) بۆ ڕووخاندنی مزگەوتەکە، لە ٦ی دیسەمبەری ساڵی ۱۹۹۲ز، هەروەها ڕۆژنامەکە ئەوەیشی بڵاو کردەوە، کەوا نزیکەی چل کەس لەو هندۆسانەی مزگەوتەکەیان ڕووخاند کوێر بوون و ئێستا دەستەوسانن و بە هاوکاری ڕێکخراوە هندوسیەکان ژیان بەسەر دەبەن.

پاشان یەکێك لە هندیە موسڵمانەکانم لە شارقە بینی و ناسیارم بوو، درێژەی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە و باسی لەو تاوانە دڕاندانەیە یان کرد و ئەو کەسانەی بەشداریان کرد کوێر بوون و هەندێکیان تووشی ئیفلیجی بوون.

کوێربوونی ئەم ستەمکارە تاونبارانە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە کە خودا ئاینەکەی خۆی سەردەخات و بەرگری لە موسڵمانان دەکات و چەند بێ باوەڕان هەوڵ بدەن موسڵمانان لەناو بەرن و ئیسلام و بسڕنەوە، خودا بە پێچەوانەوەیانەوە دەکات و ئاینەکەی سەردەخات و بڵاوی دەکاتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۖ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٤﴾﴾[1]

واتە: خودا ماوە و دەرفەت بەستەمکار دەدات بەڵام کە گرتی ئیتر لە دەستی دەرناچێت.

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

((إن الله ليملي للظالم فإذا أخذه لم يفلته)) [2] پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[3]

---

(۱) سورة الحشر: اية ٤.

(۲) متفق عليه.

(۳) سورة هود: اية ۱۰۲.

# غــەدرکردن

دوو هاورێ ی گیانی بە گیانی بوون، یەکتریان زۆر خۆش دەویست و سکاڵا و نهێنیەکانیان لەلای یەکتر باس دەکرد، کاتێك داهات قات و قڕی و گرانی بوو، پارە زۆر کەم بوو ئەم دوو هاوڕییە یەکێکیان هەندێ پارەی هەبوو، بەڵام ئەوی تریان یەك دیناریشی نەبوو، خاوەن پارەکە زۆر ووریا بوو باش پارەکەی دەپاراست تاقە کەسێك شوێنی پارەکەی هاوڕێکەی دەزانی ئەم بوو...
بیری دەکردەوە چۆن بتوانێت پارەیەك بە دەست بێنێت و وەك خەڵکی بژی، پاشان خەیاڵی کەوتە سەر ئەوەی بچێت پارەی هاوڕێکەی بدزێ، خۆ ئەم شوێنەکەی دەزانێ. بەڵام بەچی پێ ی دەگات، دەستی کرد بە بیرکردنەوە و پیلان گێران و لە دەرفەتێك دەگەڕا، لە شەوێکی باراناوی و هەورە گرمەدا چووە نزیك ماڵی هاوڕێکەی و هەر سەر قاڵی بیرکردنەوە بوو، خۆی هەڵدایە حەوشەی ماڵەکەیان و دڵنیا بوو هەر دووکیان نوستوون و منداڵەکەیان لە نێوانیاندایە، شوێنی پارەکە زۆر سەخت بوو لە کابرا چاڵێکی بچوکی هەڵکەندبوو لەشوێنی نوستنەکەیء لەسەری دەخەوت، دەبێت لە جێگەی نوستنەکە دووریان بخاتەوە، بارانەکە تا دەهات زیاتر دەبوو، هەموو گوندەکە ی کردبووە قوڕاو، دەنگی باران و با یارمەتی دەر بوون دەنگی ئەم نەبیسترێت، لێرە دا بیرۆکەیەك بە مێشکی داهات بە بێ دوو دڵی دەستی پێ کرد، هەوا زۆر سارد بوو، تاریکی باڵی کێشابوو ئەمیش لەسەر سك بەرەو ژوورەوە ڕۆیشت و دڵنیا بوو ئەوان لە خەوێکی قووڵدان، بە ئەسپایی منداڵەکەی هەڵگرت و بێ ئەوەی پێ ی بزانن بردی لە حەوشە داینا و خۆی گەڕایەوە لە ژوورەکەدا خۆی حەشار دا، منداڵەکە چاوی کردەوە لە دەرەوەیە و باران بە خوڕ دێتە خوارەوە و تاریکە دەستی کرد بە گریان، دایکی ڕاچڵەکی و دەستی کوتا منداڵ نی یە خێرا هاوسەرەکەی بە ئاگا هێنا و بە شپرزەیی بەرەو دەرەوە ڕایانکرد، هەر کە چوونە دەرەوە خێرا هاورێ دزەکە پڕی کرد بە پارەکە دا و هەر دەستی گەیشتە کیسەی پارە ژوورەکە ڕووخا بە سەریدا و کەوتە ژێر بەردو دارەوە، دایك و باوکە باوەشیان بە منداڵەکەیاندا کرد و ئاوڕیان دایەوە ژوورەکەیان و ڕووخا لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە سوپاسی کردنی



خودا کە کوڕەکەیان ئەمانیشی لە مردن ڕزگار کرد، بەڵام گوێیان لە ناڵە ناڵە نووزەیەك بوو لە ژێر دارو بەردووەکەوە دەهات، پیاوەکە غیرەتی دایەوە بە خۆی و گەڕایەوە لە نێو بەرد و دارەکاندا دەگەڕا بزانێ ئەم دەنگە چی یە؟ بەڵام زۆر بەگران و دوایی ماندووبونێکی زۆر بۆی دەرکەوت هاوڕێکەیەتی، وویستی ڕزگاری بکات بەڵام بێ سوود بوو، لە نێو ئەو قوڕ وبارانە چی بدۆزێتەوە و نەیدەتوانی ئەو هەموو شتە لاببات، بەڵێنی دا کە یارمەتی بدات ء کەسانی تر بێنێت بۆ رزگار کردنی.

بڕوانە سزای غەدرو خیانەت، هاوڕێکەی ئەوی بە متمانە پێکراو دانا و نهێنی خۆی لادانا بەڵام تەماح چاوی کوێر کرد و وویستی غەدر لە هاوڕێکەی بکات، سەرەنجامەکەی وەك نیازە پیسەکەی بوو وەك شاعیر دەڵێت:

أخلق بمن رضي الخيانة شيمة　　أن لايرى الا صريح حوادث

ما زالت الارزاء تلعق بؤسها　　ابدا بغادر ذمه او ناكث

خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تُجَـٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ ﴾[1].

پێغەمبەریشمان (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(لكل غدر لواء يوم القيامة يقال: هذه غدره فلان)[2].

واتە: (هەموو غەدرێك لە رۆژی قیامەتدا ئاڵایەکی هەیە پێ ی دەڵێت: ئەمە شوێنی غەدری فڵانە).

(١) سورة النساء: اية ١٠٧.

(٢) متفق عليه.



## ئایەتێکی سەر سورهێنەر

لە گوندی (توب) لە ویلایەتی جونجولی (باکوری نێجیریا) ئایەتێکی خودا ڕووی دا کە ئیمانی موسڵمانانی زیاد کرد و بەڵگەیەکی جەرگ بڕ بوو بۆبێ باوەڕان.
پیاوێکی مەسیحی هات و موسڵمان بوو، دوایی ماوەیەك هەڵگەڕایەوە و دژایەتی دینی زۆر بە ناشرینی دەکرد، ڕۆژێکیان لە نێو مەسیحیەکاندا و بە ئامادەیی خەڵکێکی زۆر زۆری گاڵتە بە ئیسلام کرد و لە نێو قسەکانیدا وتی: " ئەگەر ئەم قورئانە بەڕاستی لەلای خودا وە هاتووە، داوا دەکەم لە خوا بەزیندوویی نەمگەیە نێتە ماڵەوە".
هەر لە کەنیسەکە هاتە دەرەوە قاچی هەڵکەوت لە نێو جۆگەلەیەکی بچوك و مرد، ئەمە نزاکەی خۆی بوو، بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ ڕاستێتی ئیسلام و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)، کاری کردەسەر خەڵك و لە چوار گوندەوە خەڵك دەستی کرد بە موسڵمان بوون و پۆڵ پۆڵ دەهاتن [1].
ئەم کارەی درێژە پێدەری پرۆگرامی لە خۆباییە گومڕاکانی پێش خۆی بووی لە فرعون وهامان و قارون و ئەبو جەهل و ئومەییەی کوڕی خەڵەف و هەموو لە خۆباییەکانی کە باوەڕ بە خودا ناهێنن. بیبنە کۆتایی ئەم هەڵگەڕاوە بەشتێکی چەند ساکار بوو، ڕۆیشتەء نەیتوانی یزانێك بەئیسلام بگەیەنێ، بەڵکو خودا مردنەکەی کردە هۆی هیدایەتی زۆر لە هۆزەکان کە بەچاوی خۆیان ئەم ئایەتە سەرسوڕهێنەرەیان بینی و پەندیان لێ وەرگرت و بوو بە وانەیەك کەس نەتوانێت گاڵتە بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بکات.
﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ [2].

---

(١) لە (للحقیقة فقط)، بەرگی یەکەم.

(٢) سورة: یوسف: ایة ٢١.



هەروەها دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾[1].

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(يقول الله عزوجل: وعزتي و جلالي لانتقمن من الظالم عاجله و اجله، وانتقمن ممن رأي مظلوما فقدر ان ينصره فلم ينصره) [2]. واتە: خودای باڵا دەست دەفەرموورێت: بەعیززەتی خۆم و توانام زوو یا درەنگ تۆڵە لەستەمکار دەکەمەوە، وەلەوکەسانەی چاویان بەستەملێکراو دەکەوێت و دەتوانن سەریان بخەن و نایکەن.

---

(١) سورة: يونس: اية ٢٣.

(٢) رواه أحمد.

# بەندی پێنجەم

## بەشی یەکەم: چاکە کردن

یەکەم: فەزڵی قورئانی پیرۆز

دووەم: بیمەی خودایی

سێیەم: هەر کەس لەگەڵ خودا دابێت خودا لە پشتی دەبێت

چوارەم: تەقوا

پێنجەم: بەزەیی

شەشەم: بەرهەمی خێرکردن.



## فەزڵی قورئانی پیرۆز

پیاوێك گێڕایەوەو ووتی: گومڕا بووم و کاری جادووگەریم دەکرد، لە گەڕەکەکەماندا ئافرەتێکی جوان هەبوو، تەواو شەیدای بوو بووم، بەڵام ئەو کچێکی چاك و لە خوا ترس و ناوبانگێکی چاکی هەبوو، یەك سات لە خەیاڵم دەرنەدەچوو، بڕیارم دا بیفڕێنم و بەهەر هۆکارێك بوو بیهێنمە ماڵەکەم، فەرمانم کرد بە شەیتانەکانم و ئەم کچەم بۆ بخەڵەتێنن و بۆم بێنن، ووتیان: هەر ئێستا، چوون کارەکەم بۆ بکەن، بەڵام بە دەستی خاڵی هاتنەوە و ووتیان: ئێمە توانامان نی یە لیَ ی نزیك بکەوینەوە، ووتم: بۆ؟ ووتیان: ئەو قورئانی لە نێو دڵی دا قورئانی هەڵگرتووە و لەبەریەتی ئێمە توانامان نی یە لیَ ی نزیك ببینەوە؟!

خودا دەفەرموێت:

﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٥٥ ﴾(1).

لە ڕووداوێکی هاوشێوەی تردا فەزڵی قورئانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

کوڕێك کچێکی زۆر خۆشدەویست، چووە پێشەوە بۆ خوازبێنی بەڵام پێیان نەدا، چونکە کچەکەیان زۆر چاك و بە تەقوا بوو، کوڕەکەیش پەیڕەوی ئاینی نەدەکرد، بەڵام تەنها کچەکەی خۆشەویست و چەند جارێك هەوڵی داو زۆر کەسی کردە تکاکار بەڵام بیَ سوود بوو، نەیدەزانی چی بکات، هیچی بۆ نەمایەوە تەنها پەنا بردن بۆ جادوو نەبێت، ڕۆیشت بۆ شارێکی دی و ناونیشانی جادووکەرێکی وەرگرتبوو تاوەکو وا لە کچەکە بکات شەیدای ئەم بێت و پیَ ی ڕازی ببێت، چووە لای و باسی کێشەی خۆی بۆ کرد و ووتی: بەیانی وەرەوە، کاتێك بەیانی بە دڵێکی خۆشەوە چۆوە، جادووگەرەکە ووتی: من هیچم بۆ ناکرێت، بڕۆ بۆ لای فلان جادووگەر ئەو گەورەی جادووگەرانە لەم وولاتەدا و دەتوانیَ شتێکت بۆ بکات.

---

(1) سورة الانعام: اية (١٥٥).





بەپەلە خۆی گەیاندە لای و ئومێدێکی بەو مابوو، داوای لێکرد شتێکی بۆ بکات و چی بوێت دەیداتێ، جادووگەرەکە ووتی: دوو ڕۆژی تر وەرەوە هەموو شتێك بە دڵی تۆ دەبێت، زۆر دڵشاد بوو، دوایی دوو ڕۆژەکە خۆی گەیاندەوە لای گەورەی جادووگەران، بەڵام جادووگەر ووتی: پارەکەت ببەوە هیچم بۆ ناکرێت و بێ سوودە.

گەنجەکە ووتی بەڵام بۆچی ناتوانن هیچ بکەن؟!

جادووگەر ووتی: ئەو بە شتێك پارێزراوە وەك قەڵا پارێزگاری لێ دەکات.

کوڕەکە ووتی چی یە: ئەوە چی یە؟

ووتی: ئەو کچە سورەتی (البقرة)ی لەبەرەو لە سینەی دایە.

کوڕەکە گەڕایەوە و بە فەزڵی خودا و کتێبەکەی نەیتوانی هیچ بەرانبەر ئەو کچە داوێن پاك و لە خوا ترسە بکات.

پێغەمبەرمان(صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(اقرؤ سورة البقرة، فان أخذها بركة و تركها حسرة ولا يستطيعها البطلة)[1].

واتە: (سورەتی (البقرة) بخوێنن، چونکە بەرەکەتی تێدایەو واز لێهێنانی داخ و حەسرەتی بە دوا دادێت و بە دەست پێوە گرتنی جادووگەران دەستەڵاتیان نامێنێ).

هەروەها لەم چیرۆکی سێ یەمەدا بۆمان دەردەکەوێت هەرکەس دەست بەم قورئانەوە بگرێت لە هیچ لایەکەوە خراپەو ناڕەوا نایگرێتەوە.

کچێکی چاکەکار و ڕەوشت جوان و ئایندار هەبوو، زۆر حەزی لە قورئان دەکرد و هەمیشە دەیخوێندەوە، ئەم کیژۆڵەیە ویستی خودا وابوو تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی جگەر بێت، برایە نەخۆشخانە بۆ چارەسەر، دوایی ماوەیەك پزیشکەکان لێ ی بێ ئومێد بوون و ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو لە مەرگ نزیك دەبویەوە خۆی هەستی دەکرد چیتر تەندروستی بۆ ناگەڕێتەوەو بەهەر حاڵێك داوای لە براکەی کرد قورئانێکی بۆ بێنێت، ئیتر شەو و ڕۆژ دەیخوێند و فووی بە دەستەکانیدا دەکردوو بە جەستەیدا دەهێنا، لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوو، بە هیوا بوو ڕۆح سپاردنێکی ساناى هەبێت، بەڵام زۆری پێ چوو، شەوان و ڕۆژان تێپەڕیان کردو ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبوو، تەندروستی بۆ دەگەڕایەوەو هەستی بە چالاکی دەکرد و

---

(١) رواه مسلم.



نیشانەکانی چاك بوونەوە لێ ی دەردەکەوت، دەم و چاوی گەشایەوە، پزیشکەکان سەریان سوورِمابوو لە براکەیان پرسی: ئایا چ چارەسەرێکتان پێ داوە؟ براکەی ووتی: باشترین دەرمانی بەکار هێناوە، قوورئانی دەخوێند و بەدەستی دەیهێنا بە جەستەیدا و خودای گەورە بە فەزڵی خۆی شیفای بۆ نارد[1]، پاك و بێ گەردی بۆ ئەو خودایەی ئێسکەکان دوای ئەوەی دەبنەوە بە خۆڵ زیندوویان دەکاتەوە.

خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾[2].

ئایەتەکانی خودا بەردەوام ئەو کەسانە دەپارێزێت کە دەیخوێنن لە دڵە ڕاوکێ و ترس و گرێ ی دەروونی و جۆرەها کێشە، بەڵام ئەوانەی لەم نیعمەتە دوورن شەیتانەکان زاڵن بەسەر دەروونیان دا و ژیانیان بووە بە تاریکی و دڵە ڕاوکێ و ترس و بەدوا داچوونی شتی خەڵك، لە بەرانبەردا خوێندنی قورئان پارێزەرەو بۆ دنیا و دوا ڕۆژ بەرەکەت دارە. کەواتە با هەمیشە ئاگادار بین و قورئان بخوێنین.

---

(١) شێخ (جاسم العیناتی) ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە.

(٢) سورة الاسراء: اية ٨٢.





## بیمەی خودایی

دوو بازرگان بوونە دوو هاوڕێی زۆر نزیکی یەك، یەکێکیان کوەیتی و ئەویتر خەڵکی سعودیە بوو، ئەوەی پەیوەندیەکەی بەتین تر کردبوون ئیسلامەتی بوو، بوویوونە دوو برای گیانی بە گیانی یەك و یەکتریان لە خۆیان خۆشتر دەویست، پاشان پێکەوە رێك کەوتن ببنە هاوبەش لە کاری بازرگانی دا و زیاتر پێکەوە بوون، نمونەی بازرگانی رێك و دەست پاك بوون وە بازرگانیەکەیان فراوان بوو، بە فەزڵی خودا خێرێکی زۆر رژا بەسەریاندا و رۆژێکیان پێکەوە دانیشتبوون گفتوگۆیان دەکرد.

بازرگانە کوێتی یەکە بە هاوڕێکەی ووت: بۆچی بیمە بۆ بازرگانیەکەمان نەکەین؟ هاوڕێکەی لە وەڵامدا ووتی: بۆچی بیمەی بکەین؟

ووتی: چونکە زۆربەی شت و مەکەکانمان بە رێگەی دەریایی دادێن و ئەگەری تووشبوون بە رووداوی زۆرە، ئەگەر خوا نەکردە رووبدات، ئەوا زیان ناکەین و کۆمپانیای بیمە بۆمان قەرەبوو دەکاتەوە رات چیە ؟.

هاوڕێکەی ووتی: ئەی نەت زانیوە ئێمە شت و مەکەکانمان بیمە کردووە.

ووتی: لەکوێ ؟

هاوڕێکەی ووتی: لەلای خوای باڵا دەست.

ووتی: باشترین کەس خودایە پشتی پێ ببەستین بەڵام ووریا بوون پێویستە.

هاوڕێکەی دڵنیایی کردەوە ووتی: ئێمە زەکاتی ئەم بازرگانیە دەردەکەین وانیە ؟

ووتی: بەڵێ

هاوڕێکەی ووتی: کەواتە ئیتر ترست نەمێنێت و باشترین بیمە پشت بەستنە بە خودا و دوودڵ مەبە.

ووتی: پشت بە خودا و دڵنیا بوومەوە.

دوایی ماوەیەك بازرگانیەکەیان فراوان و فراوانتر بوو، رۆژێکیان کەشتیەك بەڕێوەبوو شتومەکی زۆری هەڵگرتبوو، لە شتومەکی ئەم دوو بازرگانە لەنێوانیاندا بەڵام پێش گەیشتن تووشی ڕووداو هات و نوقوم بوو و تیمی



فریاکەوتن دەست بەکاربوون و، هەمووان لە کەنارەکە چاوەڕێیان دەکرد، یەکێك لەبازرگانەکان زۆر ئاسوودە و دڵنیا بوو لەوەی خودا دەیکات هەر دەبێ، بەڵام ئەوی تر کەمێك شێوا بوو و لە دڵەراوکێ دابوو.

دوایی رزگار کردن سەیر بوو، شت و مەکەکانیان تیاچووبوون و خراپ بووبوون، تەنها هی ئەم دوو بازرگانە نەبێت، بەهۆی ئەوەی کیسەی ئاردی زۆر لە دەوری شت و مەکەکانی ئەمان دانرابوو، رێگر بوو لەوەی ئاوی پێبگات، چونکە ئاردەکان ئاوەکەیان هەڵمژی بوو، پاشان رەق بوویوون و نەیانهێڵابوو شت و مەکەکانی ئەم دوو بازرگانە تەڕ ببێت.

بازرگانە دڵنیاکە ووتی: سوێند بە خوا هەستم نە بە ترس و نە بە دڵە ڕاوکێ نەکرد متمانەی تەواوم هەبوو کە خودا شتەکانمان ڕزگار دەکات، چونکە ئێمە زۆر لەسەر زەکات دان سوورین و بە سینگێکی فراوانەوە کردوومانەو ئەمە باشترین بیمە و بەهێزترین پاراستنە.

هاوڕێکەی ووتی: لە ڕاستیدا منیش هەستێکی وام هەبوو بەڵام کەمێك ترسم هەبوو. ئەوی تر ووتی: مەترسە چونکە هەرکەس لەگەڵ خوادابێت خوای لەگەڵە.

ئەم دووبازرگانە ئیمانەکەیان و متمانەیان بە خوا و ڕاستگۆییان و زەکات دانیان وای لێ کردن لە هیچ نەترسن و خودا بیانپارێزێت[1]. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ۞ وَٱكْتُبْ لَنَا فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ۚ قَالَ عَذَابِىٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ ۖ وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾ [2]

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت:

(حصنوا أموالكم بالزكات و داو وامرضاكم بالصدقة واعدوا للبلاء الدعاء) [3]

واتە: (ماڵ و سامانتان بە زەکات دان بپارێزن و، نەخۆشەکانتان بە خێرکردن چارەسەر بکەن و بۆ بەڵاو نەهامەتیەکان نزاو پاڕانەوە بکەن)

---

(١) ئەم ڕووداوە بەرێز (عدنان راشد الرومي) ی بۆی گێڕامەوە.

(٢) سورة الاعراف: اية ١٥٦.

(٣) رواه الطبراني..



## هەرکەس لەگەڵ خودا بێت
## خودا لە پشتی دەبێت

لەکاتی داگیرکاریەکەی عیراق بۆ سەر کویت، وولات پڕبوو لە خاڵی پشکنین، بەڕێز (سالم الخشان) یەکێك بوو لەوانەی کە هاوکارو یارمەتیەکانی دەگەیاندە خەڵك و دابەشی دەکرد، کاتێك بە خاڵی پشکنینەکاندا تێپەڕی دەکرد زۆر بە ووردی دەیانپشکنی و مامەڵەی خراپیان لەگەڵیدا دەکرد، ڕۆژێکیان ئەم بەڕێزە دەگێڕێتەوە دەڵێت: ڕۆژێکیان چووم بۆ مزگەوتی العدیلیە- کە ئێستا مزگەوتی شێخ ئیبن جەڕراحە- بۆ ئەوەی هەندێ پارە وەربگرم و دابەشی بکەم و*هەر بستە ڕێ یەك خاڵێکی پشکنینی تێدا بوو، زۆر بە توندی خەڵکیان دەپشکنی، گەیشتمە مزگەوتەکەو پارەکانم لە (جمال الحداد) وەرگرت و لە نێو سندوقی ئۆتۆمبێلەکەمدا دامناو پشت بە خودا ڕۆیشتم تا دابەشی بکەم بەسەر خێزانەکاندا.

کاتێك ڕۆیشتم بەبێ ئاگایانە کەوتمە ناو دژوارترین خاڵی پشکنین کەدەکەوێتە نێوان وەزارەتی کارەباو پاسەوانی نیشتیمانی، زۆر وورد خەڵکیان دەپشکنی و بێ ڕێزیان دەکرد، خەڵك هەمووی خۆی لادەدا لەو خاڵی پشکنینە، بەڵام من بەو پاڕانەوە کەوتوە ناویەوەو ناتوانم بگەڕێمەوە، دەستم کرد بە خوێندنی ئەم ئایەتە:

﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾[(١)].

نزام زۆر کردو پاڕامەوەو خۆم دایە دەستی خودا، کاتێك چوومە پێشەوە، سەربازەکە تەماشایەکی کردم و ووتی: حاجی بڕۆ، بەبێ پشکنین تەنانەت داوای ناسنامەو مۆڵەتی ئۆتۆمبێلەکەشیی نەکرد...زۆر سوپاسی خودام کرد و یارمەتیەکەم ماڵ بە ماڵ دابەش کرد، پاشان دڵنیا بوومەوەو هاتمەوە بۆ ماڵەوە

---

(١) سورة یس: ایة ٩.



تا بزانم خێزانەکەی خۆم چۆنن، هاوسەرەکەم و سێ کچم بەجێ هێشتبوو، کاتێك گەیشتمە شەقامەکەی ماڵی خۆمان، هەموو دراوسێکان لە دەرەوە بوون و هەندێ سەرباز لەو ناوەدا بڵاوەیان کردبوو، ماڵەکانیان پشکنی بوو، زۆر ترسام و خەمی خێزانەکەی خۆمم بوو، بەڵام دراوسێیەکم چرپاندی بە گوێم داو ووتی: خەمت نەبێ لە ماڵی ئێوە هەر نزیك نەکەوتنەوە!!

دووبارە دەستم کردەوە بە سوپاسی خواو خۆم گەیاندە ماڵەوە، تەماشام کرد ژنەکەم دانیشتووەو کچەکانم نوستوون و هەر ئاگایان لەم هەرایەی گەڕەك نەبووە، ئەمەم بە ڕەحمی خودا زانی[1].

کەواتە هەر کەس پشتی بە خودا بەست خودا پشتی دەبێت بۆی و یارمەتی دەدات و، وەك بینیمان خودا باشترین یارمەتی دا لەم هەڵوێستانەدا و چاوی دوژمنانی کوێرکرد و بە تایبەت پاراستنی خێزانەکەی چونکە ئەم بە هانای خێزانە لێقەوماوەکانەوە دەهات و خوداش ئاگاداری ئەمان بوو. خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾[2].

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت: (المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضا)، واتە: ((ئیمانداران بۆ یەکتری وەك بنچینەی خانوویەك وان هەموویان پشت بە یەکەوە دەدەن)).

---

(١) بەرێز (سالم خشان) ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە.

(٢) سورة الطلاق: ایة (٣).





# تــــەقـوا

(ع) لە یەکێك لە بنکەکانی سەر سنوور فەرمانبەر بوو، دەبوایە هەموو شتێك لەوێوە بێتە ناو وولاتەوە، کەسێکی زۆر دەست پاك و جێگەی متمانە بوو، زۆر سۆر بوو لەسەر ئەوەی لە کارەکەیدا کاری نایاسایی نەکات و بە موو لە یاسا لای نەدەدا،

ئیتر بەرامبەرەکەی هەر کەسێك بوایە، بەڵام سەرۆکەکەی بەرتیل خۆر بوو، بەرامبەر دیاری و بڕە پارەیەك چاوپۆشی لە ئاودیوکردنی زۆر شت دەکرد، بەڕادەیەك بوو ڕۆژێکیان (ع) ی بانگ کرد و باسی وەرگرتنی پارەی بۆ دەکرد و هانی دەدا، تاوەکو ئاسانکاری بەرانبەر پارەکە بکات، بەڵام کاتێك (ع) گوێبیستی ئەم ووشانە بوو موو چرك لە تەوقی سەریەوە تا بنی پێی ڕۆیشت و چووە دەرەوە چونکە خەریك بوو لە داخ دا بخنکێت، کەسێکی ئەوەندە پاك بوو لەم کەشە پیسەدا خۆی بۆ ڕانەدەگیرا.

ڕۆژان هاتن و چوون و تاقی کردنەوەو تەماعی زۆر هاتە بەردەمی و بەبەر چاویەوە ئەوانی تر بەرتیلیان وەردەگرت، جارێك دەیانووت ئەمە دیاری دەزگاکەمانەو جارێکی دی دەیانووت دیاری یەو....و.

بەڵام وەك چیا خۆڕاگر بوو، ئەم شتانە تامەزرۆیان نەکرد و هیچی وەرنەگرت بەڵام بیری کردەوەو ووتی تاکەی خۆی لەم تاقیکردنەوەیدا بهێڵێتەوە؟ ترسا دەروونی زاڵ بێت و ئەم بەرتیلانە سەری لێ بشێوێنن و تەماع بیگرێت، لەبەردەم دوو هەڵبژاردن دایە: یان واز لە مووچەو پیشەکەی بهێنێت، یاخود سنووری خودا بشکێنێ و بەرتیل وەربگرێت. لێرەدا ئەم ئایەتەی کەوتەوە بیر:

﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾[1]

---

(١) سـورة الطلاق: اية (٢)(٣).



دەست لەکار کێشانەوەی پێشکەش کرد و لەم کەش و هەوا پیسە خۆی ڕزگار کرد تاوەکو ڕۆزی حەڵاڵ بدۆزێتەوە، بار هەڵگرێکی بچووکی کڕی و دەستی بەکار کردن کرد و شت و مەکی دەگوێزایەوە، هێواش هێواش خوا یارمەتی داو کارەکەی بەرەو پێش چوو، بارهەڵگرێکی تریشی کری و هەندێ لە بازرگانەکان پەیوەندیان پێوە دەکرد شت و مەکەکانیان بۆ بگوێزێتەوە، لەبەر ئەوەی شارەزای متمانەو ڕاستگۆیی و وووریایی زۆری بوو بوون لەکاتی گوێزانەوەی شتەکاندا، وەك ئەوەی هی خۆی بێت، بەم جۆرە چەند بارهەڵگرێکی دیشی کڕی و شوفێری لەسەر دانا.
ڕۆژێکیان یەکێك لە شوفێرەکانی تووشی پێکدادان هات و تێك شکاو، هەڵەی شوفێرەکەی بوو، شوفێرەکە بەشەرمەزاریەوە یۆزشی خواست لە (ع) و دڵی دەلەرزی و شڵەژابوو، بەڵام (ع) زۆر بە ئارامی و سنگ فراوانی لێ بوردنەکەی وەرگرت و دەستی خستە سەر شانی و پێ ی ووت وابزانە هیچ نەبووە و دڵ خۆشی دەدایەوە.
لەو کاتەدا پۆلیسەکە سەرنجی هەڵوێستی (ع)ی دەدا و زۆر سەرسام بوو بەو هەڵس و کەوتە نەرم و نیانەی لەگەڵ شوفێرەکەی دا، بڕیاری دا دەبێت هەر بیناسێت و ناونیشانی لێ وەرگرت. چەند ساڵێك تێپەڕین و ئەم پۆلیسی هاتووچۆیە بووە یەکێك لە گەورە بازرگانەکان و شت و مەکێکی زۆر گەورە و گرانبەهای بۆهات، لێرەدا (ع)ی یاد هاتەوە کە چەندە ڕەوشتی جوان و لێبوردە و بە متمانە بوو، پەیوەندی پێوە کرد و داوای گواستنەوەی شتەکانی لێکرد[1].
پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه و سلم) فەرمویەتی:
((لايبلغ العبد ان يكون من المتقين حتى يدع مالا بأس به حذرا لما به بأس))[2].
واتە: مرۆڤ ناگاتە پلەی تەقوا هەتا ئەوەی گومانی تێدایە وازی لێ نەهێنێت لە ترسی ئەوەی نەوەك بەرەو خراپە رایبکێشت).
ئەم پیاوە وازی لەو کارە هێنا و خودا باشتری هێنایە پێشەوە بۆی، تەنها فەرمانبەرێکی ئاسایی بوو، لەو کاتەدا هیچی تری شك نەدەبرد بژێوی پێی دابین بکات، بەڵام ترسا تووشی حەرام ببێت و وازی هێنا و بە شوێن رۆزیەکی حەڵاڵدا وێڵ بوو، خودا دەروازەی خۆی بۆ والا کردو بوو بە گەورە بازرگان.

(١) لە (قصص ايمانية).
(٢) رواه البخاري.





## بـــەزەیـی

پیاوێکی چاکە خوازو لە خوا ترس بوو، خودا ڕۆزیەکی بەسەردا ڕشتبوو، بەڵام ویستی خودا وابوو تووشی نەخۆشی دڵ بوو، بۆ چارەسەر چووە دەرەوەی وولات، چونکە نەخۆشیەکە تەواو دەستی بەسەردا گرتبوو، جەستەی لاوازو کەنەفت کردبوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو، لەوێ چووە نەخۆشخانەیەکی بەناوبانگ و لە دوای پشکنین ئامۆژگاریان کرد زۆر بەپەلە دەبێت نەشتەرگەری بکەیت و پێیان ووت:

(باشترەو پێویستە نەشتەرگەریەکە بەپەلە بکەی ئەگینا ئەنجامەکەی هیچ گرنگیەکی نامێنێت چونکە حاڵەتەکەت زۆر ترسناك و مەترسیدارە) دوایی گوێبیست بوونی ئەم ووشانە داوای لێکردن کەمێك نەشتەرگەریەکەی بۆ دوا بخەن تا دەگەڕێتەوە بۆ وولاتی خۆی و ماڵئاوایی لە کەس و کارو ناسیارەکانی بکات و چی لەسەر شانە هی خەڵك بیداتەوەو سپاردەکانی بگەیەنێتەوە دەستی خاوەنیان، نەوەك جارێکی تر چاوی پێ یان نەکەوێتەوە و، زوو دەگەڕێتەوە و بەم جۆرە مۆڵەتی خواست لە پزیشکەکان.

گەڕایەوەو هەرچیەکی لەسەر بوو گەیاندیەوە و لە نێو کەس و کاری دا مایەوەو وەسیەتی خۆی بۆ کردن و پاشان ئامادە بوو بگەڕێتەوە، پێش گەڕانەوەی یەکێك لە هاوڕێکانی هاتنە لای و بڕیاریاندا کەمێك پیاسە بکەن، پێکەوە خەریکی گفتوگۆو پیاسە بوون و بەلای قەسابخانەیەکدا ڕۆیشتن، سەرنجی دا پیرێژنێك ئەو ئێسك و پارچە گۆشتانەی بەزەویەکەوە نووساون و یان پەڕیون کۆی دەکاتەوە. دڵی زۆر بۆی سووتاو لێ ی نزیك بوویەوەو پێی ووت: ئەوە چی دەکەیت؟

ووتی: من هەژاری و نەبوونی وای لێکردووم، خاوەنی سێ کچم و ژیانێکی پڕ نەهامەتیمان هەیە و کەس نیە بەخێومان بکات، زۆر لەمێژە گۆشتمان نەخواردووەو ئەوە دەبینیت ئەمانە کۆ دەکەمەوە بەشکو برسێتی کچەکانمی پێ دا بمرکێنمەوە، تەنها خودا دەزانێ لە چ هەژاریەکدا دەژین.



دوای ئەوەی گوێبیستی ئەم قسانە بوو بردی بۆ لای گۆشت فرۆشەکەو پێ ی ووت ئەم ژنە چەند گۆشتی دەوێت پێی بدە، ژنەکە ووتی: تەنها یەك کیلۆم دەوێ. کابرا ووتی بەڵکو دوو کیلۆ و هەموو هەفتەیەکیش پێشەکی یەكساڵی دایە دەستی گۆشت فرۆشکە پیرێژنەکە دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و لە ناخی دڵیەوە دەستی کرد بە نزا کردن بۆ ئەم پیاوە و ژنەکە دەنگی نەدەهات بەڵام بەدڵ دەپاڕایەوە بۆی، هەر کە ژنەکە دەستەکانی داگرت، کابرا هەستی کرد چالاك بووە و هەستی کرد گڕو تینی بۆ دەگەڕێتەوە و پێشتر هەستی بەم جووڵانە نەدەکرد، گەڕایەوە تا خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکات، یەکێك لە کچەکان هات بە پیریەوەو ووتی: باوکە گیان نیشانەی چاك بوونەوەو لەش ساغی بە ڕووتەوە دیارە سوپاس بۆ خودا!!

باوکە بە درێژی بابەتەکەی بۆ گێڕایەوەو ووتی: ئەوە زۆر خۆشحاڵم بەو کارەم بۆیە وا دیارم، کچەکە دەستی کرد بە پاڕانەوە کە خودا چۆن دڵی ئەو ژن و سێ کچەی خۆش کرد دڵی ئەمانیش بە چاك بوونەوەی باوکیان شاد بکات.

کابرا گەڕایەوە نەخۆشخانەکەو، پزیشکەکان دەستیان کرد بە پشکنین و سەرسام بوون!، ووتیان ئەمە ناکرێ.. تۆ چاك بوویت و نەخۆشیەکە لاچووە. پشکنینەکانی پێشووت زۆر جیاوازە لەم پشکنینە نوێ یەت.. لە کوێ چارەسەرت وەرگرت؟! کێ چاکی کردیتەوە؟!! کێ بەم خێراییە توانی چاکت بکاتەوە؟!

ئەویش چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و ووتی: خودای بەبەزەیی چاکی کردمەوە.[1]

خودا بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەم پیاوە زۆر نزیکتر بوو لە مەرگ تا ژیان، گەڕابوویەوە تا ماڵئاوایی لە کەس و کاری بکات نەوەك نەیانبینێتەوە، بەڵام کاتێك دڵی بەو پیرەژنە سووتاو بەزەیی پێدا هاتەوە، خودا زۆر لەو بەخشندە ترو بەبەزەیی تر بوو: پاداشتی ئەو سۆزو بەزەییەی بۆ کرد بە چاك بوونەوە، چونکە ئەوانەی بەزەییان بە خەڵك دادێتەوە خودا بەزەیی پیاندا دێتەوەو زۆر تەواوە کە دەڵێت: (بەزەییت بە خوار خۆت دا بێتەوە با ئەوەی لەسەرتەوەیە بەزەیی پێتدا بێتەوە).

---

(١) لە (جريدة القبس) بە دەستکاریەوە.





خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ۝٥٦﴾ [1]

پێغەمبەری خوداش(صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(من أراد ان تستجاب دعوته وان تكشف كربته فليفرج عنه معسر)[2]

واتە:(هەرکەس دەیەوێت خودا نزاکەی گیرا بکات و بەڵاکەی لەسەر هەڵبگرێت با کەسێك لە تەنگانە ڕزگار بکات).

---

(١) سورة الاعراف: اية ٥٦.

(٢) رواه أحمد.



## بەرهەمی خێرکردن

زۆر حەزی بە خێرکردن دەکرد و هاوکاری لێقەوماوانی دەکرد، ئەو مووچەیەی وەری دەگرت پێویستیەکانی خێزانەکەی لێ جێ بە جێ دەکرد و ئەوەی بۆی دەمایەوە دەیبەخشیە کەسانی نەدار و نەبون، هەمیشە بە دوای کەسی نەبوون و نەدار دا دەگەڕا و ئەوەی دەیتوانی پێ ی دەداو پاشان ئامۆژگاری کەسانی خێرخوازی دەکرد کەوا دەستیان بگرن و هاوکاری ئەو خێزانە هەژارانە بکەن.
ئەگەر چی مووچەی مانگانەکەی ئەوەندە نەبوو، بەڵام زۆر خۆش گوزەران و دڵ ئارام و دەروون ساف دەژیا، خوداش هاوسەرێکی وەك خۆی چاکی پێ بەخشی بوو هەمیشە هانی دەدا بۆ کاری چاکە و پشتی دەگرت، وەك پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت:
(خیر متاع الدنیا المرأة الصالحة).
واتە: باشترین نیعمەتی دنیا ژنێکی لە خوا ترس و چاکە.
ڕۆژێکیان ئەم پیاوە بەرەو مزگەوت دەچوو بۆ نوێژ، ژنەکەی پێ ی ووت: لەدوای گەڕانەوەت هەندێ شت بۆ منداڵەکان بکڕە و هەروەها شیریان نەماوە.
پیاوەکە بەرەو مزگەوت ڕۆیشت، بەڵام جزدانەکەی دەرهێنا یەك دیناریشی تێدا نەبوو بە ژنەکەی ووت: خودا ئاسانی دەکات، گرنگ ئێستا دەچم بۆ نوێژەکەم.
لە نوێژەکەدا و لە دوای نوێژەکە بە دڵ لە خودا پاڕایەوە ڕۆزی پێ ببەخشی، خودای گەورە نزیکە و وەڵامی ئەوانە دەداتەوە لێ ی دەپاڕێنەوە، لەپاش نوێژەکە ئیتر زۆر دڵنیا و دڵشاد بوو، بێ گومان بوو لەوەی خودا ئەم کۆسپەی بۆ لادەبات، هاتە ماڵەوەو ژنەکەی بە زەردەخەنەوە هاتە بەردەمی و ووتی: بگرە، ووتی ئەمە چی یە؟ ووتی: دوو سەد دینارە.
خەریکی جیاکردنەوەی جلەکان بووم و جلی زستانەم دەردەهێنا ئەمەم لە گیرفانێکتدا دۆزیەوە.
ئەم خێرخوازە لە خۆشیاندا کڕنوشی سوپاسگوزاری بۆ خودا برد کە چەند





بەبەزەیی و بەخشندەیە لەگەڵ بەندەکانیدا[1].

ئەم کابرایە ئەگەرچی خۆی زۆر دەوڵەمەند نەبوو، بەڵام هەمیشە لە خەمی هەژاران دا بوو، پارەی خۆی خەرج دەکرد بۆیان و لە هەژاری نەدەترساو، زۆر دڵنیا بوو لەوەی کە خودا ڕۆزی دەرە، کاتێکیش خۆی پێویستی هەبوو خودا لەم شوێنەی ئەم پەی پێ نەدەبرد یارمەتی دا، چونکە هەرکەس ئاگای لە موسوڵمانەکانی هاوئیمانی خۆی بێت، خودا پشت گوێ ی ناخات و یارمەتی دەدا. خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾[2]

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ- دەگێڕێتەوە ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) چ کارێك باشترین خێرکردنە؟ فەرمووی: ((جهد المقل و ابدأ بمن تعول))[3].

واتە: هەوڵدانێك بە دڵ بێت و لە چاکە دابێت و بەو کەسە دەست پێ بکە کەلەسەرتە بەخێوی بکەیت و لەژێر دەستتدایە.

---

(١) بەرێز (سالم الخشان) ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە.

(٢) سورة الطلاق: اية (٢، ٣).

(٣) رواه أبو داود.

# بەشی دووەم: چی بچێنی درویّنەی دەکەیت

یەکەم: لووت بەرزی ژنێك.

دووەم: سزا بە وێنەی کارەکە دەبێت.

سێیەم: ڕژدی و بەرچاوتەنگی.

چوارەم: سزای ستەم.

پێنجەم: ڕۆژگار دەسوڕێتەوە.

شەشەم: غیرەیەکی بکوژ.

حەوتەم: نەفامی.





## لووت بەرزی ژنێك

بەدەستی خۆی ماڵەکەی لە خۆی تێکدا، دڵ نەرمی و لەخوا ترسی مێردەکەی قۆستەوەو بێ دەنگ بوونی لە کردەوەکانی زیاتر گومڕایان کرد و پێ ی لێ ڕاکێشا، زیاتر هەڵس و کەوتی زبرو ناشرینی دەکرد و تێدا نقوم بوو، با لە زمانی خۆیەوە گوێ لە چیرۆکی ئەم ژنە بگرین:

کاتێك هاوسەرگیریم کرد ژنێکی زۆر جوان و منداڵ بووم، خودا چەند کوڕێکی پێ بەخشیم، هەرکاتێك کوڕێکم دەبوو دڵم پڕ دەبوو لە لوت بەرزی و لەخۆبایی بوون و دڵم زۆر شادومان دەبووم خۆم بە شت دەزانی.

بەهێنانە دنیای کوڕەوە زیاتر هەستم بە هێزو متمانە دەکرد و حەزی دەستەڵات و دەست گرتن بەسەر دەوروبەردا بەسەرمدا زاڵ دەبوو، چونکە ئەوانەی دەوروبەرم زۆربەیان هەر کچیان دەبوو، یەکەم کەس بەم ئاگری لووت بەرزیەم سووتا هاوسەرەبەستەزمانەکەم بوو، لێبوردەیی و ئارامی و ڕێك و پێکیەکەیم بە هەل زانی و پشتم بە دوو شت قایم بوو: جوانیەکەم و، ئەو ژمارە زۆرەی لە کوڕ هەمبوو.......

وام دەزانی هەموو کەس وەك هاوسەرەکەم بەرگەم دەگرێت، بەم هەڵسوکەوتە ناشرین و قسە ڕەقانەم کەسم لە دەرری خۆم نەهێشت لە خزم و ناسیا و هاوڕێ و هەمووی لێم دوور کەوتنەوە تا لە شەڕم بە دوور بن.

کوڕەکانم گەورە دەبوون و ئەوەندەم لە بن گوێیان خوێندبوو کە ئەم باوکەتان ستەمی لێکردوم و تاڵاوی کردووە بە گەرومدا لە سەرەتای ژیانمەوە...هتد، لە ڕاستیدا هیچی وانەبوو، بەڵکو نموونەی هاوسەری ئارام گرو لێبوردە بوو، بەڵام من بەمشێوەیە دەمخستە دڵی کوڕەکانمەوە بۆ ئەوەی دڵیان ڕابکێشم بۆخۆم و تۆوی ڕق بەرامبەر باوکیان لە دڵیان دا بچێنم، بەم شێوەیە وام لێکردن ئیتر هەر بە چاوی من دەیانبینی و بە گوێ ی من دەیانبیست و بە دەستی من دەجوڵانەوە، کۆمەڵە گەنجێکی دڵ ڕەق و ستەمکار و دۆڕاو لەخوێندن و قوتابخانەو، کوڵێك ڕق و کینە لە دڵیاندا دژی باوکیان چێنراو لە ژێر دەستمدا پێگەیشت، تا کار



گەیشتە ئەوەی هەڕەشە لە باوکە هەژارەکەیان بکەن ئەگەر من تورە بکات.
ڕۆژان هاتوو چوو، خودا ویستی وابوو تووشی نەخۆشیەکی درێژ خایەن بووم و کەوتمە ناو جێگاو تەنانەت بۆ پێویستیە تایبەتیەکانیشم هەر دەستەوسان بووم و نەمدەتوانی خۆم بیکەم، لێرەدا تەنها مێردەکەم بۆم مابوویەوە.. ئەو پیاوە چاکەی کە هێشتا ئارامی لەسەر خزمەتکردنم دەگرت و کەمتەرخەمی نەدەکرد لە خزمەت کردنمدا، ئەگەر چی لە ناچاریشدا بوو بە هۆی ئەو تاڵاوانەی بە دەستمەوە چەشتبووی، بەڵام لەبەر باشی خۆی ئەرکی سەر شانی جێ بە جێ دەکرد.. بەڵام ئەو کوڕانەی خۆم پیانەوە هەڵدەکێشاو دەمنازی بێ ئومێدیان کردم و لە ناخۆشترین کاتدا بە جێیان هێشتم بە بیانووی ئەوەی سەر قاڵن بە کاری تایبەت و خێزانەکانیانەوە کەسیان هیچ سوودێکیان نەبوو بۆم.
هاوسەرەکەم ئێستا دوای چەند خزمەت کردنم بڕیاری داوە هاوبەشێکی دی بۆخۆی هەڵبژێرێت و منیشی پشت گوێ نەخست، هەتاوەکو بەڵکو لەم تۆزەی ژیانەی ماوەتی کەسێك بدۆزێتەوە شایستەی چاکیەکەی بێت و وەك من مایەی نەگبەتی نەبێ بۆی و مافی خۆیەتی).
ئەمە سەرەنجامی ئەم ژنە بوو کە تەنها پەشیمانی و حەسرەتی درونە کردووە لە هەڵس و کەوتە ناشرینەکانی بەرانبەر کەسێکی باش، زۆر خراپ و تا توانی گومڕا بوو بەسەریداو لەبری ئەوەی سوپاسگوزار بێت هاوسەرێکی باشی هەیە کە ئەوەندە بێدەنگ و نەرم و نیانە، خراپەی کرد و کوڕەکانی کردە دوژمنی باوکیان بەبێ پاساو تازە لە کۆتاییدا فرمێسك بۆ ئەو ڕۆژانە هەڵدەوەرێنێ کە بەسەر چوون، دەبێت زۆر ئاگادار بین لە لووت بەرزی چونکە کۆتاییەکەی زۆر تاڵ و بە ئازار دەبێت.
لە دایکی ئیمانداران عائیشە- ڕەزای خوای لێ بێ- یان پرسی: چاکترین ئافرەت کێ یە؟ ووتی: ئەو ئافرەتەیە ئاگای لە خراپە و عەیبی ووتراو و قسەکان بێت وە بەدەم مەکری پیاوانی بێ ویژدان و بێ دڵەوە ناچێت و تەنها خۆی بۆ مێردەکەی دەڕازێنێتەوە و، هەمیشە خێزانەکەی دەپارێزێت).
هەروەها حسن ی بصری دەفەرموێت: (وا پێویستە ئەو کەسەی خودا ڕوخساری جوانی پێداوە بە کارو کردەوەی ناشرین قێزەونی نەکات وە وایش باشە کەسی ڕوخسار ناشرین بە کردەوەی خراپ خۆی ناشرینتر نەکات).

## سزا بە وێنەی کارەکەی دەبێت

هەمیشە لە ماڵەوە خەریکی شەڕو دەمەقالێ بوو، زۆر دڵ ڕەق بوو بەرانبەر ژنەکەی و سروشتی وەك بەرد وابوو بەزەیی تێدا نەبوو، ژنەکەی هەمیشە باجی ئەم دڵ ڕەقی و هەڵس و کەوتە ناشرینانەی دەدا و بەردەوام هەرابوو....

ڕۆژێکیان هاتەوەو خۆی لە دەرەوە توڕە بوو، جامی توڕەیی بەسەر ژنەکەیدا ڕشت،لەگەڵ گەیشتنی شەڕێکی بێ پاساوی نایەوەو ژنەکەیشی وەڵامی دەدایەوە، تا کار گەیشتە ئەوەی دارێکی ئەستوری هەڵگرت و دای بەسەریدا، ئەوەندە لەسەر ڕق لێیدابوو ژنەکە پێ ی مرد، بەڵام ئەم ویستی کوشتنی نەبوو، تەنها دەیویست تەمبێ ی بکات، کە بە مردوویی چاوی پێ کەوت زۆر ترساو سەری لێشێوا، نەیدەزانی چی بکات، بیری بۆ نەدەکرایەوە و هیچ ڕێگا چارەیەکی بەدی نەدەکرد بۆ ئەم بەڵایەی بەسەر خۆیدا هێنای، لە ناکاو ناسیارێکی دوری بەیاد هاتەوە، هاتوو چۆی لەگەڵیدا نەبوو، بەڵام لە هەندێ سیفەت دا یەکیان دەگرتەوە و هاوڕێیەتیەکی دێرینیان بەیەکەوە هەبوو، بەپەلە خۆی گەیاندە لای بەڵکو چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە.

ناسیارەکەی پیلانێکی شەیتانی پێ بوو بۆی پێ ی ووت: بڕۆ کوڕێکی جوان بدۆزەرەوەو بۆ میوانی بە ناو شتێکەوە بیبە نێو ماڵەکەتەوە، پاشان بیکوژە و جەستەکەی بخەرە لای ژنەکەتەوە و، بە کەس و کاری بڵێ کەوا هاتویتەتەوە و ئەم کوڕە گەنجەت لەگەڵیدا گرتووەو خۆت پێ نەگیراوە و کوشتوتە، بەم شێوەیە زۆر بەڕێزەوە لەم کێشەیە ڕزگارت دەبێ.

هەر کە ئەم قسانەی بیست شا گەشکە بوو، بە خێرایی گەڕایەوە و لەبەر دەرگای ماڵەکەیدا دانیشت، ماوەیەك چاوەڕوانی کرد گەڕەك چۆڵ بوو، کەس بەوێدا نەدەڕۆیشت، لە ناکاو کوڕێکی جوان بە وێدا تێپەڕی و کابرا کەوتە سەری و ووتی: چۆنی و خۆی لێ کردە ناسیاو، ووتی دەبێ هەر بێیتە ژوورەوە و میوانداریت بکەم، کوڕەکە سەری سوور مابوو، ئەم کابرای قەت نەدی بوو، بەڵام زۆری لێدەکرد و ڕایکێشاو، دەرگای لەسەر داخست و کوشتی پاشان




جەستەی خستە سەر جەستەی ژنەکەی و سەری لێکردەوە، پاشان هەواڵی دایە کەس و کارەکەی و کاتێ هاتن و دوانەیان بینی بێ سێ و دوو سەریان شۆڕ کرد و ڕۆیشتن، لێرەدا دڵی ئاوی خواردەوە..... ڕزگاری بوو.... لە مردنێکی حەتمی ڕزگاری بوو و دوعای بۆ هاوڕێ خراپەکەی دەکرد کە ئەم بیرۆکە چاکەی پێدا. کات تێپەڕ بوو هاوڕێکەی چاوەڕێی هەواڵێك بوو، نەشیدەوێرا پەیوەندی بکات، هات بۆ ماڵی ناسیارەکەی بزانێ چی کردووە، لە دەرگای دا، هاوڕێکەی بەو پەڕی دڵخۆشیەوە دەرگای کردەوەو باوەشی پێدا کرد و ماچی دەکرد و سوپاسی دەکرد و فەرمووی لێدەکرد، هاوڕێکەی ووتی: پیلانەکەت سەری گرت؟ ووتی بەڵێ، چۆن سەرکەوتنێك کەس هەستی بە درۆکانم نەکرد، هەمووی لە زیرەکی و پیلان و بیرکردنەوەی تۆوە بوو.

کابرا کەوتە گێڕانەوەی ء ووتی: بەڵێ، کوڕێکی زۆر جوانم گرت وە با نیشانت بدەم کاتێك پێکەوە تەماشایان کرد.. پیلان دانەر هاواری کرد و لە هۆش خۆی چوو... هاوار کردنەکە ئەوەندە زۆر بوو دیوارەکانی لەرزاند.....چونکە کوژراوەکە کوڕەکەی خۆی بوو.. سزا بە جۆری کردەوەکەی بۆی هاتە پێشەوە[1].

پلانی دانا بۆ ناسیارەکەی لە بری ئەوەی ئامۆژگاری بکات و خۆی تەسلیمی دادگا بکات و مەسەلەکە بە ڕوونی بخاتە بەردەمی بەرپرسان، هەستا بە تاوانێکی دی یارمەتی دا زۆر خراپتر بەبوختان و کوشتنێکی دی، لەم نێوەندەدا کوڕەکەی خۆی.. جگەر سۆزەکەی.. ئومێدی ژیانی بوو بە قوربانی..بە خراپترین شێوە کردەوەکانی خۆی دروێنە کرد. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾[2]

لە ئیبن عومەر- ڕەزای خوادا لە هەردووکیان- ووتی: کوڕێك لە یەمەن بە خیانەت و فێڵ کوژرا بوو، نەیاندەزانی بکوژ کێ یە، عومەر فەرمووی: ئەگەر هەموو خەڵکی سەنعاء بەشداریان لە کوشتنیدا کردبێت دەیان کوژمەوە. [3]

---

(١) لە (جريدة الرأي العام) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة النساء: اية ٩٣.

(٣) رواه أبو داود.



## ڕژدی و بەرچاو تەنگی

لە (هشامی کوری حسان)ەوە. لە (واصل)ی کۆیلەی (ابی عیینە)وە لە موسی ی کوری عبیدەوە، لە (صفیەی کچی شیبە)وە ووتی: لە لای عائیشە دانیشتبووم- ڕەزای خوای لێ بێ-، ژنێك هات و دەستێکی بە پارچە قوماشێك داپۆشی بوو، ئەو ژنانەی لەوێ بوون زۆر پەرۆش بوون بزانن دەستی چیەتی؟ پاشان خۆی چووە بەردەمی عائیشە- ڕەزای خوای لێ بێ- ووتی من تەنها لەبەر دەستم هاتووم بۆ لات، باوکم پیاوێکی زۆر سەخی و لێبوردە و چاك بوو، ئێستا دایك و باوکم مردوون و، ماوەیەك لەمەوبەر باوکمم لە خەونمدا بینی لەسەر حەوزێکی ئاو بوو لەگەڵ کۆمەڵێك پیاودا هەر کەس دەچووە لایان ئاویان دەدایە، منیش ووتم: باوکە کوا دایکم؟

ووتی: بڕوانە، تەماشام کرد، پارچە جلێکی شڕو ووڕی پێوە بوو.

پاشان باوکم ووتی: ئەو قەت خێری نەکردووە، تەنها ئەو جلە شڕۆڵە نەبێت، لەگەڵ هەندێ پیوی مانگادا کە دوایی سەربڕینی بەخشی ی بووی، دەیانتاواندەوە بۆی و دەیانداوە بە ناوچاوانیدا، هەر هاواری دەکرد و دەیووت:ئای چەند تینوومە، ژنەکە ووتی(لەخەوەکەمدا):یەکێك لە جامی ئاوەکانم هەڵگرت و پێیم دا، دەنگێك لەسەرمەوە ووتی: ئەو دەستە ووشك بێت کە ئاوی پێ دا، دەستم ئاوای لێ هات کە دەبینی [1].

خێرکردن بەرەکەت و فەڕ بەسەر خاوەنەکەیدا لە دنیاو دوا ڕۆژدا دەڕژێ، ئەم ژنە چاو برسی و ڕەزیلە پارەی خەرج نەدەکرد و خێری نەدەکرد، سزاکەی وابوو ڕووت و تینوو بێت لە ڕۆژی قیامەت دا پەنا بە خودا.

با پێش مردن لە یادمان بێت ڕۆژێکی زۆر قورس چاوەڕوانمانە و دەبێ خۆمانی بۆ ئامادە بکەین و تێشووی بۆ هەڵبگرین و تاکە خەممان دوا ڕۆژ بێت بەڵکو خودا گوناهەکانمان ببورێت و سەرفرازمان بکات.

---

(١) نهاية الضالمين.



خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ
مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾ (١)

پێغەمبەری خوداش دەفەرموێت:

(خصلتان لا تجتمعان فى مؤمن البخل وسوء الخلق) (٢)

واتە: (دوو سیفەت لە ئیمانداردا کۆنابێتەوە: ڕژدی (چاوتەنگی) و بەد ڕەوشتی).

---

(١) سورة الليل: اية ( ٨- ١١).

(٢) رواه أحمد.





## سزای ستــەم

ماسیگرێکی سوپاس گوزار بوو، ماسی ڕاو دەکرد و دەیفرۆشت و نانی منداڵەکانی پێ دەکڕی و دەگەڕایەوە، جەستەی لاواز و بێ هێز بوو، بەڵام لە ڕاوکردنی ماسی دا شارەزا بوو، ڕۆژێکیان ماسیەکی زۆر گەورەی بۆ یەکەم جار ڕاو کرد، زۆر دڵی خۆش بوو، بەپەلە بەرەو بازار چوو بیفرۆشێ، بەڵام لە ڕێگەدا پیاوێکی باڵا بەرزی زل و بەهێزی پێ گەیشت هەر چاوی بەو ماسیە گەورەیە کەوت خێرا ویستی لە ماسیگری زەوت بکات ماسیگر ڕای کرد و هاواری کرد بەڵام دارێکی گەورەی دا بەسەریدا و ماسیەکەی بە بێ پارە لێ فڕاند. ماسیگر کەسی نەبوو خودای شك دەبرد هانای بۆ ببات، دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و ووتی: خودا تۆ خۆت منت ئاوا بە لاوازی دروست کردووەو ئەوت بە بەهێزی دروست کردووە، خودایە مافی منی لێوەرگرەوە، خۆت ئاگاداری ستەمی لێکردم.

ستەمکار ماسیەکەی بردەوە بۆ ماڵەوە و نەڕاندی ژنەکە خێرا ئەم ماسیەم بۆ ببرژێنە، کاتێك برژاندی و خستیە بەردەمی دەستی برد بیخوات لەکاتی خواردندا پەنجەی خۆی گازیء خەریك بوو شێت بێت و نانەکەی لابرد و لە ئازاری دەستی نەیدەزانی چی بکات.

پاشان چووە لای پزیشك، ئامۆژگاری کرد بۆ ئەوەی نەگاتە هەموو دەستی بیبڕێتەوە، بەم شێوەیە ئازار بەردەوام بوو هەتا گەیشتە دەستی و پاشان قۆڵی و هەر بەردەوام بوو، بەم شێوە پزیشك لە مەچەك دا بڕیەوە تا دەهات ئازارەکە بڵاوەی دەکرد، ڕای کرد لە نەخۆشخانە و هەموو خەمی دنیا بەسەریەوە بوو، هانای بۆ خودا برد کەوا ڕزگاری بکات، ڕۆیشت لە ژێر دارێکدا نووست لە خەویدا، کەسێك پێ ی ووت: داماو تاکەی ئەندامەکانت دەبڕیتەوە بچۆ ئەو ماسیگرەی ستەمت لێ کرد ڕازی بکە.

بە ئاگا هات و بە یادی هاتەوە کە چی لە ماسیگری هەژار کرد، ڕۆیشت و بە دوای ماسیگردا گەڕا، دۆزیەوەو کەوت بەسەر پێ یەکانیدا و داوای لێبووردنی



لێدەکرد لەو کارەی کردبووی، هەندێك پارەی لە بری ماسیەکە پێ دا و تۆبەی کرد، ماسیگر ڕازی بوو و لێ ی خۆش بوو، ئیتر ئازارکەی نەماو ئەوە یەکەم شەوی بوو بە هێمنی بتوانێت بخەوێت[1].

زۆر جار سزای ستەم زۆر کەس ڕوونە ئاشکرایی دەیبینێ و خودا زۆر هەڵیناگرێت، یان لەوانەیە دوایی چەند ساڵێك بێت، بەڵام هەموو ستەمکارێك کۆتایی پێ دێت و دەبێتە تاریکی بۆی لە ڕۆژی دوایی داو هەندێکیش جگە لە دوا ڕۆژ لە دنیاش دا دەبینرێ. خودا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾[2]

پێغەمبەری خوداش (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(دعوة المظلوم مستجابة وان كان فاجرا، ففجوزه على نفسه)[3]

واتە: (نزای ستەم لێکراو گیرا دەبێت ئەگەر چی داوێن پیسیش بێت، چونکە ئەو کارەی پەیوەندی بەخۆیەوە هەیەو نابێ ستەمی لێبکرێت).

(١) نهاية الضالمين.

(٢) سورة الشورى: اية ٤٢.

(٣) رواه الامام أحمد.

# ڕۆژگار دەسوڕێتەوە

پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، لە هەموو لایەکەوە خودا پێ ی بەخشیبوو، ژنێکی زۆر چاك و لە خوا ترس بوو بە هاوبەشی ژیانی، ژنەکەی زۆر حەزی بە خێرکردن دەکرد و کاری چاکەی دەکرد، بەڵام پیاوەکە لەگەڵ ئەو هەموو دەوڵەمەندی و پارە زۆریەدا چاو برسی و ڕژد و خۆ پەرست بوو، هەر چەندە ژنەی هەژار هەوڵی لەگەڵدا دەدا بیگۆڕێت خراپتر دەبوو وەك ئاسن پتەو بوو لەسەر کارە نابەجێ و بەدەکانی.

ڕۆژێکیان لەسەر سفرەی نان خواردن بوون، ژنەکەی لە تەنیشتی دانیشتبوو، خێرا خێرا شتی دەخستە بەردەمی و ئەویش تەواوی دەکرد، چەند دەفرێکی یەك لە دوای یەکی خوارد، لەو کاتەدا لە دەرگا دراو سواڵکەرێکی هەژار و برسی بوو بۆ یەك پاروو دەگەڕا سکی پێ تێر بکات، هەستاو دەرگای کردەوە، کە چاوی کەوت بە سواڵکەر چاوی پەڕییە پشتی سەری و لە داخاندا سوور هەڵگەڕا و چاوی سوور بوو و پڕ جنێوی کرد و بە ناشرینترین شێوە دەری کرد و دەرگاکەی داخست بەسەریدا و نەفرەتی لێ دەکرد.

ژنەکەی ووتی: ئەوە چی یە، چی بووە؟!

ووتی سواڵکەرێکی هیچ و پووچ بوو، خواردنەکەی لێ تێك دام، چەند ڕقم لەم هەژارانەیە.

ژنەکە ووتی: دەی با پاروویەکت پێ بدایە.

ووتی: پارووی بدەمێ؟ من ماندوو بووم بە پەیدا کردن و کۆکردنەوەی بە ئارەقەی ناو چەوانم دابەشی بکەمە سەر ئەوەو هاوشێوەکانی!!

ژنەکەی ووتی: بەڵام سوپاس بۆ خودا خێری زۆری بەسەردا ڕژاندووی.

ووتی: چی ی ی؟ وەڵامیشم دەدەیتەوەو دەم درێژی دەکەی، زۆر بڵی ی دەتگەیەنم بە کەس و کارت.

ژنەکە ووتی: دوایی ئەم هەموو ژیانەی پێکەوە بەسەرمان برد بەم شێوازە قسە لەگەڵ من دەکەی؟!



کابرا بە لەخۆبایی بوونەوە ووتی: هێشتا هەر دەڵێ ی، برۆ تۆ تەڵاقت کەوتبێ.
ڕۆژگار هات و ڕۆیشت و ساڵان تێپەڕین، خودا ویستی وابوو ژنەکە شووی کردەوە بە پیاوێکی باش و هێمن و دڵ نەرم و ڕۆژگارێکی خۆشی بردە سەر، بەڵام هاوسەرە کۆنەکەی هەژار کەوت و حاڵی بەرەو خراپ ڕۆیشت، بەم جۆرە ڕۆژگار ڕۆژی لە شوێنە.
ڕۆژێکیان ژنەکەو هاوسەری نوێی پێکەوە نانیان دەخوارد و کەسێك لە دەرگای دا.
ژنەکە ووتی: کێ یە؟
وەڵامی دایەوە: هەژارم، خەریکە لە برسانا وا دەمرم.
پیاوەکە وتی: ژنەکە ئەم مریشکە ببەو بیدە بەو هەژارە.
ژنەکە مریشکەکەی هەڵگرت و بردی بۆ سواڵکەر، بەڵام چی بینی خۆ ئەم سواڵکەرە هاوسەری پێشوویەتی و مریشکەکەی پێدا و گەڕایەوە دەگریا، پیاوەکەی ووتی: بۆچی دەگریت؟ چی بووە؟
ووتی: ئەو سواڵکەرە هاوسەرم بوو، بەم شێوەیە هەمو چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوەو باسی ئەو ڕۆژەی بۆ کرد کەوا کابرای برسی دەرکرد و هیچی نەدایە.
پیاوەکەی ووتی: بۆچی سەرت سوڕماوە، سوێند بە خوا منیش ئەو سواڵکەرە بووم کەوا مێردەکەت دەری کردم،[1] بەم شێوەیە ڕۆژگار بەیەك شێوە نامێنێتەوە و، سامان دێت و دەچێت، بە تایبەت لای ئەوانەی خودا ناناسن و سوپاسگوزار نین، کاتێك مافی خۆی پێ نادەن و زەکات و خێری لێ ناکەن و هەتیوو و هەژار و سواڵکەر و...هتد پێ تێر ناکەن دەبێت لە بیریان بێت کە لەوانەیە خودا لێیان بسەنێتەوە.

لكل شيء اذا ما تم نقصان    فلا يغر بطيب العيش انسان
هي الامور كما شاهدتها دول    من سره زمن ساءته أزمان
وهذه الدار لا تبقى على أحد    ولا يدوم على حال لها شأن

(هەموو شتێك کە پێت وایە تەواوە کەم و کورتیەکی هەیە- کاتێك خۆش گوزەران بوو مرۆڤ نابێت لە خۆی بایی بێت - وەك دەبینین ئەمانە دێن و دەچن، تا جارێك لە خۆشیدای چەندەها ڕۆژ لە سەختی دای- ئەم دنیایەی تێدا دەژی

---

(١) لە (جريدة الرأي العام) بە دەستکاریەوە.





بۆ كەس هەتا هەتایی نی یەو - لەسەر یەك بار بۆ كەسێك نامێنێتەوە)
خودا دەفەرموێت:

﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾﴾[١].

پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) دەفەرمووێت:

(ما من يوم يصبح العباد فيه الا ملكان ينزلان فيقول احدهما: اللهم اعط منفقا خلفا، ويقول الاخر: اللهم اعط ممسكا كلفا) [٢]

واتە:(هەر ڕۆژێك ڕۆژ دەبێتەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە یەكێكیان دەڵێت: خودایە ئەوەی بەخشندەیە زیاتری پێ بدە و جێگرەی بۆ بگرەوە، ئەوی تر دەڵێ: خودا ئەوەی نابەخشێ و ڕژدە تیای ببەو لێ ی وەرگرەوە).

---

(١) سورة البقرة: اية ٢٧٢.

(٢) متفق عليه.



## غیرەیەکی بکوژ

فؤاد و دەلال پێکەوە هاوسەرگیریان کرد، وەك هەر ژن و مێردێکی ئاسایی بەڵام لە زۆربەی لایەنەکانەوە یەکیان نەدەگرتەوە و جیاواز بوون، بە تێپەڕ بوونی کات زیاتر لەیەکتر دوور دەکەوتنەوە و لە ڕووی فکری و دەروونیەوە زیاتر لێك دوور بوون، فواد بیری دەکردەوە کەسێکی دی بدۆزێتەوە بۆ خۆی و لە لای حەوانەوە بدۆزێتەوە، ئافرەتێکی ناسی بە ناوی (میساء) و بیری کردەوە بیخوازێت، فوئاد حاڵی خۆی بۆ میساء باس کرد و داوای هاوسەرگیری لێکرد بەڵام بە نهێنی مارەی کرد و ماوەیەك پێکەوە ژیان و کەمێك خۆشی لە دنیا بینی بەڵام زۆری نەبرد، ئەو کاتانەی دیار نەدەما بیانووی دەهێنایەوە بۆ دەلال و دەیووت: کارمان هەیەو شەوان دەبێت ئێشکگر بین.
دەلال هەستی بە شتێك کرد، بۆیە داوای لە فوئاد کرد بە ڕاشکاوانە هۆکاری ئەم مانەوەیەی لە دەرەوە بۆ ڕوون بکاتەوە، فؤاد ووتی: کاری بەردەوام و زۆرو سەری قاڵ کردوە، بەڵام دەلال باوەڕی پێ نەکرد، فوئاد ووتی ئەگەر باوەڕ ناکەیت لە نزاری هاوڕێم بپرسە ئەویش لەگەڵ مندا نۆرە دەکات، منیش وەك ئەوم، پاشان فوئاد ماڵی بە جێ هێشت و تووڕە بوو و ئەو قسەیەی بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ کردبوو.
دەلال دوای چوونە دەرەوەی فوئاد تەلەفۆنی کرد بۆ خێزانی نزار ئەویش ڕەتی کردەوە کە هاوسەری ئەو یەك تاقە شەویش لە ماڵ دەرچوو بێت.
لێرەدا گومانەکەی دەلال بوو بە حەقیقەت و بە هاوکاری نیعمەتی خێزانی نزار بە نهێنی توانیان بزانن کەوا ژنێکی دی هێناوە و توانی ناونیشانی دوژمنەکەی و ناوەکەی وەربگرێت.
بیری کردەوە جارێکی دی ئەم بابەتە لە لای هاوسەرەکەیدا نەووروژێنێت بەڵکو میسائی هەوێی بە پلانێك لەکۆڵ بکاتەوە و بڕیاری دا جێ بە جێ ی بکات.
ڕۆژێك فوئاد تەماشای ئەملاو لای دەکرد و کلیلەکەی برد دەرگای ماڵی میساء ی خێزانی بکاتەوە و لە کاتی کردنەوەیدا حەپەسا پۆلیس بۆی کردەوە،





فوئاد بە هێواشی هەنگاوی دەنا و تەماشای چوار دەوری دەکرد، وا شوێنەکە پڕ لە پۆلیسی لێکۆڵینەوە و پزیشکی شەرعی لەگەڵیاندایە، تەواو شپرزە و شڵەژا بوو، سەری دەرنەدەکرد، تا چاوی کەوت بە میساء وەڵامی ئەفسەرە پلە دارەکەی بە دەنگێکی پچر پچر دەدایەوە، پرسیارەکەی قازی لێکۆڵینەوە بیرکردنەوەکانی فوئادو خەیاڵەکانی پچڕاند و چەرچەفەکەی لەسەر دەلال بە مردوویی هەڵدایەوە و ووتی: فۆاد ئەمە ژنی تۆیە؟ فۆاد سەری جوڵاند و قوڕگی ووشك بوو بوو یەك پیتیشی بۆ نەوترا، وەك هەورە بروسکە لەناکاو بوو.. نەك هەر مردنی دەلال بەڵام بۆ دەلال لە ماڵی (میساء )ە.

چی بوو؟ چی ڕوویدا وا بکوژ بوو بە کوژراو؟ خۆ دەلال هاتبوو تۆڵە لە میساء بکاتەوە و بیکوژێت؟ بەڵام ئێستا دەلال مردووە و میساء لە ژیاندایە ئەمە چۆن ڕوویدا؟.

لە ڕاستیدا ئەو بیرۆکەی لەلای دەلال گەڵاڵە بووبوو تۆڵە کردنەوە بوو لە (میساء )، بەڵام چووە لای نیعمەت و وای تێگەیاند دەچێت داوای لێ دەکات واز لە مێردەکەی بهێنێت چونکە ئەم لە پێشترە و بەڵکو رازی ببێت، ڕاستیەکەی لە نیعمەتیش شاردەوە، پێکەوە ڕۆیشتن دەلال نەیدەزانی میساء زۆرباش ئەم دەناسێ، پێشوازیەکی گەرمی لێکردن و لە هۆڵەکەدا دانیشاندن و مۆڵەتی وەرگرت قاوە بێنێت، قاوەی بۆ هێنان و دوو فنجانی بۆ دانان و هێشتا فنجانەکەی خۆی لەسەر سینیەکە بوو، دەلال ووتی کەوا ئاوی سارد ناخواتەوە و گەرووی ئازاری دەدات پەرداخێك ئاوی بۆ بێنێت، میساء فنجانی خۆی بە سینیەکەوە لەسەر مێزەکە دانا گەڕایەوە بۆ چێشتخانە ئاو بێنێت، دەلال بە خێرایی هەستا و شتێکی کردە فنجانەکەی میساء وە، میساء گەڕایەوە و ئاوی هێنا، بەڵام ووتی گوایە ژووری میوان ڕووناکترە و با بچین بۆ ئەوێ و دەستی کرد بە کۆکردنەوەی فنجانەکان، دەلال هەر چاوی لەسەر ئەو فنجانە ژەهراویە بوو، بەڵام میساء زۆرزانتر بوو بە وەستایانە جوڵاندی و دەلال هەستی پێنەکرد، کە دانیشتنەوە فنجانە ژەهراویەکەی بۆ دەلال دانا و ئەو ژەهرەی بۆ میساء ی تێکردبوو خۆی خواردیەوە، بەم شێوەیە بکوژ بوو بە کوژراو و ئەو چاڵەی هەڵیکەندبوو بۆ خەڵك خۆی کەوتە ناوی، چونکە هەر لەسەرەتاوە میساء دەیزانی دەلال بە نیازێکی نادیار هاتووە و شتێکی بە دەستەوەیە، کاتێك



داوای ئاوەکەی کرد زیاتر بێ گومان بوو کە ئەم سەرقاڵ دەکات، هەر بۆیە کە چووە دەرەوە لە درزی دەرگاکەوە چاودێری کرد بزانێ چی دەکات، بەڵام لێرەدا تاوانی کوشتنی دەلال خرایە ملی میساء [1].

راست ووتراوە: ئەوەی چاڵ بۆ براکەی هەڵبکەنێت خۆی تێ دەکەوێت، دڵی دەلال پڕ بوو لە ئاگری غیرە و شەیتانیش زیاتر خۆشی کرد و بڵێسەی پێدا هەتا ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی لێ کەوتەوە، ئەگەر دەلال ئارامی بگرتایە و ڕازی بوایە بە بەشی خۆی یان ڕێگە چارەیەکی دی بدۆزیاتەوە ئەمە ڕووی نەدەدا، بەڵام ئاگری غیرە و لاوازی ئیمان دڵ کوێر دەکەن و مرۆڤ کارەساتی وای لەدەست دەردەچێت بەرەو تیاچوونی دەبات وەك بینیمان خودای باڵادەست دەفەرموێت:

﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ﴾[2].

---

(١) لە (جريدة الانباء) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة فاطر: أية ٤٣.





## نەفامی

فائزە شووی کرد و سەرکەوتوو نەبوو بە تەڵاق کۆتایی هات، هۆکارەکەی دەگەڕاندەوە بۆ بێ بەختی و ئیرەیی و چاوی حەسوود، بۆ ئەوەی خۆی لە چاوی پیس بپارێزیت پێویستە شتێك بکات بۆ ئەوەی پارێزراو بێت، وەك هەرکەسێکی نەفام چووە لای یەکێك لە دەجالەکان تا ڕزگاری بکات و گیروگرفتەکانی بۆ چارەسەر بکات، کاتێك باسی کێشەی خۆی کرد پێوەی دیار بوو چەند نەفام و ساویلکەیە، هەر بۆیە خێرا دەستی بۆ گرتەوە و دڵنیای کردەوە کە دەبێت بە خاوەنی گەنجینەیەك لە داهاتوودا، بەڵام چۆن دەگات بەو گەنجینەیە ئەوا پێویستی بە خەرج کردنی پارە هەیە لەلایەن دەجالەکەوە تا شوێنەکەی بۆ بدۆزێتەوە و ئیتر (فائزە) دەوڵەمەند دەبێت و شوو دەکات و خۆشبەخت دەبێت، بەم شێوەیە فائزە بە گەمژەیی خۆی باوەڕی کرد و خەونی بەو گەنجینە خەیاڵاویەوە دەبینی و.. پارەو.. دەوڵەمەندی و.. هاوسەرگیری.. دەجالەکە بەردەوام پارەی لە (فائزە) دەکێشایەوە و...... فائیزەش بۆ هاتنەدی خەونەکەی بەردەوام بوو، بۆ ئەوەی هەست بە فێڵەکانی نەکات کابرا هەرجارەی بەناوی شتێکەوە داوای لێ دەکرد، جارێك کەڵەشێری ڕەشی بێ نیشان و جارێك مەڕی دووساڵان و چەندەهای تر.

درێژەی کێشا و داواکاری نەبڕایەوە و فائیزە دەیپرسی کوا گەنجینە؟

دەیووت: ڕۆحە شەڕانگێزەکان ڕێگرن و ناهێڵن بگەمە گەنجینەکەت، فائیزە ووتی: چارە چیە؟

وویستی شتێکی مەحاڵی پێ بڵێ و زیاتر بیخەڵەتێنێ و پێی ووت: دەبێت شوو بکەیت ئیتر گەنجینەکە لەبەر دەستتدایە.

فائزە ووتی: ئەی زاوا لەکوێ پەیدا بکەین؟

ووتی: نازانم بەڵام دەبێت شوو بکەیت.

فائزە گرفتی زاوا پەیداکردنی چارەکرد و پیاوێکی دۆزیەوە قاچێکی نەبوو چاوێکی کوێر کەس پێی رازی نەبووبوو، بەڵام ئەم گرنگی بەجوانی و



رووخساری نەدەداو کەس و کاری تێگەیاندبوو، گرنگ لەلای گەیشتن بوو بە گەنجینە!!

فائزە بەپەلە چوو بۆ سەردانی دەجال و هەواڵی شووکردنەکەی پێبدات، بەڵام ئەم بەدکارە دەیزانی هاوسەرەکەی کەم ئەندامە و لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بێ ئاگایشان داو چاوڕی کرد تا هەواڵی پێدا، بە درۆ و فێڵەوە ووتی: زۆرباشە پێویستە چاوم بە براکانی ژێر زەویم بکەوێت تا ڕاو و بۆچونیان بزانم سبەینێ وەرەوە وەڵامت دەدەمەوە، سبەینێ هاتەوە لە وەڵامدا ووتی: گەورەکانم بەم هاوسەرگیریە رازی نین.

فائزە ووتی: بۆچی ڕازی نین؟ خۆ مەرجیان نەبوو؟

ووتی: چونکە کوڕە و قاچی نیە و دەبێت زاواکە ساغ بێت و هیچ عەیبێکی نەبێت ئەگینا گەنجینەکەت لەدەست دەڕوات.. گەنجینە فائیزە.

ئیتر فائیزە خەریك بوو نا ئومێد دەبوو، سووریشە بگات بە گەنجینەکەی، فێڵبازەکە هەستی پێ دەکرد بە زۆرزانانە پێی ووت: ئەگەر ویستت من ئەو کارەت بۆ دەکەم بەڵام بۆ یەك جار!!

فائیزەی بێ مێشك و گەمژە ڕازی بوو چونکە گرنگ لەلای گەنجینە بوو، یەکجار بەس بوو (فائیزە) سکی پڕ بێت، کاتێك ماوەیەکی بەسەردا چوو، فائیزە هەواڵی سك پڕیەکەی گەیاندە فێڵباز، بەدکار زانی خەریکە فێڵەکانی بەسەریدا دەشکێتەوە و تێ دەکەوێت و ئەم ئافرەتەی لەکۆڵ نابێتەوە بیرۆکەی خراپتری بۆ هات ئەم گێلەی پێ بخەڵەتێنێ و ووتی: یان دەبێ ئەم منداڵە بپارێزی یان گەنجینەکەت.

فائیزە هەموو شتێکی کردبووە قوربانی گەنجینە.. کۆرپە چیە ؟ بۆیە پرسی: کێ دەتوانێ لەبارم بەرێت؟ بەدکار تا لەدەستی دەرنەچێت ووتی: من.. هەوڵ دەدەم یارمەتیت بدەم. فائیزە ووتی: چۆن؟ تۆ؟

ووتی: بەهۆی برادەرانی ژێر زەوی؟

ئەم تاوانبارە دەستی کرد بەچەند کردارێکی سەرەتایی تاوەکو کۆرپەکە لەبارببەن و، ئەو گێل و داماوە خۆش باوەڕ لەژێر ئازاردا بەحاڵ نوزەی دەهات، بەڵام زۆری نەبرد تووشی خوێنڕێژی بوو هەناسەکانی کۆتایی دا، کاتێك ئەم بەدکارە جەستەی بینی سارد بۆتەوە و زانی چاری نی یە ئەم کارە دەیگەیێنێتە پەتی سێدارە و

هەر ئەم تاوانەی هەڵدەماڵرێت، هەوڵی دا لەسەریانەوە رابکات و کەس نەیبینێت، بە پەیژەیەکی داردا سەرکەوت و زۆر شپرزە بوو لایەکی کراسەکەی لە بزمارێك گیربوو نەگەیشتە سەرەوە کەوتە خوارەوە و سەر و دەم و چاوی پڕ بوو لە خوێن و بە چەند ساتێکی کەم گیانی سپارد و ئەو کارەی کردی دروێنەی کردەوە[1].

تەماع و خۆشەویستی دنیا و نەفامی و شارەزانەبوون لە ئایین کۆمەڵە هۆکارێکن خاوەنەکەی بۆ تیاچوون و دۆزەخ دەبەن، خوای گەورە و پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ئاگاداریان کردوینەتەوە کەوا شوێن هەنگاوەکانی شەیتان نەکەون، چونکە بەرەو نەفامی و گومڕایمان دەبەن و سەرلێ شێواویان دەکەن، وەك دەبینین فێڵباز و گێل لەم چیرۆکەدا وەك یەکیان لێهات و ئەم لە تەماع و لاوازی ئیمانەوە بە خراپترین شێوە بە مردن گەیشت و، لەم لاوە ئەوەی خۆی بە لێزان و زۆرزان دەزانی بەهەمان شێوە سزای خۆی وەرگرت و لەلایەکی ترەوە کەس و کاری ئەم کچە نەفامە تەماع کوێری کردبوون و لەبری ئاگاداری کچەکەیان بن دڵی بدەنەوە، لەم کارە قێزەونەدا هاوکاریان کردو ڕێگە خۆشکەر بوون لە ڕێگەی خراپە دا بڕوات و سزایان ئەوە بوو کچەکەیان لە دەست چوو و بەرگی ڕیسوایی و سەر شۆڕیان بۆ هەتاهەتایە بەبەرخۆیان بڕی و سزایەك بەشێوەی ئەو کارەی کردیان.

الجهل للافكار قبر مظلم يعمي العيون و يخنق الاعمال

(بیرۆکە نەفامەکان گۆڕێکی تاریکە چاوەکان کوێر دەکات و کردەوەکان دەخنکێنێ)

خودای باڵا دەست دەفەرموێت:

﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [2].

---

(١) لە (جريدة الانباء) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة الجاثية: أية ٢٣.

# بەشی سێ یەم: لە نێو باوکان و منداڵەکانیاندا

یەکەم: منداڵ بەخششە.

دووەم: کچ و کوڕ.

سێیەم: خودایە رەخنەت لێ ناگرم.

چوارەم: کوڕەکەم کوشت.

پێنجەم: خۆشەویستی کوژەر.

شەشەم: حەسرەت.

حەوتەم: یاخی بوون.

هەشتەم: سزایەکی وەك خۆی.





## منداڵ بەخشە

لەگەڵ کچێکی گەنجدا هاوسەرگیری کرد، تەمەنیان لەیەکەوە نزیك بوو، زۆر خۆشبەخت و تەبا بوون، پاش ماوەیەك ژنەکەی سکی پڕ بوو دوانەیەکی بوو، پاشان بۆ جاری دووەم دووگیان بوو دوو منداڵی بوو، لە ماوەیەکی کەمدا بوون بە خاوەنی چوار منداڵ و ئەوەندەی نەبرد جاری سێ یەم سکی پڕ بوو، پیاوەکە تەواو توڕە بوو ترسا جاری سێ یەم دوانەیەکی تریان ببێت، سوێندی خوارد ئەگەر ئەمجارە دوانەیان ببێ تەڵاقی کەوتبێ، ژنەکەی دەگریا و کەس و کاری گاڵتەیان پێ دەکرد لەسەر ئەم کارە و مانگی نۆ تەواو بوو.. منداڵیان بوو...

بەڵام سێ بوون، مانایی سوێندی تەڵاقەکەی نەکەوت، چونکە لەسەر دووان خواردبووی نەك سێ، پیاوەکە هەستی کرد هەڵەی کردووە و تۆبەی کرد و داوای لێخۆشبوونی لەخوا کرد،دواتر ئەوەی ئەم پیاوە لێ دەترسا کەوا داهاتیان کەمە و سنوردارە و ئەم منداڵانەیان پێ بەخێو ناکرێت و ئاوا لە ماوەیەکی کەمدا ئەم هەموو منداڵە، بەڵام خودا رۆزیەکی زۆری رژاند بەسەریاندا و سەیرتر لە هەمووی ئیتر دواتر ژنەکە منداڵی نەبوو، لەخۆیەوە وەستایەوە[1].

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾ [2].

---

(١) مقارنة الاديان.

(٢) سورة الانعام: أية ١٥١.

# کوڕ و کچ

گەنجێك زۆر هەبوون و ساماندار بوو، ئەو کچەی خەونی پێوە دەبینی خواستی، دوای ماوەیەك خودا کیژۆڵەیەکی نازدار و جوانی پێ بەخشین، سەرچاوەی شادی و خۆشی ماڵەکەیان بوو، پاشان جارێکی دی دووگیان بوو کچێکی تریان بوو، باوکە پێشوازیەکەی باش نەبوو، دەم و چاوی بەیەکدا داو چاوەڕێ ی کوڕ بوو، بەڵام ئەمیش هەر کچ، جاری سێ یەم هەر کچ بوو، ئەمجارەیان ئەو ڕقەی کابرا لەجاری دووەم شاردبویەوە ئاشکرای کرد، بەقەزا و قەدەری خوا ڕازی نەبوو، ئیتر بایەخی بەم کچە بچووکانە نەدەدا و بەردەوام باسی کوڕی دەکرد، چیرۆکی کەوتبووە سەر زاری هەموو خەڵك، بۆ جاری چوارەم. هەمووان چاوەڕوان بوون. دایکەکە دڵی بە خێرایی لێی دەدا و. باوکە ئارامی ئیتر نەمابوو. بەڵام ئەمجارە کوڕ بوو، خۆشی گەڕایەوە و دەست کرا بە ئاهەنگ گێڕان و، کوڕە پارووی کەوتە رۆنەوە لە هەموو لایەکەوە خزمەت دەکرا پاشان پزیشك دوای پشکنین جەختی کردەوە کەوا منداڵێکی ناتەواوە و قاچەکانی ئێسکە نەرمەیانە. چەند ساڵێك تێپەڕین و کوڕە بوو بەمایەی نەگبەتی و ئازار بۆ باوکی، هەمیشە لە ڕێگەی نەخۆشخانە بوو بەبێ ئەوەی تەندروستی ڕاست بێتەوە،بەڵام کچەکان رۆژ بەرۆژ جوانتر و چالاکتر دەبوون، سەرچاوەی خۆشی و خێرو بەرەکەت بوون بۆ باوکیان[1].

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾[2].

---

(١) مقارنة الاديان.

(٢) سورة الشورى: أية ٤٩ و ٥٠.



پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(ما من مسلم تدرك عنده ابنتان فيحسن صحبتهما إلا أدخلتاه الجنة)[1].

واتە:(هەر موسڵمانێك خودا دوو کچی پێ بدات و چاك بێت بۆیان و بەجوانی بەخێویان بکات بە هۆیانەوە دەچێتە بەهەشتەوە).

---

(١) رواه البخاري.



## خودایە رەخنەت لێ ناگرم

گەنجێك بوو لەسەرەتای تەمەنی دا بوو، ئەو کچەی خەونی پێوە دەبینی توانی هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، هەردووکیان مامۆستای ئامادەیی بوون، منداڵێکیان بوو زۆر دڵخۆشی کردن، بەڵام زۆری نەبرد بوو بە کێشە بۆیان، نەیاندەزانی لەکاتی دەوامدا چی لێ بکەن، لەبەر ئەوەی دوو هەوا دەکەوت و لە نێوان دایك و باوکیدا بەجێ دەماو دەبرایە لای ناسیار و کەس و کار، زوو زوو نەخۆش دەکەوت، ئەمەش وای کرد باوك یان دایکە لە دەوام دوا بکەون. بیریان کردەوە دایکەکە ئیتر لە دەوام راوەستێت و بیکاتە مۆڵەت بەڵام باری ئابووریان یارمەتیدەر نەبوو بۆیە نەکرا.

نیشانەکانی دووگیانی لە ژنەکە دەرکەوت، بە تەواوی شێت بوو، ئەوان یەك منداڵیان بۆ بەخێو ناکرێت چ بگات بە دووان، خۆیان گەیاندە لای پزیشك تا لەباری ببات بۆیان، بەڵام رەتی کردەوە و ئامۆژگاری کردن واز لەوکارە بهێنن، بەڵام پاش ئەوەی زۆر داوایان کرد ووتی دەتوانێ هەڵبەز و دابەز بکات و خۆی ماندوو بکات تا بڕوات، ڕۆیشتن و دەستیان کرد بە راکردن و بە قادرمە سەرکەوتن و بازدان تاوەکو کۆرپەلە لەبار بەرن، منداڵەکەیان لەلای خەڵك دانا بوو تا دەگەڕێنەوە، کاتێك گەڕانەوە کارەساتێك چاوەڕوانی دەکردن، منداڵەکەیان لە ژیاندا نەمابوو بەهۆی ئەوەی لە قادرمە کەوتبووە خوارەوە و ئەوانەی بەخێویان دەکرد پێیان نەزانیبوو.

لەوتاڵ تر ڕۆیشتنی ئەمەی تریان بوو، جارێکی تر چوونەوە سەردانی هەمان پزیشك، بەڵام بۆ لەبار بردن نا، بەڵکو یارمەتیان بدات و نەڕوات، ئەمجارەش پزیشکەکە ووتی ناتوانم، تەنها خودا دەتوانێ یارمەتیتان بدات و دەستیان کرد بە نزاو پاڕانەوە و داوایان لەخودا کرد بە زەیی پیایاندا بێتەوە، خودا نزاکەی گیرا کردن کۆرپەکە نەڕۆیشت و دوایی ئەوەی ماوەیەك پێش ئێستا بەڵا بوو خۆیان لێ رزگار دەکرد، ئێستا دەپاڕانەوەو تاکە ئومێدیان بوو[1].

---

(١) مقارنة الاديان.





ئەم نمونە واقیعیانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم گەردوونە خاوەنێکی هەیە دروستکراوەکانی بەڕێوە دەبات و چاودێریان دەکات و، پێویستە ئیماندار بە قەدەری خۆی و بەشی خۆی ڕازی بێت، لەوانەیە خودا شتێکی بۆ نووسیبێتی و تۆ پێت وا بێت باش نی یە بۆت و زۆر پڕ خێر و بەرەکەت بێت، چونکی خودا زانایە و ئێوە نازانن، ئەمانە وێنەی ڕاستەقینەی ژیانن، تاوەکو مرۆڤ دەست وەرنەداتە کاری دروستکاری، بەڵکو هەمووی بەخودا بسپێرێ.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾[1].

(١) سورة الشورى: أية ٤٩ و ٥٠.



## کوڕەکەم کوشـــت

(س) لە خێزانێکی پەرتەوازەدا چاوی بە دنیا هەڵهێنا، باوکێك تاکە خەمی کۆکردنەوەی سامان و خۆ دەوڵەمەند کردن بوو، گرنگ نەبوو بەلایەوە، بە چ رێگایەك، دایکە تەنها لە بیری چوونە دەرەوە و گەشت و سەیران دا بوو، لەبەرئەوە بەیەك گەیشتنی ئەم دوانە شتێکی ئەستەم بوو کۆتایی بە تەڵاق هات. دایکی دڵڕەقیەکەی بە رادەیەك بوو ماڵئاوایشی لە کۆرپە ساواکەیش نەکرد، نەسۆز و نەخۆشەویستی و وەك ئەوەی لە زیندان ڕزگار کرابێت ڕای کرد و ئاوڕی نەدایەوە بۆ لای ئازیزترین شتی سەر زەوی کە رۆڵەکەی بوو...؟!

(س) لەگەڵ باوکیدا لە نێو پارە و سامان دا گەورە بوو، نازدار بەڵام بەبێ چاودێری و پەروەردەیەکی جوان و سۆز. چونکە تاقە پەروەردەی باوکی ئەوە بوو چیت دەوێ و چەندت دەوێ بوو؟ لەلای تەنها بگرە و. بگرە. بەبێ لێپێچینەوە. کوڕە لەم کەش و هەوا و پەروەردە هەڵەیەدا پێگەیشت.

تاوەکو بە باوکی بڵێن پیاوەکە خەمی کوڕەکەی دەخوات، ناردیە قوتابخانەیەکی تایبەتی بیانی و، هەموو قۆناغەکانی خوێندنی لەوێ بوو، بەڵام چی لەم قوتابخانەیەوە فێر بوو؟ مەی خواردنەوە و ماددە هۆشبەرەکان و پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ کچانی بێ ڕەوشت دا و کەوتە نێو لیتەی خراپە و تا گوێ ی تێ نا، لەم ناوەندەدا باوکە لە کوێ بوو؟ سەرقاڵی بازرگانی و کارەکانی و شتی تر بوو، وای دەزانی ئەگەر کوڕەکەی پارە و ڤێلا و خزمەتکاری لەبەر دەستیدا بێت و لەقوتابخانەی بیانی بێت کاری تەواوە و کاری لێپرسراویەتی باوکایەتی تەواو ئەنجام داوە. بەڵام بێ ئاگا لەوەی کوا خۆشەویستی و سۆزی باوکانەی؟ کوا ئامۆژگاری و ڕێنمونی کردنی؟ کوڕەکە زۆر بێ بەش بوو لەمانە، چونکە سۆزی دایك و باوکی لەدەست دا بوو؟ دەگەڕا و وێڵی ئامێزێکی بە سۆز بوو، هێشتا هەر منداڵ بوو مامۆستایەکی بیانی باوەشی بۆ کردەوە و جەستەی خۆی پێ بەخشی، تەمەنی پانزە ساڵان بوو هەر بۆ نازی دایکی دەگەڕا بەڵام ئەم مامۆستا بێ رەوشتە هەلەکەی قۆستەوە، لەلایەکەوە





ئارەزووە جەستەییەکانی پێ تێر دەکرد و لەلایەکی ترەوە سەرچاوەیەکی زۆر باش بوو بۆ دیاری و پارە.

لەگەڵیدا دەژیا و کەس پرسیاری لێ نەدەکردو کاتێك پشووی هاوین هات ژنە مامۆستا بۆ وولاتی خۆی دەگەڕایەوە و گرێبەستەکەی تەواو دەبوو لەو قوتابخانەی وانەی تێدا دەوتەوە، کاتێك (س) زانی دەڕوات، شێت و هار بوو، ئەو بە دوایی دڵێکی نەرم و نیانەوە بوو سۆز و خۆشەویستی پێبدات و لە ئامێزی بگرێت و خەمەکانی لەلا باس بکات، تەنها لای ئەم فێڵبازە دەستی دەکەوت کە چاوی بڕیبووە سامانەکەی و فریوی دابوو.

مامۆستا رۆیشت و (س) لە جیهانێکی بەتاڵ و بێ سۆز و خۆشەویستیدا دەژیا و خەریك بوو شێت دەبوو هەستی بە تەنیایی دەکرد، بڕیاری دا ئەم پشووە بچێت بۆ دەرەوەی وولات بۆ لای مامۆستاکەی و رێگر نەبوو، باوکی چی دەویست پێ ی داو رۆیشت.

خۆی گەیاندە ئەو گوندەی لێوەی هاتبوو، خێزانەکەی بە لایانەوە ئاسایی بوو ئەو میوانەیان بێت، چونکە بەم پەیوەندیە ناشەرعی و ناشیرنانە راهاتبون و لەوێ مایەوە لە کاتێکدا تەمەنی گەیشتبووە حەڤدە ساڵ و مامۆستاکەی بیست و هەشت ساڵان بوو.

دوایی پشوو (س) گەڕایەوە بەڵام جەستەی هاتەوە هەموو هەستەکانی لەوێ جێهێشت.

ئامادەیی تەواو کرد و باوکی داوای لێ کرد زانکۆیەك هەڵبژێرێت لێ ی بخوێنێت، لە هەمان وولاتی مامۆستاکەی زانکۆی دیاری کرد، باوکی رازی بوو، بەم شێوەیە ئەم کوڕە لە تیاچوون بەردەوام بوو بەبێ لەمپەر و رێگر، تێك شکاو وون و وێڵ، بەڵام کێ هۆکار بوو[1].

زۆرێك لە دایك و باوکەکان لەم سەردەمە پێیان وایە تەنها دابین کردنی پێداویستی منداڵەکانیان لە ئەستۆ دایە و، گرنگترین شت لەیاد دەکەن ئەویش پەروەردەیەکی جوانە چاکە لەسەر رەوشتی جوانی ئیسلام، کەبۆیان دەبێ بە قەڵا و لە ژیان دا یارمەتیدەریان دەبێت تاوەکو لارێ نەبن، دابین کردنی جل و بەرگ و خواردن و

(١) لە (جريدة الانباء) بە دەستکاریەوە.



جگە لەمانە تەواوکەرن و هەموو شتێك نین، بەڵکو گرنگ خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی دایك و باوك و ئامێزی گەرمیانە و پێکەوەیان دەبەستێتەوە.
زۆر کەس وا دەزانێ ئەگەر منداڵەکانی لە نێو قوتابخانەیەکی بیانی دا بوو ئیتر داهاتوویەکی پرشنگداری هەیە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و زۆر کەسی تێکەوتووە، لە قوتابخانەدا هەندێ ڕەوشت و داب و نەریتی ڕۆژئاوای فێر دەکرێن نامۆیە بە ئایین و دەکەونە سەر ڕێگایەکی گوماناوی و دڕکەڵان و ڕزگار بوون لێ ی ئەستەمە، مەگەر خودا یارمەتیان بدات.
کەواتە تاوەکو دنیا و دوا ڕۆژتان ڕووناك بێت سووربن منداڵەکانتان پەروەردەیەکی ساغ و سافیان هەبێت و، شتێك بچێنن تا دواتر دروێنەی بکەن. چونکە ترێ لە دڕك کۆناکرێتەوە.
خودا دەفەرموێت:

﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾[1].

لە ئیبن عەباسەوە - ڕەزای خوایان لێ بێ- ووتی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی:
( إلزموا أولادكم و أحسنوا أدبهم )
واتە: ((زۆر ئاگاداری منداڵەکانتان بن و جوان پەروەردەیان بکەن)).

---

(١) سورة الانعام: اية ١٤٠.

## خۆشەویستی گوزەر

دوایی ئەوەی تەمەنیان ڕۆیشتبوو خودا (أحمد)ی پێدان، زۆر شادمان بوون پێ ی، بەناز و تاقانەی دایك و باوكی بوو، هیچ داوایەكی ڕەت كردنەوەی نەبوو، باوكی هەبوون و پارە دار بوو، هەموو سامانەكەی كردبووە قوربانی داواكاریەكانی و لە گرانترین قوتابخانەكاندا و لە ڕیزی ئوستوكراتیەكاندا داینابوو... لەگەڵ خێزانە سیاسەتمەدارەكان.
ئەحمەد لە ناو پارەو ساماندا گەورە بوو، هیچ شتێك لە نێو قامووسی ژیانیدا نەبوو بە ناوی مەحاڵ و ئەستەم، هەموو داواكاریەكانی جێ بە جێ دەكرا، هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە باوكی ئوتومبێلێكی گرانبەهای بۆ كڕی و لە نێو شەقامەكاندا دەسوڕایەوەو، لەگەڵ هەندێ لە هاوشێوەی خۆیدا شەوانە دەچوونە یانەو ئاهەنگەكان و بە ڕۆژیش لە گەشت و سەیران بوون بەم شێوەیە ناز و بەدەمەوە دان و جێ بە جێ كردنی گشت داواكاریەكانی أحمد بردیە سەر ڕێگای تیا چوون و، هاوڕێ خراپەكانیشی زیاتر یارمەتیدەر بوون و كردیانە پیاوی مەلهاو قومارخانە، بەڵام لەم كاتەدا باوك و دایكی أحمد هەر لە خەمی كۆكردنەوەی سامان دابوون و گرنگ لایان جێ بە جێ كردنی داواكاریەكانی أحمد بوو.
أحمد ڕێگەی تاریكی گرتە بەرو تا سەری تێناو لە قوڕاودا چەقی و باوكی لەم مت بوونە بە هۆش نەهاتەوە تاوەكو أحمد گەیشتبووە خاڵی كۆتایی و هیچ ناوبانگێكی بۆ نەمابوویەوەو، هەموو كەس خراپەی دەووت و، بوو بووە نموونەی ڕەوشتی بەد و ناشرین، كە باوكی زانی كار لە كار ترازاوە پلانی دانا كوڕەكەی تەمبێ بكات و بە زۆر بیگەڕێنێتەوە لەو ڕێگەیەی پێدا دەڕوات، پارەی لێ گرتەوە و پێی وابوو ئیتر كوڕەكەی بە خۆیدا دەچێتەوە، بەڵام شمشێر پێش سەرزەنشت كردن كەوت، چونكە أحمد لە ژیانێكی خۆشگوزەراندا پێ گەیی و لەو پەڕی ناز و خۆشەویستیەكی زۆر بەم شێوەیە تەمبێ نابێ.
دوایی ئەوەی پارەی لێ گیرایەوە، بارو دۆخی زۆر خراپ بوو، بیری دەكردەوە چۆن پارەی چنگ بكەوێت تا بگەڕێتەوە بۆ نێو هاوەڵە خراپەكانی و یانە شەوانەكانی؟



لەگەڵ هاوڕێیەکی دا ڕێك کەوتن و دزی لە نزیکترین کەسی خۆی بکات ئەو باوکەی کە نقوومی پارەی کردبوو بەبێ ژمارەو، أحمد دەیزانی دایکی لە جانتایەکدا و لە ژووری نوستنەکەیدا هەندێ پارەی هەڵگرتووە، دوای ئەوەی دایك و باوکی ڕۆیشتن، چوونە ژوورەوەو یەکسەر بۆ ژووری نوستنەکە و پارەکەی دایکی برد کە لە نێو قاسەیەکی بەهێزدا بوو، پارەیەکی زۆری تێدا بوو بردیان، پاشان هەموو ئاڵتونەکانی دایکی بردو ڕایان کرد و چوونە شوێنێکی دوورو شوقەیەکیان بە کرێ گرت، پاشان چوونە یانەی قومار و نزیکەی نیوەی پارەکانیان دۆڕاند، دواتر پۆلیس توانی بیانگرێت و ئەحمەد دانی بە تاوانەکەی داناو ئەو پارەی مابوو لێیان سەندرایەوە و قازی سێ ساڵ زیندانی لەگەڵ کارکردنی بەسەردا سەپاندن[1].

ئەمە سەرئەنجامی نازی زۆر و پەروەردەی هەڵە و خۆشەویستی بێ سنوور بوو، لەگەڵ خەرج کردنی پارە بە بێ لێپێچینەوەو چاودێری، کەوا لە منداڵ دەکات دەست بڵاو بێ و ڕێز و قەدری هیچی لا نەمێنێت، خۆشەویستی بۆ منداڵان مافێکی پێویستی منداڵانە و لە فیترەت دایە، بەڵام ئەگەر لە خۆی زیاتر بوو و لە سنور لایدا دەبێت بە بکوژی منداڵ و مایەی پەشیمانی و حەسرەت بۆ دایك و باوك، پێویستە منداڵەکانمان بە پەروەردەیەکی ئیسلامی ڕاست گۆش بکەین کە لەسەر ئەدەب و خۆشەویستی ڕابوەستێت، بەڵام نازی زۆر و بە دوا دانەچوون سەرئەنجامەکانی ترسناك دەبن وەك بەسەر ئەحمەد داهات..

خودا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥ ﴾[2].

پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا مافی ئەم کوڕەم چی یە بەسەرمەوە؟ فەرمووی:(تحسن اسمه و أدبه وضعه موضعا حسنا) [3].

واتە: (ناوی جوانی لێ بنێ و بە جوانی پەروەردەی بکەیت و لە شوێنی باشدا دایبنێ ی).

---

(١) لە (جريدة الانباء) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة التغابن: اية ١٥.

(٣) رواه الطوسي.





## حەسرەت

پوول پەرست بوو، هەمیشە هەر لە بیری پارە کۆکردنەوەدا بوو، ماددە چاوی کوێر کردبوو تەنها لە کەلێنەکانیەوە دەیبینی، سامانی کردبووە تەرازوو هەموو شتەکانی پێ دەپێوا، کچە جوانەکەی گەورە بووبوو، کاتی هاتبوو بچێتە ماڵی خۆی و، خوازێنی کار لە هەموو چینەکان دەهاتنە پێشەوە، چونکە کچەکەی وەك خۆی نەبوو..ڕێك و پێك و ژیر بوو. بەڵام باوکی بە بیانووی جۆراو جۆر ڕەتی دەکردنەوە، لە نێوانیاندا تێدابوو زۆر بەڕەوشت و ئایندار بوو، بەڵام ئەم ساماندداری دەویست پارەی زۆر بدات و خاوەن پلەو ناوبانگی گەورە بێت، ڕەوشت و ئاینداری بایەخی نەبوو لای...گرنگ پارەیەو بەس، بەڵام ئەمەی ئەو دەیویست نەهات و لە دەرگای نەدا..بە لایەوە گرنگ نەبوو خۆ هێشتا کچەکەی لە سەرەتای تەمەنیدایە.

ڕۆژان و ساڵان گوزەریان کرد و کابرا هەر لەسەر خەونە ماددیەکەی بوو، شەمەندەفەری تەمەن تێپەڕی و کچەکەی بوو بە قەیرە کچ..نیتر نە ئەمیر و نە هەژار و نە گەداو و نە دەوڵەمەند نەما تا بێتە پێشەوە، هەمووان دەرگاکەیان جێهێشتبوو بەرەو لایەکی دی ڕۆیشتبوون بۆ لای ئەوانەی کچەکانیان نافرۆشن و بەرێزەوە پێشوازی لە بەڕەوشت و ئایندار دەکەن، جوانی کچەکەی ڕۆیشت و گەشی نەماو،بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار لاواز بوو تووشی شێرپەنجە بوو و پزیشکەکان بۆیان چارە نەدەکرا و برایە نەخۆشخانە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بارو دۆخی خراپتر دەبوو، گەیشتە کۆتا ساتەکانی تەمەنی و هەواڵیان دایە باوکی وا کچەکەت گیان دەدات، هاتە هۆش خۆی و بە پەلە خۆی گەیاندە نەخۆشخانە تا کچەکەی لە بەرگی نەخۆشخانەدا ببینێ نەك جلی هاوسەرگیری، کچەکەی بەم شێوەیە بینی هەردوو چاوی پڕبوون لە ئاو، دڵی زۆر سووتاو کچەکەی لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی دەکرد..باوکی لێی نزیك بویەوە و تا کۆتا قسەکانی ببیستێت، تێگەیشت دەڵێ بڵێ (امین) پیاوەکە ووتی (امین) پاشان ورتە ورتێکی تری کرد و ووتی بڵێ (امین) باوکی ووتی و سێ یەم جار بەهەمان



شێوە پاش ماوەیەك بێدەنگی، باوکی لێ ی پرسی نزاکانت چی بوو کە پێت ووتم بڵێ (امین)، فرمێسکەکانی پێ ڕانەگیرا و بە دەنگێکی لاواز و پڕ لە پەژارە و غەم ووتی: نزام لێ کردی خودا لەبەهەشت بێ بەریت بکات چۆن منت لە هاوسەرگیری بێ بەری کرد.

ئەم کیژۆڵەیە بە ئاواتەکانیەوە خرایە ژێر گڵ و، ئیتر باوکەی بە تەماع کە پارە کوێری کردبوو پەنجەی پەشیمانی دەگەست و سەر کۆنەی خۆی دەکرد و لۆمە کردن بوو بەکاری و نەدەبوایە وای بکردایە[1].

ئەم چیرۆکە تراژیدیایە و خەمناکە ئاگادار کەرەوەیەکە بۆ دایك و باوکەکانی ستەم لە کچەکانیان دەکەن و چاویان لە تەماع و پارەیە لە بەشوودانیاندا و بەبەبایەخترین شت لە بیر دەکەن کە ئاینداری و ڕەوشتە، چەندەها کچ بە وێنەی ئەم کیژۆڵەیە شەمەندەفەری هاوسەرگیری بە جێی هێشتن و هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خێزانەکەی و تەماعیان و ئەو مەرجانەی دەیکەنە لەمپەر بۆیان، لە پاشاندا سالآن تێدەپەڕێ و کەس نامێنێت بێتە پێشەوە و ژیانێکی پڕ لە نەهامەتی و تەنیایی بۆ دەمێنێتەوە و هەمیشە بەختی خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت مندالآن بزانن هەرچەندە دایك و باوك باش نەبن، لە کەم ئەدەبیە کە نزایان لێ بکرێت و مندالێك پەیڕەوی ئیسلام بکات دەبێت مافی دایك و باوکی بزانێت و خزمەتیان بکات.

پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

(اذا جاءكم من ترضون دينه و خلقه فانكحوه، الا تفعلوه تكن فتنة في الارض و فساد عريض) [2].

واتە: (ئەگەر کەسێك هاتە خوازبێنی کچەکانتان و لە دینداری و ڕەوشتی ڕازی بوون پێ ی بدەن، ئەگەر وا نەکەن ئەوا ئاژاوە و خراپەکاریەکی گەورە بەرپا دەبێت لەسەر زەوی)

---

(١) لە (كشكول الاسرة).

(٢) رواه الترمذي و أحمد.





## یـــاخی بوون

لە ژیانێکی خۆش و گوزەرانێکی باش دا بوو، لە ئامێزی ئەو دایك و باوکەی زۆر خۆشیان دەویست و، خۆیشی کوڕێکی کاسبکار و دەست ڕەنگین بوو ئاسنگەری دەکرد، ژیانی هەمووی کارو خۆشی بوو، پاشان هەستی کرد ئیتر پێویستە هاوسەرگیری بکات و کچێکی زۆر بە لاوە جوان بوو حەزی دەکرد بیخوازێت، ئەم باسەی لە لای دایکی کردەوە، دایکی ڕەتی کردەوە و ئەم باسەی بردە لای باوکی ئەویش هاوڕای دایکی بوو، کوڕە هەر جەختی دەکردەوە و دەیوت: بۆ؟ ووتیان: چونکە ئەو کچە نە بۆ تۆ و نە بۆ ئێمە گونجاو نی یە، تۆ نابێت تەنها بە ڕوخساری دەرەوە بڕیار بدەیت و قەت پێوەری خۆشبەختی نین، بەڵام وازی لە بڕیارەکەی نەهێنا و هەر سوور بو لەسەری هەر چەندە دایکی زۆر ئاگاداری کردەوە کە ئەم کارە داهاتوویەکی لێڵ و نادیاری هەیە و خێر ناداتەوە، بەڵام کوڕە کەڕ و کوێر بوو بوو نەدەیبینی و نەیدەبیست، هەموو عەقڵ و هەست بە دوای ئەو جوانیە دەرەکیەی کچەوە بوو.

گەیشت بە خەونەکانی و کچەی خواست، بەڵام لە بەرامبەردا تووڕەیی دایك و باوکی هاتە سەری و دژی ئەم هاوسەرگیریە بوون.

ژنەکەی هێنایە سەر ماڵ و،ماوەیەکی کەم تێپەڕی و هەراو ناکۆکی لە نێوان خەسوو و بووك دا دروست بوو، هەموو دەگەڕایەوە بۆ بووکە خانم، لە کۆتایدا وای لە باوکی کوڕەکە کرد کۆتا بڕیاری خۆی بدات و داوا لە کوڕەکە بکات خۆی و ژنەکەی ماڵەکەی بۆ چۆڵ بکەن و ماوەیەکی پێدا تا شوێنێك بۆ خۆی دابین بکات.کەوتنە گەڕان بۆ خانوو، هەموو بە هۆی ئەو ژنە لە خوا نەترسەی ناکۆکی دەنایەوە و هاوسەرەکەی هان دەدا لە باوکی و شتی بەدەم خەسوویەوە هەڵدەبەست و هەموو کاتێکیش کوڕە لە بری دایك و باوکی بە چاك و خراپ هەر پشتی ژنەکەی دەگرت، پاش ماوەیەکی زۆر شووقەیەکیان دەست کەوت و بە باشترین شت و مەکی ناوماڵ ڕازاندیەوە و کامە گرانبەها بوو کڕی بۆ ئەوەی شانازی پێوە بکات لە لای هاوڕێکانی، بەم شێوەیە ژیانی دوور لە دایك



و باوکی دەست پێکرد و پەیوەندی لەگەڵ پچڕین، ئەو ژیانەی خەونی پێوە دەبینی نەهاتە دی، هەر بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو زۆر کۆسپ و گیرو گرفت هاتنە ڕێگا و، تەواو شەکەت بوو لە دەست ئەو هەموو داواکاریە پوچانەی ژنەکەی کۆتایی نەبوو، هیچ بایەخی نەدەدا بە کارو باری هاوسەرەکەی وای لێکرد ژیانێکی تاڵ و پڕ لە خەم و ناخۆشی هەبێت، قورەکە زیاتر خەست بوویەوە کاتێك ڕەواجی ئاسنگەریەکەی لە کورتی داو داهاتی زۆر کەم بویەوەو کێشەی دارایی بۆ دروست بوو، سەرباری ئەم ژنەی داخوازیەکانی دوایی نەدەهات.

کاتێك ژنە هاوسەری خۆی لەم بارودۆخەدا بینی، فەرمانی پێکرد بچێت بۆ لای دایك و باوکی و داوای یارمەتیان لێ بکات، بەڵام عیزەی نەفس و خۆ بەگەورە زانینی ڕێگەیان پێ نەدا.

چووە دەرەوەو بە دوای پیشەیەکی حکومی دا دەگەڕا، بەڵام هەموو دەروازەکان بە ڕوویدا داخرا بوون، هیچ چارەیەکی بۆ نەمایەوە تەنها فرۆشتنی شت و مەکەکانی ناوماڵی نەبێت، بەڵام ژنەکەی هیچ بایەخی بەم بارودۆخە نەدەدا هاوسەرەکەی تێکەوتبوو و هەر خەرجی دەکرد، هەتا یەك تاقە فلسی لە گیرفانی دا نەهێشت و بە شێوەیەك هەموو گەڕەك باسیان لە هەڵس و کەوتی ئەم ژنە دەکرد، ئیتر پارە نەماو ماڵ پڕ بوو لە کێشەو هەراو،لە زووە ووتراوە کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە، ئێستا کاسە بەتاڵە و شەڕەکەی بڵێسەی سەندو ژنەکەی تانەی لە مێردەکەی دەدا کەوا وەك ژن لە ماڵەوە دانیشتووە و ناتوانێ هیچ شتێك پەیدا بکات....هتد

بەم شێوەیە پیاوەکە کەوتە نێو ڕۆژگارێکی سەخت و پڕ ئازار و چیتر توانای بەرگە گرتنی نەماو کار گەیشتە ئەوەی ژنەکەی تەڵاق بدات، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت لەبەر سومعەتی خۆی و بێ شەرم بوو، بیری کردەوە بەهەر چۆنێك بووە دەبێت پارە پەیدا بکات، کارێکی نابەجێ ی بە بیرداهات ئەویش دروست کردنی چەکی پارە بوو بەڵام ساختەو بە بێ بوونی پارە لە بانقدا، جاری یەکەم ئەم کارەی کردو سەرکەوتوو بوو، نەیانتوانی بیدۆزنەوەو، ئەمە هەڵی نا تاوەکو دووبارەی بکاتەوە و شەیتانیش چووە بن کلێشەی و ئەم کارە خراپەی شیرینتر کرد لە لای و چەکێکی تری دروست کرد، بەڵام هەموو سەرەتایەك کۆتاییەکەشی هەیە، چەند ڕۆژێکی بەسەردا نەڕۆیشت، پۆلیس هاتنە سەری





و لە دەرگایان دا و بەرەو چارەنووسی تاریکیان برد، ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانی لەو دیوو شیشەکانی زیندانەوە بەسەر برد، چاو پڕ لە فرمێسك سەر شۆڕ و دیل و شەرمەزار و دەپاڕایەوە کە خودا لێ ی خۆش ببێت و باوك و دایکی لێ ی ڕازی ببن[1].

بێ گومان ئەمە کۆتاییەکی سروشتیە بۆ کەسانێك سەرپێچی دایك و باوکیان دەکەن

خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾[2].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرمووێت:

(رضى الرب في رضى الوالدين، وسخط الرب في سخط الوالدين)[3].

واتە:(ڕازی بوونی خودا لە ڕازی بوونی دایك و باوك دایەو، توڕەیی خودا لە توڕەییاندایە)

---

(١) لە (جريدة الرأي العام) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة لقمان: اية ١٤.

(٣) رواه الحاكم.



## سـزایەکی وەك خۆی

لەماڵەوە خۆی و دایکی پێکەوە دەژیان، خزمەتکارێکیشی لێ بوو کاروباری دایکی جێ بە جێ دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەم بێ دەنگی و تەنیاییەدا خۆی لە خۆیدا کەسێکی دڵ ڕەق و گرژو مۆن و هەڵس و کەوت ناشرین بوو، دایکی ئیفلیج بوو بوو و چاوەکانی لە دەست دابوو، بەڵام لە بری ئەوەی نەرم و نیان بێت لەگەڵیدا و بەسۆزەوە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکات تا لەو کارەساتەی بەسەریدا هاتووە کەمێك لێ ی بڕەوێنێتەوە، بە پێچەوانەوە تەنها جنێوی پێ دەدا و بە قسە ڕەقەکانی بریندارى دەکرد.
ئەم کوڕە دایکی دەبرد بۆ وەرگرتنی مووچە بۆ (بانق) و دەیخستە سەر کورسیە جوڵاوەکەو پاڵی ی پێوە دەناو، لەو کاتەدا دەیشکاندەوەو قسەی جەرگ بڕی پێ دەوت: (تۆ کوێر و ئیفلیجیت و من لە تۆ خراپترم کە بەڵایەکی وەك تۆ بەسەرمەوەیە)، دایکەی بێ دەستەڵات ئازاری زۆری دەکێشاو هیچ قسەیەکی نەدەکرد.
فرمێسکی هەڵدەوەراندو ڕۆژگارەکانی پێشوو دەهاتنەوە یادی، کوڕەکەی هەستی دایکی بە لایەوە گرنگ نەبوو بەڵکو زیادەڕەوی دەکرد و پێی دەوت: (بەخودا ئەگەر ئەم موچەیەت نەبوایە دەمێك بوو فڕێم دابوویتە خانەی پیران) و، داخ و حەسرەت و ئۆفی دەکرد لە دەستی و، بە بیستنی ئەم قسانە دڵی دایکی پارچە پارچە دەکرد و، پاشان دایکی دەهێنایەوە بۆ ماڵەوە و دەیدایەوە دەستی خزمەتکارەکەو پارەکەی دەبرد و لەگەڵ هاوڕێ خراپەکانیدا دەچوونە شوێنی ڕابواردن و گەشت و سەیران، بەبێ ئەوەی هەست بکات دایکی هەیە و چی بەسەر دێ، بەڵکو بەهەڵس و کەوتە ناشرینەکانی هەموو کەسێکی لە دایکی کردبوو نەیدەهێشت سەردانی دایکی بکەن، ئەگەر کەسێکیان بهاتایە بە ناشرینترین شێوە دەری دەکرد و هەڕەشەی لێ دەکردن، دایکی هەژار بە جارێك کەوتبووە نێو دۆزەخەوەو، بەڵام بێ چارە هیچ شتێکی پێ نەدەگۆڕا.
لە نێو ئەو گەشتانەی دەیکرد ئەم جارە لەگەڵ هاوڕێکانیدا گەشتیان کرد





بۆ وولاّتێکی دراوسێ و بە ئۆتۆمبێل چووین، لە گەڕانەوەدا ئۆتۆمبێلەکەیان وەرگەڕا و هەموویان ئازاری زۆریان پێ نەگەیشتبوو و برینەکانیان کەم بوو، بەڵام ئەم کوڕە یاخی و لووت بەرزە بەپەلە برایە نەخۆشخانەو بەشی بوژانەوەو حاڵی زۆر خراپ بوو، نزیکەی مانگێك مایەوە پاشان لەسەر کورسیەکی جولاّو هاتە دەرەوە، ئیفلیج بوو بوو نەیدەتوانی بجوڵێ، پاشان هەر دەچویەوە بۆ بانق، بەڵام لە بری ئەوەی لەگەڵ دایکی بچێت، خزمەتکارەکە پاڵی دەنا بەخۆیەوە تا مووچەی کەم ئەندامیەکەی وەربگرێت و پارە کەی خزمەتکارەکە بوو[1].

دایك خۆشەویست و مایەی سۆز و ژیانە و هەتا لە دەستی نەدەیت هەستی پێ ناکەیت، بەڵام هەندێ لە منالّەکان و بە تایبەت کوڕ دڵیان وەك بەرد ڕەقەو زیاتر، بەڵام خودا یاخی بوون لە دایك و باوك زۆر دواناخات و زوو تۆڵەیان بۆ دەکاتەوە لەسەر دنیا.

دوای خوێندنەوەی ئەم ڕووداوە با ئەوانەی دایکیان لە ژیاندایە سوپاسی خودا بکەن و دەستی و ناوچەوانی ماچ بکەن و با خودا ڕەحمی پێ بکات و بە نزای دایك و باوکی بیبەخشێ.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾[2].

لە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)یان پرسی سەبارەت بە دایك و باوك، فەرمووی بەو کەسەی پرسیارەکەی کرد:(هما جنتك و نارك) [3].

واتە: (ئەوان بەهەشت و دۆزەخی تۆن. واتە گرەنتی ڕزگاربوون یان تیا چوونتن).

---

(١) لە ( جريدة الانباء ).

(٢) سورة الاسراء: ٢٣.

(٣) رواه ابن ماجة.



# بەشی چوارەم: هەنگاوەکانی شەیتان

یەکەم: فێڵ و ساختە کردن.

دووەم: تەماح.

سێیەم: لە کارەکانی شەیتان.

چوارەم: ئاگری شەهوەت و ئارەزوو.

پێنجەم: گەشتی خراپەکاری.

شەشەم: چاڵە ئاگر.





# فـــێڵ و سـاخـتـەکاری

کەسێکی دنیا ویست و بە تەماح بوو، هەمیشە ئاواتی ئەوە بوو کۆی بکاتەوە و لە ڕابواردن دا خەرجی بکات و دەستی بڵاوبوو، ئەگەرچی مووچەکەی یارمەتیدەری ئەو کارە نەبوو چونکە فەرمانبەرێکی ئاسایی بوو لە یەکێك لە وەزارەتەکاندا بە مووچەیەکی کەم.

موچەکەی بەشی خەرجی ڕابواردنەکانی نەدەکرد، هەر چەندە باوکی پارەیەکی باشی پێ دەدا و کەمتەرخەمی نەدەکرد، بەڵام بەهۆی کارەخراپەکانی و ڕابواردن هەر دەگەیشتە دەستی دەبوو بە هەڵم و، زۆر بەبێ سەلیقەیی خەرجی دەکرد و لەدەست ڕژاو بوو.

لەلایماڵیاندا پیاوێك لە یەکێك لە دەوڵەتە عەرەبیەکانەوە هاتبوو بۆ کارکردن و لەلای کابرایەك وەك فرۆشیاری سەوزەو میوە کاری دەکرد، بەڵام لە سیفەت و سروشتی دا وەك دوانە وابوون پێکەوە هاوڕێیەتیەك لە نێوانیاندا دروست بوو، وەك یەك وێڵی پارە بوون و مەنجەڵ سەرقاپی دۆزیبویەوە.

ڕۆژێك پێکەوە دانیشتبوون و بیریان دەکردەوە چۆن بتوانن لە کاتێکی کەمدا و بە کەمترین هەوڵ پارەیەکی زۆر بەدەست بێنن، بەقاڵەکە کەسێکی شارەزا بوو لەو کارانە داو زۆر فرو فێڵ و چاوبەست کاری کردبوو دەیزانی، پێکەوە بڕیاریاندا پیلانەکەی ئەو جێبەجێ بکەن ئەویش: ئۆتۆمبێلێکی زۆر گرانبەها و مۆبایل بەکرێ وەردەگرین و ئەم کوڕە جل و بەرگێکی گران لەبەر بکات، کەوا لە ڕوخساریدا بخوێننەوە پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن کارە وە بەقاڵەکەیش ببێت بە شوفێری، بەم شێوەیە خۆیان بە دەوڵەمەند نیشان بدەن و، خەڵك بە ڕوخسار هەڵدەخەڵەتێت، ڕۆژی پێنج شەممەیان دیاری کرد تاوەکو پیلانەکە جێبەجێ بکەن.

لەبەردەم دوکانێکی سەعات فرۆشی زۆر گرانبەها وەستاندیان و بەقاڵەکە زۆر جوان ڕۆڵی دەبینی و خاوەن دوکانەکەی وا لێ کرد هەست بکات ڕاست دەکەن و، بە نرخی (١٢٠) هەزار دیناریان برد و پاشان چەکێکی بەتاڵی بۆ



ئیمزا کرد و پێ ی دا.
دواتر چوونە دوکانێکی زێڕ و خشڵ و، بە نرخی (٥٠) هەزار دینار شتیان برد و، گەڕانەوە بۆ ماڵەوە و رێك کەوتن شت و مەکەکانیان بشارنەوە و دەستی لێ نەدەن و پاشان هەڵس و کەوتی پێوە بکەن، شتەکانیان لەلای بەقاڵەکە هەڵگرت و، کوڕە گەڕایەوە ماڵەوە و خەونی زۆر خۆشی بەو شت و مەکانەوە لێدەدا، چۆن دەیفرۆشن و چۆن خەرجی دەکەن ؟ و پاشان کەوتە خەوێکی قووڵەوە، سبەینێ دەنگی دەرگا بە ئاگای هێنا و بە خێرایی چوو، بەڵام کردیەوە دەبینێ لێکۆڵەرەوە و پۆلیسە، دەستگیریان کرد و پاشان دانی نا بە تاوانەکەیدا، بەڵام بە هیچ جۆرێ ناوی بەقاڵەکەی نەهێنا و شوێنی شتە دزراوەکانی ئاشکرا نەکرد، سێ ساڵ زیندانی بڕا بەسەریدا، چاوەڕێ بوو سێ ساڵ بڕوات و بگاتەوە بەو شتانەی لای بەقاڵەکە، بەڵام چاوی رەشی کاڵ بوویەوە و، نامەیەکی بۆ هات لە هاوبەشە بەقاڵەکەیەوە و تێیدا نووسیبووی ئەو پۆلیسی هێناوە و هەواڵی پێداون و پارەکانی بردووە و بۆ کەنداو چووە !!
بە خوێندنەوەی ئەم نامەیە خەریك بوو بخنکێت و هەستی دەکرد هەموو دنیا بەسەریدا ڕووخاوە و دڵی پڕ بوو لە رق و خۆزگەی دەخواست ئێستا ئەو بەقاڵە لە بەرانبەریدا بوایە و ملی ببپچڕاندایە و تۆڵەی خۆی لێ بکردایەتەوە، هاوڕێیەکی هاتە سەردانی و تەماشای کرد حاڵی زۆر خراپە و دڵی تەنگە، هۆکارەکەی لێ پرسی، باسی هاوڕێکەی و فێڵەکانی بۆ کرد، هاوڕێکەی ووتی: کەواتە مژدەم پێ یە، ئەو کابرایە لە کەنەداو لەسەر کاری ساختە و فێل دەستگیر کراوە و هەموو سامانەکەی بلۆك کراوە چونکە گومانی لەسەرە[1].
ئەمە ڕوداوێکی راستەقینەیە و پەند و ئامۆژگاری تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کاری حەرام بە بیریاندا دێت و حەز دەکەن کاسبی ناشەرعی بکەن بۆ دەوڵەمەند بوون بە زۆرترین کات، دەبێت لەبەر چاوت بێت ئەو پارەیە چەند بە خێرایی چنگت بکەوێت و بێ ئەرك و ماندوو بوون بێت، سزاکەی بە تین ترە و، با پەند وەربگرین.
پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

---

(١) جريدة (الرأي العام)





(والذي نفسي بيده لا يكسب عبد مالا من حرام فينفق منه فيبارك فيه، ولا يتصدق فيقبل منه ولا يتركه خلف ظهره الا كان زاده نارا و ان الله لا يمحو السيء بالسيء ولكن يمحو بالحسن، ان الخبيث لا يمحو الخبيث)[1].

واتە: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هەرکەسێك سامان بە حەرامی پەیدا بکات و ئەگەر خێریشی لێ بکات لێ ی وەرناگیرێت، یان ئەگەر کۆبکاتەوە و لەسەریەکی دابنێت زیاتر ئاگر بۆخۆی خۆش دەکات، خودا خراپە بە خراپە ناسڕێتەوە و بەڵکو خراپە بە چاکە دەسڕێتەوە، پیسی پیسی لا نابات)

(١) رواه أحمد فى مسنده.



## تەماح

قوتابی یەکێك لە زانکۆکانی وولاتەکەی بوو، خەونی دەبینی ببێت بە بازرگانێکی بەناوبانگ و سامانێکی زۆر کۆبکاتەوە، بۆ هێنانەدی ئەو خەونە چووبووە بەشی (بیرکاری و محاسبە)، دوایی تەواوکردنی ڕووی لە یەکێك لە دەوڵەتەکانی کەندا و کرد تاوەکو کارێکی دەست بکەوێت و خەونەکانی بێنێتە دی. بوویە وانەبێژی بیرکاری و، زۆر سەرکەوتوو بوو لەکارەکەیدا و بوو بەسەرچاوەی سامانێکی زۆر بۆی و خێزانی پێکەوە ناو زۆر بە خۆشی ژیا، هەرکاتێك پارەیەکی زۆری کۆدەکردەوە لە ڕێگەی یەکێك لە هاوڕێکانیەوە دەیناردەوە بۆ کەس و کاری و ئەو هاوڕێیەی ڕەسیدی بانقی هەبوو لە وولاتەکەی خۆیدا و پارەکانی لەم وەردەگرت و لەوێ لە ڕەسیدەکەی چەکیان بۆ سەرف دەکرد، هاوڕێکەی بەم کارە قازانجێکی زۆری دەکرد و سوودی لە حەواڵەکردنەکە دەبینی، بیری کردەوە ئەم ڕێگەیە بێ ئەرك و ئاسانە و قازانجەکەی ئاشکرایە وە ئیتر دەستی کرد بەم کارە و، ڕۆژ بە ڕۆژ قازانجی زیاتری دەکرد، بەڵام هەتا پارەی زیاتری دەبوو چاوی برسی تر دەبوو، بیری کردەوە کۆمپانیایەك بۆ پەرەپێدانی پارە دابنێت، بەڵام وەك کۆمپانیایەکی وەهمی و خەیاڵی بوو، دەستی کرد بە وەرگرتنی پارەی ئەو کەسانەی دایاندەنا و مەرجی ئەوە بوو ئەگەر تا یەك ساڵ پارەکەیان ڕانەکێشنەوە قازانجی لەسەدا (٥٠٪)ی دەبێت، وای کرد تا خەڵك متمانەی پێ کرد، پاشان کردی بە سێ ساڵ و دەبێت بە لە سەدا سەد، لەو ماوەیە بیری کردەوە پارەکە هەڵبگرێت و ڕابکات بۆ ئەوروپا و لەوێ کاری وەبەرهێنانی پێ بکات و، بۆی چووە سەر، دوای دوو ساڵ بازاڕێکی ناوەندی لە قازانجی پارەکان کڕی لەگەڵ هەندێ فرۆشگای تردا، بەڵام ساڵی سێ یەمی تەواو نەکرد و بەهۆی سەرپێچی یاساکانەوە دەستگیر کرا، پارێزەری ڕاسپارد تا بەرگری لێ بکات و بریکار نامەیەکی گشتی بۆ براکەی کردەوە تا بتوانێت هەڵس و کەوت بە هەموو شتەکانیەوە بکات و بیکات بەناوی خۆیەوە تاوەکو ئەوانەی پارەیان خوراووە داوای نەکەن لێ ی، هەواڵەکان لە ڕۆژنامەدا



بڵاو بویەوە و دواتر ئیفلاسبوونی خۆی راگەیاند و دە ساڵ بە زیندانی کردن حوکم درا، ئیتر لە زیندانەوە نامەی دەنارد کەوا براکەی ئاگاداری خێزانەکەی بێت و، براکەی سەرەتا هەندێکی بۆ خەرج دەکردن وە کچەکەی ئامادەیی بڕی و کۆلێژی پزیشکی وەریگرت، بەڵام تووشی نەخۆشی دڵ بوو و، ئەم خەمەی زۆر گەورە بوو سەرباری نەخۆشی کچەکەی لێ ی دوور بوو و لەنێو چوار دیواری زیندان دا بوو، رۆژ بە رۆژ ژیانی بەرەو خراپتر دەچوو لە زیندان و ژیانی پڕبوو لە دڵتەنگی و تووشی پەستانی خوێن بوو، بەهۆیەوە یەکێك لە چاوەکانی لەدەستدا و. هێشتا ماویەتی تاڵاو بچێژێ، لەهەمووی جەرگبڕ تر براکەی بوو کاتێك بڕیاری دا مانگانەی (٥٠) دینار بدات بە خۆی و خێزانەکەی و هەموو پارەکەی تری دەست بەسەردا گرت کە زیاتر لە ملیۆن دیناری کومیتی بوو، هەموو ئەو ماڵەی بە حەرام کۆی کردەوە چووە گیرفانی براکەی و ئەمیش ژیانی لە زیندان و ریسوایی و بێ بەش لە هەموو خۆشیەك دەگوزەراند.

ئەمە سەرئەنجامی تەماح و کاسبی حەرام بوو، کە زوو هات و زوو ڕۆیشت و، خاوەنەکەی تەنها لە خەمی پارەدابوو، دنیا و دوا رۆژی دۆڕاند و لە دنیادا ژیانی زیندانی تاریك و، ژیانێکی پڕ تاڵی و نەگبەتی و خێزانێکی لەیەك ترازاو، لە دوا ڕۆژدا چی بەوانە دەڵێت کە پارەکانی خواردن، لە کاتێکدا ئەوانە متمانەیان پێ کرد و بووە هۆی ئەوەی هەندێکیان لە خەفەت دا بمرن، کەواتە دۆزەخ لە دنیا و دوارۆژدا بوو بە بەشی و تەماح وەك سوێراو بوو تا خواردیەوە تینویەتی زیادکرد و بێ سوود بوو. خوای باڵا دەست دەفەرموێت:

﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾[1].

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت:

(المكر و الخديعة و الخيانة في النار)[2].

واتە:(ساختە و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و خیانەت کردن خاوەنەکەی دەباتە نێو ئاگر).

---

(١) سورة المؤمنون: أية ٥٥ و ٥٦.

(٢) رواه أبو داود.



## لە کارەکانی شەیتان

بەدرو سعید دوو هاوڕێ ی گیانی بە گیانی بوون، هەمیشە پێکەوە بوون، تەنها کاتێك نەبێت شەو درەنگ دەچوونەوە ماڵەوە، بە ڕۆژ پێکەوە ماسیان ڕاو دەکرد و شەویش لە مەلها و مەی خواردنەوە و قومارکردندا هەر پێکەوە بوون، شەوێکیان لە یەکێك لە یانەکانی قوماردا تا ڕۆژبوویەوە قوماریان کرد، بدر پارەیەکی زۆری بردەوە و زۆر دڵی خۆش بوو لە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، چونکە پارەی هەموویان بردبویەوە، پێکەوە بەرەوە ماڵ بوونەوە، هەندێك ڕێگایان بڕی سعید زۆر پاڕایەوە لە بدری لەو پارە زۆرەی بردویەتیەوە هەندێکی بداتێ، چونکە هەموو پارەکانی دۆڕاندوە و ئەو پارانەی ئەویش زۆر زۆرن و تەنها کەمێك پارەی دەوێت.

ووتی: چاوت بەیەك فلس ناکەوێت بۆچی بتدەمێ؟ ئەی خۆم بە لێزانین و شارەزایم و ماندوو بوونم پەیدام نەکرد، ئیتر چ پەیوەندیەکی بە تۆوە هەیە.

سعید زۆر تکای لە هاوڕێکەی کرد و بۆی روون کردەوە کە ئێستا هیچی نەماوە و هەموو سامانەکەی لە قوماردا دۆڕاندوە. بەڵام بەدر ئەم پاڕانەوانە کاری تێ نەکرد و قیڕاندی بەسەریدا و لێ ی داو پێی ووت وازم لێبێنە، سعید کەوتە سەر زەویەکە، بەڵام هەستایەوە و دارێکی قورسی هەڵگرت و دای بەسەر بدر داو کەوتە سەر زەوی، ئەوان دوو هاوڕێ ی نێو دەریا بوون و هێشتا بەلەمەکەیان چاوەڕێ ی دەکرد ڕۆژ بێتەوە و بێ ماسی بێن بگرن، ئەمجارە نەهاتن بۆ ماسی گرتن، بەڵکو سعید بدری خستە نێو بەلەمەکە و بردیە ناوەڕاستی ئاوەکە و نقومی کرد و پارەکانی برد و پاشان هاتەوە بۆ ماڵەوە.

دوایی چەند ڕۆژێك گەڕان بەدوایی بەدری دا جەستەکەی دۆزرایەوە و، دوایی لێکۆڵینەوە و پشکنین سعید دەستگیر کرا و بیست و پێنج ساڵ درا بە





کۆڵیدا لە زیندان داو لەگەڵ کاری قورس[1].

خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾[2].

---

(١) (جريدة الانباء).

(٢) سورة المائدة: أية ٩٠ و ٩١.



## ئاگری شەهوەت و ئارەزوو

کوڕێکی چاك و ڕێك و پێك بوو، ڕەوشت بەرز و سەربەرز بوو، هاوسەرێکی چاکی خواست و ژیانی هاوسەرگیری پێك هێنا، لەگەڵ خێزان و کیژۆڵە بچکۆلانەکەیدا ژیانێکی زۆر خۆشیان هەبوو، لە فرۆکەخانە کاری پشکنین کردن بوو بۆ ئاڵتون و زێڕ، نەگبەتیەکانی لێرەوە سەریان هەڵدا، با گوێبیستی خۆی بین بۆمان بگێڕێتەوە:

لەبەر ئەوەی کارم پشکنین و چاودێری کردنی زێڕ بوو فیتنە و نەگبەتی بە پێ ی خۆی دەهاتن بە پیرمەوە، هەموو جۆرە چینێکی ئافرەت، هەندێکیان بەداخەوە بەس بۆ ئەوەی بەبێ تەماشاکردن ڕێگەی بەربدەین، خۆی دەخستە بەردەستت و چیت بویستایە ئامادەبوو، بەڵام خۆڕاگر بووم، ئەم خۆڕاگریەم تا سەر نەبوو، ڕۆژ بە ڕۆژ هەستم دەکرد دەروونم لاواز دەبێت و ئەو پیاوەی پێشووتر نەمابووم کە هەڵنەدەخەڵەتام، تەواو ئیمانم لاواز بووبوو، بەڵام شەرمم لە هاوڕێکانم دەکرد و خۆم بە خاوەنی بەها ڕەوشتیەکان و ئایین دەزانی لەبەرچاویاندا و نەمدەتوانی دابەزم بۆ ئەو ئاستە نزمانە،بەڵام هاوەڵەکانم خۆیان نقوم بووبوون و شەیتان هەموو پلەکانی پێ تێپەڕاندبوون ئەوانەی شەرمم لێ دەکردن، هەوڵیان دەدا وورده وورده گومڕام بکەن و سەرکەوتن، خێزانەکەم هەستی پێکردم کەوا گۆڕاوم وەك جاران نیم، نوێژەکانی بەیانیم دەچوو، وازم لە نوێژی بەکۆمەڵ و مزگەوت هێنا، ئامۆژگاری دەکردم و بەیادی دەهێنامەوە بەڵام من زۆر بە توندی دەمشکاندەوە و دەم کوتم دەکرد.

ژنەکەم پشت گوێ خست بە رادەیەك هەستم دەکرد ئیتر پێویستم پێ ی نەماوە، بەڵام خۆڕاگربوو و لەم بارەو دۆخەدا جێی نەهێشتم و وازی لێ نەهێنام چونکە زۆر لە خوا ترس و باوەڕدار بوو.. هەمیشە خەریکی پەرستش بوو. ڕۆژان هاتن و چوون من تەواو نقومی ڕابواردن و خراپەکاری بووبووم، لەنێو ژن و هاوڕێ ی کچ و ڕابواردن لەگەڵیاندا، دواتر فێری مەی خواردنەوە بووم و، چوومە نێو جیهانی سەرخۆش و مەستان، پاشان گەیشتمە ئەو ڕادەیەی دەچوومە نێو

شوقەی بێ ڕەوشتان و بەدکاران، ڕێگای خراپەکاری بەمانە کۆتایی نایە، بەڵکو کەوتمە نێو قوڕاوی مادده هۆشبەرەکان و تەواو تیاچووم، ژنەکەم تاقەکەس بوو دەیویست لەم قوڕە دەرم بهێنێت، بەڵام من وەڵامم نەدەدایەوە، سەرم کردە مادده هۆشبەرەکان و، هەموو شتم کردە قوربانی، تەنانەت ئاڵتونی ژنەکەم و شت و مەکی ناو ماڵەکەم و ئۆتۆمبێلەکەم و هەرشتێك پارەی بکردایە دەمفرۆشت و تلیاکم پێ دەکڕی.

ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێکانمدا دانیشتبووین و بیرمان دەکردەوەو وتیان:

لێرە تلیاك زۆر گرانە، بۆ نەچین بۆ ئەو وڵاتە تلیاك زۆر هەرزانە و بیهێنین واتە ببین بە بازرگانی تلیاك، چووین و ئەوەندەی وویستمان کڕیمان و گەڕاینەوە، لە ڕێگەدا شەیتان بۆی هۆندمەوە کەوا ناگیرێم لە گومرگ چونکە ئەوانەی لەوێن هەموو هاوڕێمن و ئەگەر لەبەر هاوڕێیەتیش بێت شتەکانم نا پشکنن، یان ئەگەر بیپشکنن و بیبینن چاوپۆشی لێ دەکەن چونکە من هاوڕێیانم.

کاتێك گەیشتینە گومرگ لێپرسراوی پشکنین نێو جانتاکانم گەڕاو و تلیاکی بەرچاوکەوت.. دەستگیرکرام و کۆتا حوکمم حەوت ساڵ زیندانی کردن بوو. لە پشت شیشەکانی زیندانەوە بەسەرم برد بۆ ئەوەی باجی ئەو ئاگری شەهوەت و ئارەزووە بدەم. کە بەرەو ئەم تاریکستانەی بردم، کە باوکم ئەم هەواڵەی بیست ئیفلیج بوو مانی گرت لە خواردن تا مرد، دایکم بێوەژن کەوت و هەموو بەهۆی گەڕانی من بە دوایی ئارەزوو و رابواردن دا[1].

خودای باڵا دەست دەفەرموێت:

﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذۡهَبۡ نَفۡسُكَ عَلَيۡهِمۡ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ٨ ﴾[2].

ئەمە کۆتایی هەرکەسێکە بەباشی خودای خۆی نەناسێ و ئەرکەکانی جێبەجێ نەکات و مافی خێزان و هاوسەر و منداڵەکانی نەدات، ئەوا ئەم سەرلێشێواوەی سەرپێچی لە فەرمانی خودا کرد زۆری نەبرد لە کارە خراپەکانی ئێستا لە

---

(١) لە (جريدة الرأي العام) بە دەستکاریەوە.

(٢) سورة فاطر: أية ٨.



پشتی شیشەکانی زیندانەوەیە و پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت و بەشی گریان و ئازار و حەسرەتە، بێ گومان لۆمەی نەفسی خۆی دەکات بۆ ئەم کارە قێزەونە و کە بەرەو درکەڵانی برد.

اذا المرء اعطى نفسه كل ما اشتهت　　ولم ينهها تاقت الى كل باطل
وساقت اليه الاثم والعار بالذي　　دعته اليه من حلاوة عاجل

(ئەگەر نەفس بدەیت بە دەمیەوە و هەموو شتێکی ویست بۆی بکەیت و- لە هیچ شتێك نەیگەڕێنیتەوە کە حەزی لێ یەتی لە ناڕەوایەکان- ئەوا بەرەو خراپە و ڕیسوایت دەبات - بەهۆی چێژتنی شیرینیەکی کەم)

## گەشتی خراپەکاری

بازرگانێکی گەورە و ناودار بوو لەگەڵ ئەوەشدا بریکارو سەرۆکی ژمارەیەکی زۆر کۆمپانیا بوو، خودا سامانێکی زۆری پێ بەخشی بوو، ڕۆژانەیش بازرگانی و داهاتی لە زیادبوون دا بوو، بەڵام کەسێکی نا سوپاس گوزار بوو، لە بری ئەوەی ستایشی خودا بکات و لەکاری چاکەدا خەرجی بکات، سەری کردبوە کاری ناشرین و داوێن پیسی و کاری حەرام، لە کۆتاییدا با بزانین چی بەسەر هات؟
(ش) گەشتی کرد بۆ لوبنان و لە یەکێك لە ئوتێلە ناودار و شکۆمەندەکانی لایدا و، لەوێ لەگەڵ پیاوێك یەکتریان ناسی و ناوی (ریاض) بوو، لە نێو هۆڵی ئوتێلەکە دانیشتبوون و کچێکی منداڵکاری زۆر جوانی لەگەڵدا بوو، پێکەوە کەوتنە قسە کردن و پاشان (ش) بانگهێشتی کردن بۆ یەکێك لە مەلهاکان و پێکەوە لەوێ چەند کاتژمێرێکیان بەسەربرد، هەر چیەك توانیان کردیان، تەنانەت ئەو شتانەش شەیتان خۆی نایکات و دوایی تەواو بوونی بەزمی شەوانە و ئاهەنگەکە، (ریاض) زۆر مکوڕ بوو لەسەرئەوەی (ش) لەگەڵیاندا بڕواتەوە بۆماڵیان و لەوێ دەتوانێ شەوێکی سوور لەگەڵ کچەکەیدا بەسەربەرێ، (ش) ڕازی بوو، نەك هەر ڕازی بوو بەڵکو بە ئاواتی گەیشت، ئەو لە یەکەم جارەوە یەکتر ناسینی لەبەر ئەو کیژۆڵەیە کردبوو، ئەمانیش دەیانزانی ئەم پیاوە بازرگان و ساماندارە، هەر بۆیە هەرچیەکی پێ خۆش بوو کچەکە بۆی دەکرد و شەوێکی پڕ لە تاوانیان بەڕێ کرد و، کچە بەڵێنی پێ دا تا لێرەیە هەموو شەوێکی لەم شەو خۆشتر دەکەن بۆی و هەر شەوەی کچێکی جوانتر یان وەك خۆی دەخەنە بەر دەمی.
سبەینێ هات و پاشان کچەکە کچێکی لەخۆی جوانتری هێنا و ناساندی بەم گورگە برسیە و هەموویان پێکەوە ڕۆیشتن بۆ بازاڕ، یەکێکیان لەبەردەم زێڕینگەرێکدا وەستاو چاوی بڕیبووە ئاڵتونەکان، کاتێك (ش) بینی ئەوەندە سەرسامە و حەزی لێ یە، داوای لێکردن بچنە نێو دوکانەکە و چ خشڵێکیان حەز لێ یە هەڵیبگرن و ئەمیش پارەکەی دەدات، ملیۆنێك لیرەی بۆ خەرج کردن، بەڵام لەبەر ئەوان نەبوو بەڵکو لەبەر خاتری خۆی بوو و کاری پێیان هەبوو، پێکەوە هاتنە دەرەوە و کچە تازەکەی هاتبوو سوور بوو لەسەر ئەوەی

ئەمشەو لە ڤێلا مەزنەکەی ئەو بەسەر بەرن، (ش) بەبێ دوو دڵی کەوتە شوێنیان و چوون بۆ ئەو شوێنەی کچەکە ووتی، کاتێك چوونە ژوورەوە هۆڵی ڤێلاکە کۆمەڵە کەسێکی لێ بوو قوماریان دەکرد، ویستی خۆی بنوێنێ و شارەزایی خۆیان پێ نیشان بدات بە پارە و بە دۆلار کەوتە قومار کردن، پاشان بە چەکی کراوە لەسەر ئەو مێزەی قومارە کۆی پێنج ملیۆن لیرەی دۆڕاند، لە کۆتایی ئاهەنگی شەوەکەدا کچێکیان برد و پێکەوە چوونە ژوورێکی ڤێلاکەوە، لە ناکاو هەندێك چەکدار دایان بەسەر ڤێلاکەداو یەکسەر بۆ نهۆمی سەرەوە سەرکەوتن و دایان بەسەر ئەو ژوورەی (ش) و کچەکەی لێ بوو، ناچاریان کرد چەکێکیان بە بڕی پێنج ملیۆن دۆلار بۆ ئیمزا بکات و دەست بەسەریان کرد تا چەکەکەیان لە بانق ڕاکێشاو پاشان بەڕەڵایان کرد، دواتر (ش) زانی کە ئەمانە باندێکی چەتەگەرین و لەنێوان ئوتێل و مەلهاکاندا ئەم کارانە دەکەن و هەموویان سەر بەو کۆمەڵە بوون، بەڵام پاش ئەوەی سامانەکەی و ناوبانگی تێدا دۆڕاند[1].

ڕێگەی خراپەکاری مرۆڤ کە لێ ی دەڕوانێ وا دەزانێ زۆر سانا و ئاسانە و خۆشە، بەڵام لە ڕاستیدا کورت و خۆشیەکانی بڕاوە و کۆتاییەکەی زۆر تاڵ و پڕ گرفتە، شەیتان هانی دەدات و بەو شتانە چاو بەستی دەکات و بۆی دەڕازێنێتەوە هەتا دەیخاتە نێو چاڵەکە و بە جێ ی دەهێڵێ و پڕ بەدەمی بە گەمژەی ئەم مرۆڤە ساویلکە و بێ عەقڵە پێ دەکەنێ، هەمیشە لە هەنگاوەکانی شەیتان ئاگادار و وووریا بین و، بەڕێگای حەرامدا نەڕۆین چونکە ریسوایی و سەرشۆڕی دنیاو دوا ڕۆژی تێدایە. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ ﴾[1].

پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت:

( ما من ذنب بعد الشرك أعظم عند الله من نطفة رجل في رحم لا يحل له)[2].

واتە: (گەورەترین گوناه لە دوای هاوبەش بڕیار دان بۆ خودا ئەوەیە پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکدا جووت ببێت کە پێ ی حەرامە و بۆی ناشەرعیە).

---

(١) لە (جريدة الانباء) بە دەستکاریەوە.

(١) سورة النساء: آية ٣٨.

(٢) أخرجه أحمد كما في تفسير إبن كثير.

# چـاڵە ئـاگر

کاری گۆڕینەوەی دراو بوو، هەمیشە بەخت یاوەری بوو لە کاری بۆرصە داو، وای کردبوو سامانێکی زۆر کۆبکاتەوە و، ئەم دەوڵەمەندیە هەموو خۆشیەکی دنیای بۆ ئاسان کردبوو، خۆش دەژیا و پارەی بە چەپ و ڕاستدا بەبێ بیرکردنەوە قەرز دەکرد، وەکو قارون زۆر کەس خۆزگەی پێ دەخواست، بەڵام ڕۆژگار ناوەستێت و لە هەڵگێڕ و داگێڕدایە، کەسێك هەڵدەبڕێ و یەکێکی دی دەدات بە زەوی دا، بارودۆخ هەڵگەڕایەوە و گۆڕانێکی زۆر لەناکاو بەسەر بۆرسە داهات و نرخ بە شێوەیەکی زۆر جەرگ بڕ گۆڕانکاری بەسەر داهات و زیانێکی زۆر بەر ( ص ) کەوت، شکستەکانی ڕۆژ لە دوایی ڕۆژی بازاڕ ناچاریان کرد زەوی و موڵکەکانی لە وڵاتی خۆیدا بفرۆشێ و پەنای برد بۆ کاری ساختە و خۆی گۆڕی و چەند کارێکی فێڵ و ساختە و هەڵخەڵەتاندنی ئەنجام دا، کە ناچار بوو بە هۆیانەوە نەك هەر شارەکەی وڵاتەکەی جێ بهێڵێ و ڕووی کردە دەوڵەتەکانی کەنداو و، لە کۆتایی دا لە لوبنان گیرسایەوە و چووە ئوتێل، لە کاتی مانەوەی هەمیشە بە شوێن قومارخانەدا دەگەڕاو زۆربەی کاتەکانی لەسەر مێزی قومار بەسەر دەبرد، بەبۆچونی خۆی پارە دەباتەوە، بەلام لە کۆتایی دا هەرچی پێ بوو دۆڕاندی و، ئەم ئیفلاس بوونە تەمبێ ی نەکرد و بەئاگای نەهێنایەوە لەو بێ هۆشیەی تێکەوتبوو، بەڵکو زیاتر ڕۆچوو تێدا و قومار کردن ناچاری کرد هەرچیەکی پێ ماوە بیفرۆشێت، بەڵام سوودی نەبوو، قومار وای لێکردبوو تەنانەت پارەی خواردنیشی نەمابوو...بێ چارە. بێ پارە...بێ بیرکردنەوە.. بێ چارەسەر، بۆیە سەر لەبەیانی یەکێك لە ڕۆژەکاندا جەستەی لەسەر ڕێگا دۆزرایەوە و دەمانچەکەی لای خۆیەوە دانابوو، ئەمە کۆتایی ئەو ڕێگایە بوو گرتبوویە بەر... خۆ کوشتن[1].

خوای گەورە سامان و ڕۆزی ڕژاند بەسەریدا و ڕێزی لێ ناو تاقی کردەوە پێ

---

(١) لە (جريدة الانباء) بە دەستکاریەوە.



یان، بەڵام لە بری ئەوەی بیر بکاتەوە و ئەم سامانە لە جێگەی خۆیدا دابنێ و خێری لێ بکات و لە ڕێگەی خودادا بیبەخشێت، کردیە بەڵایەك و سەرکەش بوو پێ ی، خەرجی کردن و دەست بڵاوی تێدا کرد و جڵەوی خۆی دایە دەست شەیتان و بەرەو چاڵی ئاگرینی برد ئەویش ساختەو فێڵ و خەڵەتاندن و دزی کردن و پاشان هەمووی لەسەر سفرەی خراپە و داوێن پیسی و قومار خەرج کردەوە، ژیانی بە گوللەیەك کۆتایی هات لە لای ڕاستی مێشکیەوە تا گەیشتە لای چەپی و خودا خۆی دەزانێ حاڵی دوا ڕۆژی چۆن دەبێت، بوو بە کابرای لە هەردوو جەژنە بوو.

خودا دەفەرموێت:

﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ﴾[١].

پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت:

(من تردى من جبل فقتل نفسه فهو في نار جهنم يتردى فيها خالدا مخلدا فيها ابدا ومن تحسى سما فقتل نفسه فسمه في يده بتعساه في نار جهنم مخلدا فيها أبدا، ومن قتل نفسه بحديده فحديدته فى يده يتوحا اي يضرب بها نفسه - بها في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا).

واتە: (هەر کەسێك لە چیایەکەوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوە و خۆی بکوژێت ئەوا لە ئاگری دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە و بەردەوام خۆی هەڵدەداتە خوارەوە، وە هەر کەس خۆی ژەهر خوارد بکات دەچێتە دۆزەخ و هەتا هەتایە تێدا دەمێنێتەوە و هەمیشە ئەو ژەهرەی بەدەستەوەیە لە بری نان هەر دەیخوات، وە هەر کەسێك بە ئاسنێکی تیژ (چەقۆ و هەر شتێکی تر) خۆی بکوژێ دەچێتە دۆزەخ و هەتا هەتایە لێ ی دەمێنێتەوە و هەمیشە بەو شیشە لە خۆی دەداتەوە).

---

(١) سورة الحجر: أية ٣.



# نـــاوەڕۆك

